بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ



# گۆڤــاری

# ئەیووبــ A و B ــی

ژمارە ( ٥ ) ٢٠١٨ز


## گۆڤــاری

## ئەیووبــ A و B ــی

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری ئایینی وەرزییە بۆ

ئاشناکردنی مرۆڤ لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام

### خاوەن ئیمتیاز

شێروان صادق علی

### سەرنووسەر

سامي مصطفى حسن

### دەستەی بەڕێوەبردن و دەرهێنان

ئیسماعیل کەریم قادر

بێوار فەهمی شوکری

هێژا صەباح حەسەن



### ناونیشان:

هەولێر/ بەحرکە

### موبایل

٠٧٥٠٣٠٣٠٢٠٢



https://www.facebook.com/ayobipage

Gmail: ayobigovar@gmail.com

﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ

وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾

آل عمران: ٨٥

## خطبة الحاجة:

إن الحمد لله، نحمده، ونستعينه، و نستغفره، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا، و من سيئات أعمالِنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، و أشهد أن محمداً عبده و رسوله.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾[1].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾[2].

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ۝٧٠ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾[3].

أما بعد:

فإن خير الحديث كتاب الله، و خير الهدي هدي محمد (صلى الله عليه وسلم)، و شر الأمور محدثاتها، و كل محدثةٍ بدعة، و كل بدعةٍ ضلالة، و كل ضلالةٍ في النار.

---

(١) (آل عمران: ١٠٢).

(٢) (النساء :٢).

(٣) (الأحزاب: ٧٠ ـ ٧١).

# پێرست

**يَـا أَيُّهَــا البَـاحِـثُ عَنْ مَنْهَـجِي**

**( لِـيَنْتَقِدْ ) فِـيـهِ بِمِـنْهَـاجِ**

**مِـنْهَاجِي الْعَدْلُ وَ قَمْعُ الْهَوى**

**فَـهَلْ لِمِنْهَاجِي مِنْ هَـاجِي**

ديوان أبي الفتح البستي ص١٨ ط . ١٨٧٧مـ (**لِـيَقْـتَدي**) بدل (**لِـيَنْـتَقِدْ**)

# نزای دەست پێك

## ئەی خودای بەخشندە...

هیــوایەك بــە بزربــووان ببەخشــە،
کــە هۆی گــەڕانــەوەیان بێت بــۆ ئیـــسلام.
هەتاوێك بە دڵە تاریکەکان ببەخشە،
کــە چرای ڕووناکبوونەوەیان بێــت بە ئیســلام.
هێزێك بــە بــێزاربــووان ببــەخشــە،
کــە ســۆزی دەســتگرتنیان بێت بە ئیــســلام.
هیمەتێك بە دواکــەوتووان ببەخشە،
کــە ڕێگــای پێشــکەوتنیان بێت بــە ئیســلام.
هەرێمێك بــە پەریشــانان ببەخشــە،
کە دڵێکی پڕ بێت لە خــۆشەویســتی ئیسلام.

# دەست پێك

**گۆڤاری ئەیووبی:**

**هیوایەکی** مانەوەیە لە دونیادا، پاش مردن.

**هەوارێکی** هەستاندنەوەی دووەمە، پاش هەستانەوە لە خەو.

**هەنگاوێکی** بەختەوەرییە بۆ خۆشگوزەرانی دونیا پێش قیامەت.

**چونکە:**

**هەولێکی** ڕزگاریخوازانە، بۆ ڕزگارکردنی دڵان لە دونیاپەرستی.

**هیمەتێکی** ڕێبوارانە، بۆ لوتکەکانی بەندایەتی خودای پەروەردگار.

**هونراوەیەکی** زانستییە، بۆ تێگەیشتنی ئیسلام لە سەرچاوەوە.

**هونەرێکی** نزیکبوونە، لــە مانــا قــولەکانی قورئــانی پیرۆز .

**هێزێکی** ژیانە، لەگەڵ ژیاننامەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)

**هەرێمێکی** ئازادە، بۆ هەموو ئەو پێنووسانەی دەیانەوێت،

گەشاوەیی یەکخوداپەرستی بە مرۆڤایەتی پیشان بدەن.

# سەروتار

ڕێزبەندی نێوان دەوڵەت و عەدالەت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پەیوەندی بە نەتەوەو ئاینەکانەوە نییە، هەرکات عەدالەت بەرپا بوو دەوڵەت دروست دەبێت، و هەرکات دەوڵەت بەهاکانی عەدالەتی بەجێهێشت، ئەوا بەرەو لاوازبوون و نەمان شوڕدەبێتەوە.

بۆیەش گەورەزانایانی ئیسلام و مێژوونووسان بۆ ئەوە دەچن کە: **خودا سەروەری دەوڵەت لەگەڵ کوفر و عەدالەت دەپارێزێت، بەڵام لەگەڵ ئیسلام و ستەم لە ناودەبات!**[(١)] ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەسە کە حاڵی خۆمان بزانین، پاش زیاتر لە چارەگە سەدەیەك لە دەسەڵات نەمانتوانی دادپەروەری بچەسپێنین، کەواتە بە چ بیانویەك باسی بەدەوڵەتبوون بکەین!؟.

مەبەستیش لێرەدا تەنها پرسیارێکە: **ئایا چۆن عەدالەت دروست بکەین تاوەکو سەروەریمان هەبێت، یان لە سەر نەخشەی جیهان سنورێکمان هەبێت!؟**

جوانترین وەڵام بۆ ئەم پرسیارەش ئەوەیە کە بڵێین: لە پشت هەموو نەخشە پارچەپارچەکراوەکان وێنەی مرۆڤێك هەیە، هەرکاتێك پارچەکانی وێنەی ئەم مرۆڤە لە پشتەوەی نەخشەکە کۆکرانەوە و خرانە تەکیەك، ئەوا لە دیوی پێشەوە، نەخشەکە بەخۆی دروست دەبێت.

---

(١) ذكر شيخ الإسلام في (مجموعة الفتاوى١٤٦\٢٨و الإستقامة ٢٤٧\٢): (إِنَّ اللَّهَ يُقِيمُ الدَّوْلَةَ الْعَادِلَةَ وَإِنْ كَانَتْ كَافِرَةً وَلَا يُقِيمُ الظَّالِمَةَ وَإِنْ كَانَتْ مُسْلِمَةً، و الدُّنْيَا تَدُومُ مَعَ الْعَدْلِ وَالْكُفْرِ وَلَا تَدُومُ مَعَ الظُّلْمِ وَالْإِسْلَامِ). ونحوه قول الخزرجي في وصف أهل العراق أيام المستعصم آخر خلفاء بني العباس(العسجد المسبوك الورقة ١٩٠).

دروستبوونی مرۆڤیش بریتییە لە دروست بوونی بەهاکانی عەدالەت لە مرۆڤدا کە ئیمان و چاکەکاری لێدەکەوێتەوە، پەروەردگاریش بەڵێنی بەدەوڵەتبوون وەکو کەرامەتێك بەو کۆمەڵە مرۆڤە داوە کە ئیمان و چاکەکاریان هەیە:

﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴾(١) .

گۆڤاری ئەیووبیش تەنها هەوڵێکە بۆ دروستکردنی ئەم مرۆڤە، بە هەنگاونان بۆ زیاتر نزیکبوونەوە لە ئیسلام، ئەگەر یەك هەنگاویش بێت.

---

(١) نور: ٥٥ {واتە: خودا بەڵێنی بە ئیمانداران داوە ئەوانەی چاکەکاری دەکەن، کە جێنشین و پایەداریان بکات لەم دونیایەدا، هەروەك چۆن ئیماندارانی پێش ئەوانی جێنشین و پایەدار کردووە، ئەو ئایین و دینە بۆیان دەچەسپێنێت کە خودا خۆی پێی ڕازییە، هەروەها ترس و نەبوونی ئاسایش بۆیان دەگۆڕێت بە هێمنی و ئارامی و دڵنیایی، تاوەکو بەتەواوی یەکخوداپەرستی ئەنجام بدەن، ئەوەی پاش ئەمە کوفر و ناشوکرانە دەکات، ئەوانە دەرچوون لە ڕیزی ئیماندارە چاکەکارەکان}.

# ( چەند وێستگەیەکی هزراندن لە سەر لا پەڕەی یەکەمی قورئانی پیرۆز)
# گەشتێك بە ناو واتا بەرزەکانی سورەتی فاتیحەدا ( ٣٤-٣٥ )

## ـ بەشی پێنجەم ـ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣
مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ
٥ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ
أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا
ٱلضَّآلِّينَ ٧

بە پشت بەستن بەخودا بەردەوام دەبین لە گەشتەکەماندا بە ناو مانا بەرزەکانی سورەتی فاتیحەدا، لەم بەشەشدا لە سەر چەند نهێنییەکی ئایەتە پیرۆزەکانی ئەم سورەتە دەوەستین لە دوو وێستگەی (٣٤، ٣٥ ) دا .



## وێستگەی سی وچوار( ٣٤ )

## جوان تێگەیشتنی دەقی پیرۆز و پێوەری جوان تێگەیشتن

لەم وێستگەیەشدا دووبارە[١] لەسەر دیاردەی دووبارەبوونەوە لە سورەتی فاتیحەدا دەوەستین ئەویش وشەی (صِرَٰط)ە لە ئایەتی شەشەم و حەفتەمدا:

* ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾

* ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾

لە حیکمەتەکانی ئەم دووبارەبوونەوەیە جیاوازیکردنە لە نێوان:

١ ـ سەرچاوەی ڕاستی: ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ .

٢ ـ شوێنکەوتووانی سەرچاوەکە: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ .

ئەم جیاوازیکردنەش چەند وانەیەکی پەروەردە و بیروباوەری تیادایە لەوانە:

### وانەی یەکەم:

### ( ئاسانی و دروست تێگەیشتنی دەقی پیرۆز ـ سەرچاوە ـ )

هەروەکو چۆن پرسیارە زەحمەتەکانی بیرکاری بەنمونە و ڕاهێنان ئاساندەکرێن و ماناکانیان نزیك دەکرێتەوە، هەمان شت دروست تێگەیشتنی دەقی پیرۆز (سەرچاوە: قورئانی پیرۆز و فەرمودە) بە هەڵسوکەوتی شوێنکەوتووانی دەقە پیرۆزەکە لە هەڤاڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لە واقیعی ڕۆژانەی ژیاندا ئاساندەکرێت و نزیك دەکرێتەوە، ئەمەش مانای وەسیەتی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم) بۆ ئومەتەکەی کە لە کاتی تەنگانە و دووبەرەکیدا بۆ دوو شت بگەڕێنەوە و دەستی پێوەبگرن:

---

(١) بڕوانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە (٢) لاپەڕە (٣٢ ـ ٣٥).

١ ـ سوننەتەکەی (سُنَتِي). {= سەرچاوە و دەقی پیرۆز}

٢ ـ سوننەتی خولەفای راشدین (سُنَةَ الخُلفاء الرَّاشدين)[١] . {= نمونەیەکی جێبەجێکراو لە واقعی ڕۆژانەدا و چونیەتی بەجێگەیاندنی سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەل ڕووداوی نویٚ پاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)} .

لە حیکمەتەکانی فەرمانکردن بە دەستگرتن بەسوننەتی خولەفا لەگەڵ سوننەتەکەی ئەوەیە کە بەئاگابوون لە سوننەتی خولەفا رضي الله عنهم، تێگەیشتنی سوننەتەکەی و جێبەجێکردنی لە واقیعدا ئاسان دەکات.

هەر بەم مانایەش و لەبەر هەمان هۆکار کاتێك هەڤاڵانی پرسیاری (الفرقة الناجية) لێی دەکەن کاتی دووبەرەکی ئوممەت، دەفەرمێت : (مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِى) [٢] واتە: ڕزگاربووانی کاتی دووبەرەکی ئەوانەن کە لەسەر ئەو شتەن کە من و هەڤاڵانم لە سەرینە. لێرەوە تێگەیشتنەکەی: ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ بە ڕەوشت بەرزی شوێنکەوتووانی تەفسیر دەکرێت ئەوانەی خودا چاکەی عیلم و عەمەلیان پیٚ بەخشیوە ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾، بۆیەش زۆر لە زانایان لە تەفسیری ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ دەفەرمون: (أبو

---

(١) عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ قَالَ وَعَظَنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَوْمًا بَعْدَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ مَوْعِظَةً بَلِيغَةً ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ فَقَالَ رَجُلٌ إِنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ «أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ يَرَى اخْتِلاَفًا كَثِيرًا وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّهَا ضَلاَلَةٌ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَعَلَيْهِ بِسُنَّتِى وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ» رواه الترمذي (٢٨٩١ مكنز) وقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ .

(٢) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أُمَّتِى مَا أَتَى عَلَى بَنِى إِسْرَائِيلَ حَذْوَ النَّعْلِ بِالنَّعْلِ حَتَّى إِنْ كَانَ مِنْهُمْ مَنْ أَتَى أُمَّهُ عَلاَنِيَةً لَكَانَ فِى أُمَّتِى مَنْ يَصْنَعُ ذَلِكَ وَإِنَّ بَنِى إِسْرَائِيلَ تَفَرَّقَتْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِى عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً كُلُّهُمْ فِى النَّارِ إِلاَّ مِلَّةً وَاحِدَةً قَالُوا وَمَنْ هِىَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِى ». رواه الترمذي (٢٨٥٣) و قَالَ: هَذَا حَدِيثٌ مُفَسَّرٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ لاَ نَعْرِفُهُ مِثْلَ هَذَا إِلاَّ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.

بکر و عمر) مەبەست: ئەگەر دەتەوێ بزانی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ چییە؟ وەکو ئەم دوو پێشەوایە بە لە بڕواداری و کارگوزاری [١]. بەمانایەکی دیکە ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ پێمان دەفەرمێت و فێرماندەکات کە مانای ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ شتێکی دوور نییە لە ڕۆژانەی ژیانتان، بەڵکو خودی ڕۆژانەی ژیانە کە بە ڕەوشت بەرزی بخەملێنی وەکو چۆن هەڤاڵان و پیاوچاکان ڕۆژگاری ژیانیان بە مانای ئەم ئایەتە خەملاندووە، لە بەرزی بڕواداری و جوانی کارگوزاری. قورئانی پیرۆزیش ئاماژە بەم مانایانە دەکات کاتی فەرمان بە شوێنکەوتنی موهاجرین و ئەنصار دەکات ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١٠٠﴾ [٢] و گەف لەوکەسانە دەکات کە بێجگە لە پشتکردن لە سوننەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پشت لە ڕێبازی کۆمەڵی ئیمانداران دەکەن: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾ [٣]. کەواتە پشتکردن لە ڕێبازی موهاجرین و ئەنصار کە ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ە، دوورکەوتنەوەیە لە دروست تێگەیشتن و کارپێکردنی ماناکانی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾. ئەمەش حیکمەتێکی دووبارەبوونەوەی ﴿صِرَٰطَ﴾ە لە فاتیحەدا.

---

(١) بڕوانە: ژمارە(١) ل٦١ ـ ٧٠ گۆڤاری ئەیووبی و تێگەیشتنی ماناکانی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) بە پێی ژیاننامەی أبوبکر(رضي الله عنه) پاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). هەروەها بڕوانە: ژمارە(٢) ل٦٦ ـ ٩٨ و ژمارە(٣) ل ٣٧ ـ ٦٨ لە گۆڤاری ئەیوبی چونیەتی جێبەجێکردنی دەقەکانی شەرع لە خەلافەتی عومەردا(رضي الله عنه).

(٢) التوبة: ١٠٠.

(٣) النساء : ١١٥.

## وانەی دووەم:

## ( پارێزراوی لە هەڵە و پێوەری دیارخستنی هەڵە )

هەڤاڵان و پیاوچاکان ئەوانەی خودا چاکەی عیلم و عەمەلیانی لەگەڵ کردوون و شوێنکەوتەی ڕێگای ڕاستن: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئەمانە کۆمەڵەکەیان پارێزراوە لە هەڵە[١] نەك تاکەکەسانیان.

پارێزراوی تاکەکەسی لە هەڵە تەنها بۆ پێغەمبەرانە(عليهم السلام)[٢] بۆیە لە شەرعدا ڕەفتار و گوفتاری هەموو تاکەکەسێك پێویستە لە تەرازووی (قورئان ، فەرموودە)دا بێت، لەم بارەیەوە ابن عباس (رضي الله عنهما) دەفەرمێت: **(ئەوەندە نەمایە بەردتان لێببارێت، پێتان دەڵێم پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وای فەرمووە، پێم دەڵێن ئەبو بکر و عومەر!)** [٣] .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەروەك چۆن ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ئاسانکارییە بو تێگەیشتن و بەجێگەیاندنی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ لە واقعی ڕۆژانەدا، بە هەمان شێوە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ پێوەرە بۆ گوفتار و ڕەفتاری تاکەکانی کۆمەڵی شوێنکەوتووانی ڕێگای ڕاست ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾.

---

(١) أخرج أبو العاصم في السنة(٨٢ ، ٨٣ ، ٨٤ ، ٨٥ ، ٩٢) و غيره أن النبـي (صلى الله عليه وسلم) قال: (إن الله تعالى قد أجار أمتي مِنْ أن تجتمع على ضلالة). و ينظر: مباحث (الإجماع) في كتب أصول الفقه.

(٢) ينظر : فصل في (عصمة الأنبياء ) في كتاب : (مسائل أصول الدين المبحوثة في علم أصول الفقه، عرض و نقد ١\٥٥٩ ـ ٦٣٦ ط. الدار الأثرية) تأليف الدكتور : خالد عبد اللطيف.

(٣) أثر ابن عباس: ( يُوشِكُ أَنْ تَنْزِلَ عَلَيْكُمْ حِجَارَةٌ مِنْ السَّمَاءِ. أَقُولُ لَكُمْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ - صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ -. وَتَقُولُونَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ؟ ) أخرجه بهذا المعنى أحمد في المسند (١\٣٣٧) و الخطيب في الفقيه و المتفقه (١\٣٧٧) و ابن عبد البر في جامع بيان العلم (٢\١٢١٠) و غيرهم. ينظر: (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية ١\٤٦ ط. عالم الفوائد)

پێشەواکانی ئوممەت گشتیان پەنجەیان لەسەر ئەم خاڵە پەروەردەییە داناوە، هیچ کات ڕووی خەڵکی موسڵمانیان نەکردووتە بۆچونەکانی خۆیان، بەڵکو فەرموویانە: (هەرکات بۆچونەکانمان سەرپێچی قورئان و فەرمودە بن ئەوا بەلاوە بنێن و شوێنکەوتەی قورئان و فەرمودە بن) ئەمانەی خوارەوەش چەند دەقێکی زێڕینی پێشەواکانی ئیسلامن لەم بارەیەوە کە موسڵمانان لە هەلەی تاکەکەسی ئاگاداردەکەنەوە[١] :

**❊ أبو حەنیفە دەفەرمێت :**

ـــ (إذا صح الحديث فهو مذهبـي).

ـــ (حرامٌ على من لم يعرف دليلي أن يفتي بكلامي).

**❊ مالك دەفەرمێت :**

ـــ (ليس أحد بعد النبـي ـ صلى الله علية وسلم ـ إلا و يؤخذ من قوله و يترك، إلا النبـي ـ صلى الله عليه وسلم ـ ).

ـــ (إنما أنا بشر أخطيء و أصيب فانظروا في رأيي فكل ما وافق الكتاب و السنة فخذوه و كل مالم يوافق الكتاب و السنة فتركوه).

**❊ شافعی دەفەرمێت:**

ـــ (كل حديث عن النبـي (صلى الله عليه وسلم) فهو قولي وإن لم تسمعوه مني).

ـــ (أجمع المسلمون على أن من استبان له سنة عن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لم يحل له أن يدعها لقول أحد).

**❊ أحمد دەفەرمێت:**

ـــ (لا تقلدني و لا تقلد مالكاً ولا الشافعي و الأوزاعي ولا الثوري و خذ من حيث أخذوا).

---

(١) ينظر: تخريج جميع هذه الأقوال و غيرها في مقدمة صفة صلاة النبـي (صلى الله عليه وسلم) للشيخ الألباني (٢٣\١ ـ ٣٢ ط. المعارف ــ المطولة ).

ـــ (من ردَّ حديث رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فهو على شفا هلكة).

پوختەی مانای ئەم وتە زێڕینانەی پێشەوایانی ئیسلام ئەوەیە کە خۆیان بە(سەرچاوە ـ ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ـ) نازانن، بەڵکو خۆیان بە شوێنکەوتەی قورئان و فەرمودە دەزانن وەك هەر تاکەکەسێکی کاروانی شوێنکەوتووان ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾. بە پێویست دەزانن هەموو بۆچون و ئیجتهادێکیان لە ڕووانگەی قورئان و فەرموودەوە تەماشا بکرێت هەڵبسەنگینرێت.

ئەمەش بابەتێکی پەروەردەیی گرنگە ئەوە دەگەیەنێت کە پێشەوایانی ئیسلام ـ وەکو تاکێکی کۆمەڵی زانایان و پیاوچاکان ـ ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ ـ هیچ کات بانگەشەی خەڵکیان نەکردووە بۆ خۆیان و سەرپێچی خەڵك بۆ خۆیان بە تاوان نەزانیوە، بەڵکو بانگەشەیان بۆ خودای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی(صلى الله عليه وسلم) کردوویانە و سەرپێچی (قورئان و فەرموودە)یان ـ ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ـ بە تاوانیان زانیوە. هەروەها سەرپێچی ئیجماعی کۆمەڵی زانایان و پیاوچاکانیان بە تاوان زانیوە، چونکە کۆمەڵی شوێنکەوتووان ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ پارێزراوە.

لێرەوە دەردی دەمارگیری مەزهەبی [(١)] بۆمان دەردەکەوێت کە کەسانێك لە شوێنکەوتووانی مەزهەبەکان پەیڕەوی دەکەن و سەرپێچی مەزهەب بەتاوان تێدەگەن بە بێ بەڵگە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)، بەڵکو بە بێ بەڵگە لە گوتنەکانی سەرمەزهەبەکەیان!

---

(١) ينظر: (بدعة التعصب المذهبي) لمحمد عيد العباسي. و كتاب(إيقاظ همم أولي الأبصار للإقتداء بسيد المهاجرين و الأنصار) لصالح بن محمد العمري الشهير بالفلاني رحمه الله.

هەرچەندە ئەم سەر مەزهەبانە بە یەکڕایی ئوممەت لە کۆمەڵی ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ن، بەڵام تاکی ئەم کۆمەڵەن، پارێزراویش لە هەڵە و سەرپێچی بۆ گشت کۆمەڵەکەیە(إجماع) نەك تاکی کۆمەڵەکە، چونکە پارێزراوی تاکەکەسی تەنها بۆ پێغەمبەرانە (عليهم السلام)! ئەوانی دیکە بە میزانی قورئان و سوننە ـ دەقی پیرۆز ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ـ هەڵدەسەنگێنرێن .

**ئیمامی عەلی ( رضي الله عنه ) دەفەرمێت:**

**( حەق بە پیاو نا ناسرێت، بەڵکو پیاو بە حەق دەناسرێت )**

## وانەی سێیەم:

## ( ترسناکی لاسایی کردنەوەی بێباوەڕان )

ئەمەی باسکرا لە دوو وانەی ڕابردوو سەبارەت بە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ و ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ لە ترسناکی وانەی سێیەم ئاگادارمان دەکاتەوە، کە ترسناکی لاسایی کردنەوەی ڕێبازی بێباوەڕانە ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ و ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ بە تایبەت لە ئەمڕۆی جیهانی جیهانگیری گەیاندن و ڕاگەیاندندا، کە ئەوان ـ سەرانی ئەوریا و ئەمریکا ... هتد ـ جلەوی بەڕێوەبردنی دونیایان لە دەستە و خاوەن هێز و تەکنەلوجیان نەك موسڵمانان، ڕووی ترسناکیەکەش لەوەدایە کە  هەموو کات بێهێز لاسایی بەهێز دەکاتەوە خاڵی ترسناکیش لاساییکردنەوەیانە لە پشتکردن لە دین، ئەگەر نا لاساییکردنیان لە تەکنەلوجیا جوانترینی دیندارییە لەم سەردەمەدا. بە مانایەکی دیکە هەروەك لە وانەی یەکەم باسمان کرد  کە مانای ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ بریتییە لە

ئاسان تێگەیشتنی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ و کارپێکردنی، لێرەشدا هەمان وانە خۆی دووبارەدەکاتەوە بە پێچەوانەوە. پوختەکەشی ئەوەیە کە ئەمڕۆ لە کۆمەڵگایەکدا کە ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ و ﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾ دەستیان بەسەر ڕاگەیاندنەکاندا گرتووە و سەروەت و چەك و بڕیاریان بەدەستە پشتکردنی موسڵمان لە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ ئاساندەکات و بەئاسانی مانا ڕوون و ئاشکراکان لای دەشێوێنرێن، بەتایبەت کاتێك هەڵگرانی ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ مانا فراوانەکانی ئەم ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ە تێنەگەن وەکو پێویست ... ئەم سێ وانەیە زیاتر بۆمان ڕوون دەبنەوە کاتێك بیر لە ئایەتەکانی ئەم چەند خشتەیە دەکەینەوە، کە شێوازێکی سەرنجڕاکێشی قورئانی پیرۆزمان دەخاتە بەرچاو سەبارەت بەوەی کە باسکرا لە:

* تێگەیشتن و ئاسانکاری کارکردن بە ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ = وانەی یەکەم.
* ئیستیقامە و هۆکارەکانی پاراستنی مانەوە لەسەر﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴾ = وانەی دووەم و سێیەم.

خشتەی (١) مانای سێ وانەکە لە بڕگەکانی ئایەتی(٣٨)ی سورەتی یوسف

| ٱهۡدِنَا | | |
|---|---|---|
| ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ (المرجع و مَهدُ الإنتماء إلى الخير ـ سەرچاوە و لانەی لایەنگری چاکە) | صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ (المنتمون إلى الخير ـ لایەنگرانی چاکە) | صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (المنتمون إلى الشر ـ لایەنگرانی خراپە) |
| ﴿مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ﴾ | ﴿وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ﴾ | ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ﴾ |

خشتەی (٢) مانای وانەی یەکەم و دووەم لە ئایەتی (١١١)ی سورەتی الشعراء

| ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ (المرجع و مهد الإنتماء إلى الخير ـ سەرچاوە و لانەی لایەنگری چاکە) | صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ (المنتمون إلى الخير ـ لایەنگرانی چاکە) |
|---|---|
| ﴿۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ ـ | ـ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ١١١﴾ |

خشتەی (٣) مانای وانەی یەکەم و سێیەم لە ئایەتی (٥٩)ی سورەتی هود

| ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ (المرجع و مهد الإنتماء إلى الخير ـ سەرچاوە و لانەی لایەنگری چاکە) | غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (المنتمون إلى الشر ـ لایەنگرانی خراپە) |
|---|---|
| ﴿وَتِلۡكَ عَادٞۖ جَحَدُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَعَصَوۡاْ رُسُلَهُۥ ـ | ـ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٖ ٥٩﴾ |

نمونە بەم مانایانە لە گشت لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆزدا دێنە بەر چاومان، خودای پەروەردگار چاومان بە قورئانی پیرۆز ڕووناك بکات ...آمین



## وێستگەی سی و پێنج( ٣٥ )

## شێوازێكی دیكەی خستنەڕووی بنەماكانی بەندایەتی لە سورەتی فاتیحەدا [(١)]

سورەتی فاتیحە بە زیاتر لە شێوازێك بنەماكانی ئیسلام دەخاتە ڕوو[(٢)] لەم وێستگەیەدا لەگەڵ شێوازێكی سەرنج ڕاكێشی فاتیحە دەوەستین كە لە چوار ڕوویەوە بنەمایەكی هەرە گرنگی بەندایەتی دەخاتە ڕوو، كە گشت پێغەمبەران (علیهم السلام) بانگەوازیان بۆ كردووە، ئەم چوار ڕوویەش ئەمانەن:

یەكەم: بەگەورە دانانی خالق ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ۝٤﴾.

دووەم: بێدەسەڵاتی و ملكەچی مەخلوق بەرامبەر خالق ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ۝٥﴾ .

سێیەم: پەیوەندی مەخلوق بە خالقەوە ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ۝٦﴾.

چوارەم: كاردانەوەی ئەم بیروباوەڕە لەم سێ خاڵەی سەرەوەدا بە سەر هەڵسوكەوتی مەخلوق بەچاكە ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ﴾ كاتی دەستپێوەگرتن، یان بە خراپە ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧﴾ كاتی پشت تێكردن.

پوختەی ئەمە هەموو ئیمان و ئیسلامە و بانگەوازی گشت پێغەمبەرانە(علیهم السلام) كە بریتییە لە:

* داننان كە تەنها خودای پەروەردگار شایستەی سوپاسگوزارییە كە هەڵسوڕێنەری زەوی و ئاسمانانە و خاوەن ڕەحمەتێكی بێسنور و دادگایەكی بێ زوڵم و زۆرە.

---

(١) بروانە: ژمارە(٤) لاپەری (٧٨ ـ ٧٩)گۆڤارەكەمان .

(٢) هەروەك لە بەشەكانی پێشتری بابەتەكەمان باسكردن بو نمونە بروانە:

* پاراستنی مرۆڤ لە بە هەڵە تێگەیشتنی بنەماكانی بەندایەتی بە پێی شوێنی ئایەتەكان و وشەكانی فاتیحە (ویستگەی ٣١) ژمارە(٤)ی ئەیووبی لاپەرە: ٢٩ ـ ٣٢.

* دووزینەوەی بنەماكانی كەسایەتی موسڵمان بە تێگەیشتنی بنەماكانی ئیسلام لە فاتیحەدا بە پێی ریزبەندی ئایەتەكانی (ویستگەی ٣٢ ) ژمارە(٤)ی ئەیووبی لاپەرە: ٣٣ ـ ٣٩.

* دامەزراندنی بنەماكانی بەندایەتی و بانگەواز بووكردنیان بە تێگەیشتنی ناو سیفەتەكانی خودای پەروەردگار لە فاتیحەدا (ویستگەكانی ١٣، ٢٥ ، ٢٦ ، ٢٩ ...) .... هتد.

* ملکەچبوون بۆ خودای پەروەردگار  بە بەندایەتیکردنی و پشت بەستن تەنها بە ئەو.

* بەردەوامی نوێژ و دوعاکردن لەگەڵ گشت کار و کردەوەیەکدا.

* هەڵگرتنی سیفاتی پێغەمبەران(علیهم السلام) و پیاوچاکان دوورکەوتنەوە لە سیفاتی گومڕاوان و غەزەب لێکراوان.

پێچەوانەی ئەم مانایانەش هەموو کوفر و شرکێکە، کە سەراوبن خوێندنەوەی ماناگەورەکانی ژیانە پەیامی شەیتان و شەڕانگێزانە:

* بە بەرزدانانی سیفاتی مەخلوق تا پلەی بەخودانانی، سوپاسگوزاریکردنی بە سوپاسگوزاریەك کە تەنها شایستەی خودایە.

* بەندایەتی کردن بۆ مەخلوق و ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی، پشت بەستن بە مەخلوق لەو کارانەی کە تەنها تایبەتن بە گەورەیی خودا.

* پشت کردن لە نوێژ و پاڕانەوە یان کردنی مەخلوقێك بە واسیتە لە نێوان خۆی و خودادا .

* هەڵگرتنی سیفاتی گومڕاوان و غەزەب لێکراوان، چ بە خوداپەرستییەك بە هەواوهەوەس و بێ بەڵگە یان بە تەکەبورکردن بە ڕەتکردنەوەی حەق و ڕاستی لە پێناو هەواو هەوەس .

ئەمە پوختەی زۆرانبازی نێوان هەڵگرانی پەیامی ئیسلام و هەڵگرانی پەیامی دژە ئیسلامە تا ڕۆژی قیامەت کە فاتیحە ئاماژەی بۆ دەکات، موسڵمانیش ڕۆژانە حەڤدەجار یان زیاتر دووبارەی دەکاتەوە. بۆ زیاتر نزیککردنەوەی ئەم پەیامە پیرۆزە و دووبارە وەبیرخستنەوەی ئەم بنەمایە گرنگەی بیروباوەڕ لە سەرخشتەیەك دەوەستین کە بانگەوازی یەکەم پێغەمبەر (نوح ـ علیه السلام ـ) و دوا پێغەمبەر (محمد ـ صلى الله علیه وسلم ـ) لەم بنەمایەدا کۆدەکاتەوە:

| | بە گەورەدانانی خودا: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ | بەندایەتی و ملکەچی لە ڕێگای خودادا و پشت بەستن تەنها بە ئەو: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٥﴾ | پاڕانەوە و نوێژ کە پەیوەندی مەخلوقە بە خالقەکەی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ٦﴾ | نموونەی موسڵمانی پابەند بە ئیسلام و کۆمەڵی موسڵمانان: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾ | نموونەی کەسی موشریک و لایەنگری بێباوەڕان: ﴿ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ |
|---|---|---|---|---|---|
| **بانگەوازی دووا پێغەمبەر: محمد (صلى الله عليه وسلم)** | بەگەورەدانانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بۆ خودای پەروەردگار: * «...لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ» رواه مسلم | وەسفی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لەقورئانی پیرۆزدا بە بەندایەتی لە پیرۆزترینی کاتەکانی: *(کاتی إسراء) ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ...﴾ (الإسراء) *(کاتی تەحەدی) ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا ...﴾ (البقرة) *(کاتی بانگەواز): ﴿وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبْدُ ٱللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا۟ يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ١٩﴾ (الجن) *(کاتی وەحی): ﴿فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ١٠﴾ (النجم) | پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لەبەر گەورەیی دوعاکردن بەندایەتی بە دوعاکردن ناو دەبات: « الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ » لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ( وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ) رواه الترمذي و قال حسن صحيح | هاندان بۆ شوێنکەوتنی هەڤاڵان ( رضي الله عنهم) لە موهاجیر و ئەنصار: ﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ١٠٠﴾ (التوبة) | ئاگادارکردنەوە لە پشت کردن لە ڕێگای ئیمانداران: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ١١٥﴾ (النساء) |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بانگەوازی پێغەمبەری یەکەم: نوح (علیه السلام) | سەرسامی نوح علیه السلام لە قەومەکەی: {لەبەرچی ئێوە خودا بە گەورە نازانن!؟}: ...﴿مَّا لَكُمۡ لَا تَرۡجُونَ لِلَّهِ وَقَارٗا ﴿١٣﴾﴾... | ئامۆژگاری نوح علیه السلام بۆ قەومەکەی کە تەنها بۆ خودا بەندایەتی بکەن: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾﴾... | هاندانی نوح علیه السلام بۆ قەومەکەی کە بۆ خودا بگەڕێنەوە و داوای ئیستیغفار بکەن: ﴿فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾﴾ | {پاڕانەوەی نوح ـ علیه السلام ـ بۆ خۆی و کۆمەڵی موسڵمانان}: ﴿رَّبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِوَٰلِدَيَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيۡتِيَ مُؤۡمِنٗا وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارَۢا ﴿٢٨﴾﴾ | {نوح ـ علیه السلام ـ بۆ خودا باسی پیلانگێڕی موشریکەکان دەکات کە چۆن پشتیان لە پەیامی خودا کردووە و شوێنکەوتەی پەیکەرەکانی وەد و سواع و یەغوپ و یەعوق کەوتوون}: ﴿قَالَ نُوحٞ رَّبِّ إِنَّهُمۡ عَصَوۡنِي وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمۡ يَزِدۡهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُواْ مَكۡرٗا كُبَّارٗا ﴿٢٢﴾ وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمۡ وَلَا تَذَرُنَّ وَدّٗا وَلَا سُوَاعٗا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسۡرٗا ﴿٢٣﴾﴾ |

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەر بانگەوازێك بۆ ئیسلامەتی لە چوار ڕوویەکەی ئەم بنەمایە لابدات یان سەرپێچی بێت بۆ یەکێکیان دەرچوونە لە بانگەگەوازی پێغەمبەران لە (نوح ـ علیه السلام)ەوە تاوەکو (محمد ـ صلی الله علیه وسلم ـ) .

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾﴾ (الأنعام)

# وەرگێڕانی بەشێك لە پەیامێكی شێخ عبدالعزیز بن باز ( رحمه الله ) سەبارەت بە هزری نەتەوەیی عەرەبی

## نقد القومية العربية على ضوء الإسلام والواقع

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وبعد:

** ١ **

فلا يشك مسلم له أدنى بصيرة بالتاريخ الإسلامي في فضل العرب المسلمين، وما قاموا به من حمل رسالة الإسلام في القرون المفضلة، وتبليغه لكافة الشعوب، والصدق في الدعوة إليه، والجهاد لنشره والدفاع عنه، وتحمل المشاق العظيمة في ذلك، حتى أظهرها الله على أيديهم وخفقت رايته في غالب المعمورة.

** ٢ **

وشاهد العالم على أيدي دعاة الإسلام في صدر الإسلام أكمل نظام وأعدل حاكم، ورأوا في الإسلام كل ما يريدون وينشدون من خير الدنيا والآخرة، ووجدوا في الإسلام تنظيم حياة سعيدة

## ڕەخنە لە هزری نەتەوایەتی عەرەبی لە ڕوانگەی واقعی ئەمڕۆ و ئیسلامەوە

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله وبعد:

*(فەزلی عەرەبە موسڵمانەكان لە بڵاوكردنەوەی ئیسلام)*

هەر موسڵمانێك كەمترین بەرچاوڕوونی هەبێت بە مێژووی ئیسلامی گومان نابات بە فەزڵی عەرەبە موسڵمانەكان لە هەڵگرتنی پەیامی ئیسلام لە چاخە زێڕینەكاندا و گەیاندنی بە هەموو گەلەكان، هەروەها ڕاستگۆییان لە بانگەوازكردن بۆ ئیسلام و جیهادكردن بۆ بڵاوكردنەوە و بەرگری لێكردنی. لەوەشدا ئازارێكی زۆریان چەشتووە، هەتا خودای گەورە ئیسلامی لەسەر دەستی ئەوان بڵاوكردەوە و ئاڵاكەی لە زۆربەی ئاوەدانیەكان شەكایەوە.

*(شاهێدی مێژوو بۆ گەورەیی و دادپەروەری ئیسلام)*

جیهانیش لە سەرەتای ئیسلام و لە سەر دەستی بانگخوازانی ئیسلام تەواوترین سیستەم و دادپەروەرترین حاكمیان بینی، و لە ئیسلامدا هەموو ئەوەی دەیانەوێت و بانگەشەی بۆ

تكفل لهم العزة والكرامة والحرية من عبادة العبيد، وظلم المستبدين، والولاة الغاشمين.

****٣****

ووجدوا في الإسلام تنظيم علاقتهم بالله سبحانه: بعبادة عظيمة تصلهم بالله، وتطهر قلوبهم من الشرك والحقد والكبر، وتغرس فيها غاية الحب لله وكمال الذل له والتلذذ بمناجاته، وتعرفهم بربهم وبأنفسهم، وتذكرهم بالله وعظيم حقه كلما غفلوا أو كادوا أن يغفلوا.

وجدوا في الإسلام تنظيم علاقتهم بالرسول صلى الله عليه وسلم وماذا يجب عليهم من حقه والسير في سبيله، ووجدوا في الإسلام أيضا تنظيم العلاقات التي بين الراعي والرعية، وبين الرجل وأهله، وبين الرجل وأقاربه، وبين الرجل وإخوانه المسلمين، وبين المسلمين والكفار، بعبارات واضحة وأساليب جلية.

دەكەن لە خێر و بێری دنیا و دوارۆژ بینیان، هەروەها لە ئیسلامدا ڕێکخستنی ژیانێکی بەختەوەریان بینی، کەوا کەفالەتی عیزەت و شکۆمەندی و ئازادیان بۆ دەکات و ڕزگاریان دەکات لە کویلایەتی بۆ ستەمکاران و ستەمکاری کاربەدەستان.

***(ئیسلام و ڕێکخستنی پەیوەندی موسڵمان لەگەڵ خودا و خەڵك)***

و بینییان کە ئیسلام پەیوەندیان بە خوای گەورە ڕێکدەخات: بە عیبادەتێکی شکۆمەند دەیانگەیەنێت بە خودا، دڵیان لە شیرك و ڕق و کینە و خۆبەگەورەزانین پاك دەکاتەوە و ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆ خودای گەورە و کەمالی ملکەچی بۆی و چێژوەرگرتن لە موناجاتی تیادا دەچەسپێنێت.

ئەم ئیسلامە دەیاناسێنێت بە پەروەردگاریان هەروەها خۆشیان دەناسن بەم ئیسلامە، هەرجارێك بێئاگابوون لە پەروەردگاریان، ئەوا ئیسلام گەورەیی ئەم خودایە دەخاتە ناو دڵیان و وەبیریان دەهێنێتەوە.

هەروەها بینییان کە ئیسلام پەیوەندیان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕێکدەخات، چییان لەسەرە لەبارەی ماف و شوێنکەوتنی ڕێبازەکەی.

هەروەها لە ئیسلامدا بینییان پەیوەندییەکانی نێوان دەسەڵاتی بەڕێوەبردن و خەڵکەکە چۆن بە

جوانی ڕێکدەخرێن، هەروەها ئەم پەیوەندیانە لە نێوان پیاو و خێزانەکەی و لە نێوان پیاو و نزیکەکانی و لە نێوان پیاو و برایە موسڵمانەکانی و لە نێوان موسڵمانان و کافران چۆن بە جوانی ڕێکدەخرێن بە دەستەواژەی ڕوون و ئامرازی ئاشکرا.

** ٤ **

ووجدوا من الرسول صلى الله عليه وسلم ومن الصحابة وأتباعهم بإحسان تفسير ذلك بأخلاقهم الحميدة وأعمالهم الجيدة، فأحب الناس الإسلام وعظموه ودخلوا فيه أفواجا، وأدركوا فيه كل خير وطمأنينة وصلاح وإصلاح(١\٢٨٠).

*(بۆچی خەڵك ئیسلامیان خۆش ویست و بە گەورەیان زانی؟ ـ ڕۆڵی پێشڕەو ـ)*

هەروەها لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم ) و لە هەڤاڵانی و ئەوانەی بە چاکە شوێنیان کەوتوون جوانی ئیسلامیان بینی، کاتێك ئەمانە تەفسیری ئیسلامیان کرد بە کردەوە چاکەکانیان و ڕەوشتە بەرزەکەیان، بەمە خەڵك ئیسلامیان خۆشویست و بە گەورەیان دانا و بە کۆمەڵ هاتنە ناوی، لە ناو ئەم ئیسلامەدا گەیشتن بە هەموو خێر و دڵنەواییەك و چاك و چاکەکارییەك.

** ٥ **

والكلام في مزايا الإسلام وما اشتمل عليه من أحكام سامية وأخلاق كريمة، تصلح القلوب، وتؤلف بينها وتربطها برباط وثيق من المودة في الله سبحانه، والتفاني في نصر دينه، والتمسك بتعاليمه، والتواصي بالحق والصبر عليه.

*(بۆچی خەڵك ئیسلامیان خۆش ویست و بە گەورەیان زانی؟ ـ جوانی ئیسلام ـ)*

هەروەها قسەکردن لەبارەی تایبەتمەندییەکانی ئیسلام لە دادپەروەری لە ئەحکامدا و شکۆداری لە ڕەوشتدا، دڵەکان چاك دەکات و خۆشەویستی دەخاتە نێوانیان و پەیوەندی نێوانیان بەتیندەکات بە خۆشەویستییەك لە ڕێگای خودادا و خۆبەختکردنێك لە پێناو سەرخستنی دینەکەی و دەست گرتن بە

**٦**

لا ريب أن الكلام في هذا الباب يطول. والقصد في هذه الكلمة الإشارة إلى ما حصل على أيدي المسلمين من العرب في صدر الإسلام من الجهاد والصبر، وما أكرمهم الله به من حمل مشعل الإسلام إلى غالب المعمورة.

وما حصل للعالم من الرغبة في الإسلام، والمسارعة إلى الدخول فيه، لما اشتمل عليه من الأحكام الرشيدة والتعاليم السمحة، والتعريف بالله سبحانه وبأسمائه وصفاته وعظيم حقه على عباده.

ولما اتصف به حملته والدعاة إليه من تمثيل أحكام الإسلام في أقوالهم وأعمالهم وأخلاقهم، حتى صاروا بذلك خير أمة أخرجت للناس، وحققوا بذلك معنى قوله تعالى: ﴿كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ ومعنى الآية كما قال أبو هريرة رضي الله عنه كنتم خير الناس للناس.

شەریعەتەکەی، ئامۆژگاری یەکدیکردن بە سەرخستنی حەق و ئارامگرتن لە سەری.

**(پوختەی باسکراو)**

بێگومان قسەکردن لەم بارەوە درێژە دەکێشێت. مەبەست لەم قسەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی لەسەر دەستی موسڵمانە عەرەبەکان هاتەدی لە ئەنجامی جیهادکردنیان و ئارامگرتنیان لە سەرەتای ئیسلامدا، کە خودای گەورە چۆن شکۆداری کردن بەم جیهادکردن و ئارامگرتنە بۆ هەڵگرتنی چرای ئیسلام لە زۆربەی ئاوەدانی.

بە بینینی چرای ئیسلامیش خەڵکان ئارەزوومەند بوون لە هاتنە ناو ئیسلام و کێبڕکێیان کرد لە موسڵمانبووندا، بەهۆی ئەحکامی ژیر و دادپەروەرانەی ئیسلام و شەریعەتە لێبوردەکەی، هەروەها جوان ناساندنی بە خودای پەروەردگار و ناو و سیفەتەکانی و گەورەیی مافەکەی بەسەر بەندەکانیدا.

هەروەها- خەڵکان ئارەزوومەند بوون لە هاتنە ناوئیسلام و کێبڕکێیان کرد لە موسڵمانبووندا- کاتێك جوانی دەستگرتنی موسڵمانانیان بینی بە ئەحکامی ئیسلام، لە گوفتار و کردار و ڕەوشتیاندا، هەتا بەهۆی ئەوەوە بوونە چاکترین ئوممەت، کە هێنراونەتە مەیدان بۆ خەڵك، بەمەوە واتای گوفتاری خودای گەورەیان

**٧**

لا يشك مسلم قد عرف ما كان عليه المسلمون في صدر الإسلام فيما ذكرناه، فهو من الحقائق المعلومة بين المسلمين، ولا يشك مسلم في ما للمسلمين غير العرب من الفضل والجهاد المشكور في مساعدة إخوانهم من العرب المسلمين في نشر هذا الدين والجهاد في إعلاء كلمته، وتبليغه سكان المعمورة، شكر الله للجميع مساعيهم الجليلة، وجعلنا من أتباعهم بإحسان، إنه على كل شيء قدير.

هێنایەدی: {(بەڕاستی) ئێوە چاکترین ئوممەتێکن کە (بۆ سوودی) خەڵکی هێنراونەتە مەیدانەوە، چونکە فەرمان بەچاکە دەدەن و قەدەغەی خراپە دەکەن و باوەڕی دامەزراوتان بەخودا دەهێنن، خۆ ئەگەر خاوەنانی کتێب باوەڕیان بهێنایە (بە ئاینی ئیسلام) ئەوە چاکتر بوو بۆیان هەیانە ئیماندارن، بەڵام زۆربەیان گوناهبارو تاوانکارن}. لە واتای ئایەتەکەشدا (أبو هريرة ـ رضي الله عنه ـ ) فەرمویەتی: ئێوە چاکترین خەڵکن بۆ خەڵك.

***(ڕۆڵی نەتەوەکانی دیکە لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام)***

هیچ موسڵمانێك گومان لەوە نابات کە موسڵمانە یەکەمەکان لە سەرەتای ئیسلام لەسەر چ دادپەروەرییەك و ماندوونەناسییەك بوون، هەروەك باسمان کرد، ئەمە ڕاستییەکی زانراوە لە نێوان موسڵماناندا، هەروەها هیچ موسڵمانێك گومان نابات لەوەی غەیرە عەرەبە موسڵمانەکان فەزڵ و جیهادێکی سوپاسکراویان کردووە بۆ یارمەتیدانی برایانیان لە عەرەبە موسڵمانەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئایین و جیهادکردن بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله) و گەیاندنی بە دانیشتووانی جیهان، خودای گەورە پاداشتی ئەو یارمەتییە شکۆدارەی هەمووان بداتەوە، ئێمەش بکاتە شوێنکەوتەیان بە چاکە، خودا بەسەر هەموو شتێك توانادارە.

***٨***

وإنما الذي ينكر اليوم ويستغرب صدوره عن كثير من أبناء الإسلام من العرب، انصرافهم عن الدعوة إلى هذا الدين العظيم، الذي رفعهم الله به، وأعزهم بحمل رسالته، وجعلهم ملوك الدنيا وسادة العالم، لما حملوا لواءه(١\٢٨١) وجاهدوا في سبيله بصدق وإخلاص، حتى فتحوا الدنيا، وكسروا كسرى، وقصروا قيصر، واستولوا على خزائن مملكتيهما، وأنفقوها في سبيل الله سبحانه.

وكانوا حينذاك في غاية من الصدق والإخلاص والوفاء والأمانة والتحاب في الله سبحانه والمؤاخاة فيه، لا فرق عندهم بين عربي وعجمي، ولا بين أحمر وأسود، ولا بين غني وفقير، ولا بين شرقي وغربي، بل هم في ذلك إخوان متحابون في الله، متعاونون على البر والتقوى، مجاهدون في سبيل الله، صابرون على دين الإسلام لا تأخذهم في الله لومة لائم، يوالون في الإسلام، ويعادون فيه، ويحبون عليه، ويبغضون عليه، ولذلك كفاهم الله مكائد أعدائهم، وكتب لهم النصر في جميع ميادين جهادهم، كما وعدهم الله سبحانه بذلك في كتابه المبين حيث يقول سبحانه: ﴿وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ وقال تعالى: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾.

*(هەڵخەلەتاوی بانگەشكارانی هزری نەتەوەیی)*

بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ نكۆڵی لێ دەكرێت و جێگەی سەرسوڕمانە، دەرچوونی زۆرێك لە عەرەبە موسڵمانەكانە لە نەوەكانی ئیسلام لەم بانگەوازە بۆ ئیسلامەتی، كە خودا بەم ئاینە پایەبەرزی كردوون بە هەڵگرتنی پەیامەكەی گەیەنراون بە شكۆمەندی و كردوونی بە پادشا و سەركردەی جیهان، ئەمەش كاتێك بوو كە ئاڵای ئیسلامیان هەڵگرت و بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لە پێناویدا جەنگان، هەتا دنیایان فەتح كرد و كیسرا و قەیصەریان تێكشكاندن، دەستیان بەسەر خەزێنەی موڵكی هەردووكیاندا گرت، لە پێناو خودای گەورەدا بەخشییان. ئەو كات لەوپەڕی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و وەفاداری و ئەمانەتپارێزیدا بوون و لەو پەڕی یەكدی خۆشویستن و برایەتیدا بوون لە پێناو خودای گەورە، هیچ جیاوازییەك لە نێوان عەرەبێك و عەجەمییەك یان سپی پێستێك و ڕەش پێستێك، یان دەوڵەمەند و هەژارێك یان ڕۆژهەڵاتنشینێك و ڕۆژئاواانشینێكدا نەبوو، بەڵكو برا و خۆشەویستی یەكتربوون لە پێناو خودای گەورە و لەسەر چاكە و تەقوا هاریكاری یەكتریان دەكرد، لەپێناو خوای گەورە جیهادیان دەكرد لە لۆمەی لۆمەكاران نەدەترسان و لەسەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئارامگربوون، خۆشویستن



ثم بعد هذا الشرف العظيم والنصر المؤزر من المولى سبحانه لعباده المؤمنين من العرب وغيرهم، نرى نفرا من أبنائنا يخدعون بالمبادئ المنحرفة، ويدعون إلى غير الإسلام، كأنهم لم يعرفوا فضل الإسلام وما حصل لأسلافهم بالإسلام من العزة والكرامة، والمجد الشامخ والمجتمع القوي الذي كتبه الله لأهل الإسلام الصادقين، حتى إن عدوهم ليخافهم وهو عنهم مسيرة شهر، نسي هؤلاء أو تناسوا هذا المجد المؤثل والعز العظيم والملك الكبير، الذي ناله المسلمون بالإسلام.

فصار هؤلاء الأبناء يدعون إلى التكتل والتجمع حول القومية العربية، ويعرفونها بأنها اجتماع وتكاتف لتطهير البلاد من العدو المستعمر، ولتحصيل المصالح المشتركة، واستعادة المجد السليب! (١\٢٨٢) .

و بوغزاندن بە پێوەری ئیسلامەتی بوو لە پێناوی خودا دا. لەبەر ئەوە خودای گەورە لە فێڵ و تەڵەکەی دوژمنانی پاراستن و سەرکەوتنی لە هەموو گۆڕەپانەکانی جیهاد دا بۆ نووسین، هەروەك خودای گەورە لە کتێبەکەی پەیمانی پێداون و دەفەرمێت: {سەر خستنی ئیمانداران بە ئەرکی سەرشانی خۆمان زانی و سەرکەوتنمان پێ بەخشین} و پەروەردگار دەفەرمێت: {ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئاینی خودا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، ئەوەخوایش پشتیوانی لەئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات}. پاش ئەو شەرەفە گەورەیە و سەرکەوتنە یەکلاکەرەوەیە لە لایەن خوای گەورەوە بۆ بەندە باوەڕدارەکانی لە عەرەب و غەیری ئەوان، کەسانێك دەبینین لە نەوەکانمان بە بنەمای لادەر هەڵدەخەڵەتێن و بانگەشە بۆ جگە لە ئیسلام دەکەن، وەك ئەوەی ئەوان فەزڵی ئیسلامیان نەزانیبێت و نەشیان زانیبێت بەهۆی ئیسلامەوە چی بەسەر پێشینانیان داهات لە عیزەت و شکۆمەندی و سەربەرزی و کۆمەڵگەی بەهێزدا، کەوا خودای گەورە بۆ ئەهلی ئیسلامی ڕاستگۆی نووسیبوو، تەنانەت دوژمنانیان لە دووری مانگێك لێیان دەترسان، ئەوانە لە بیریان کردووە یان لە بیر خۆ دەبەنەوە کە ئەم سەربەرزییە شکۆدارە و ئەم موڵکە گەورەیە،

موسڵمانان بەهۆی ئیسلامەوە دەستیان کەوتووە.

سەیرە پاش ئەم هەموو شکۆدارییە بە ئیسلام نەوەکانی ئەمڕۆمان بۆ ئەوە بچن کە بانگەشەی تەکەتول و کۆبوونەوە بکەن لە دەوری هزری نەتەوەیی عەرەبی، وای بناسێنن کە بانگەشەکەیان بۆ نەتەوایەتی کۆبوونەوەیەك و پشتگیرکردنێکە بۆ پاککردنەوەی وڵات لە دوژمنی داگیرکەر و هێنانەدی بەرژەوەندی هاوبەش و گەڕانەوەی سەربەرزی زەوت کراو!

***(جیاوازی لە پێناسەی بنەماکانی هزری نەتەوەیی لە لایەن هەڵگرانی هزرەکە)***

بانگەشەکارانی هزری نەتەوەیی لە بنچینەی بانگەشەکەیان جیاوازبوون: هەیانە گوتوویانە بنچینەکەی: نیشتمان و نەسەب و زمانی عەرەبییە. هەیانە گوتوویەتی: تەنها زمانە. هەیانە گوتوویەتی: زمان لەگەڵ هاوبەشکردن لە ئێش و ئازار و هیوا و ئاوات، قسەی دیکەشیان هەیە. کەچی لە لایەن گەورەکانیان و بوێرەکانیان ئایین لە بنچینەی بانگەشەی هزری نەتەوەییدا نییە، زۆربەیان ڕایانگەیاندووە کە ئایین هیچ پەیوەندییەکی بە هزری نەتەوەییەوە نییە، هەندێکی دیکە ڕایانگەیاندووە ئەوان ڕێز لە هەموو ئایینەکان دەگرن لە ئیسلام و ئەوانی دیکەیەوە.

**٩**

وقد اختلف الدعاة إليها في عناصرها، فمن قائل: أنها الوطن والنسب واللغة العربية. ومن قائل: أنها اللغة فقط. ومن قائل: أنها اللغة مع المشاركة في الآلام والآمال. ومن قائل غير ذلك.

أما الدين فليس من عناصرها عند أساطينهم والصرحاء منهم، وقد صرح كثير بأن الدين لا دخل له في القومية، وصرح بعضهم أنها تحترم الأديان كلها من الإسلام وغيره.

** ١٠ **

وهدفها كما يعلم من كلامهم هو التكتل والتجمع والتكاتف ضد الأعداء ولتحصيل المصالح المشتركة كما سلف، ولا ريب بأن هذا غرض نبيل وقصد جميل.

فإذا كان هذا هو الهدف، ففي الإسلام من الحث على ذلك والدعوة إليه، وإيجاب التكاتف والتعاون لنصر الإسلام، وحمايته من كيد الأعداء ولتحصيل المصالح المشتركة، ما هو أكمل وأعظم مما يرتجى من وراء القومية.

ومعلوم عند كل ذي لب سليم أن التكاتف والتعاون الذي مصدره القلوب، والإيمان بصحة الهدف، وسلامة العاقبة في الحياة وبعد الممات ـ كما في الإسلام الصحيح ـ أعظم من التعاون والتكاتف على أمر اخترعه البشر ولم ينزل به وحي السماء، ولا تؤمن عاقبته لا في الدنيا ولا في الآخرة. وأيضا فالتكاتف والتعاون الصادر عن إيمان بالله، وصدق في معاملته ومعاملة عباده، مضمون له النصر وحسن العاقبة ـ كما في الآيات الكريمات التي أسلفنا ذكرها ـ بخلاف التكاتف والتعاون المبني على فكرة جاهلية تقليدية، لم يأت بها شرع ولم يضمن لها النصر.

*یەكرێزی لەژێر چەتری پەیامی ئیسلام دوارۆژ مسوگەردەكات نەك یەكرێزی لەژێر چەتری هزری نەتەوەیی*

ئامانجی ئەم هزرەش هەروەك لە قسەكانیان دیارە بریتییە لە تەكەتول و كۆبوونەوە و پشتی یەكترگرتن دژی دوژمنانیان، تا بەرژەوەندی هاوبەش دەستەبەر بێت هەروەك باسكرا، گومانیش نییە كە ئەمانە ئامانجی شكۆدار و مەبەستی جوانن.

بەلام ئەگەر ئەمە ئامانجەكە بێت، ئەوا پێویستە بزانرێت كە لە ئیسلامدا هاندان و بانگەشە بۆ ئەم ئامانجە لە یەكرێزی و هاریكاری بۆ سەرخستنی ئیسلام و پاراستنی لە پیلانی دوژمنان بە دیهێنانی ئامانجە هاوبەشەكان تەواوتر و گەورەترە لەوەی كە هزری نەتەوەیی بە هیوایەتی.

هەروەها لای هەموو كەسێكی ژیر زانراوە كە پشتگیریكردن و هاریكاری كە لە دڵەوە هەڵدەقوولێت و باوەڕبوونیش بە ڕاستی ئامانجەكە و سەلامەتی لە پاشەڕۆژە لە ژیان و پاش مردنیش ـ هەروەك لە ئیسلامدا هەیە ـ گەورەترە لەو هاریكاری و پشتگیریكردنەی كە مرۆڤ دایهێناوە و وەحی ئاسمان داینەبەزاندووە، پاشەڕۆژەكەی جێگەی باوەڕ نییە نە لە دنیا و نە لە قیامەت.

هەروەها پشتگیركردن و هاریكاریكردنێك كە

هەڵقوولاو بێت لە بڕوایەکی پتەوەوە بە خودای پەروەردگار و ڕاستگۆبێت لە مامەڵەکردن لەگەڵ خودا و بەندەکانی، پاشەڕۆژێکی سەرکەوتووی مسوگەری هەیە وەکو پەیمانێك لە خوداوە ـ هەروەك لەو ئایەتە پیرۆزانەی پێشتر باسمانکردن ـ ئەمەش پێچەوانەی پشتگیرکردن و هاریکاریکردنێکە، کە لەسەر بیرۆکەی جاهیلیەتێکی لاساییکراو بنیادنرابێت، کە پاشماوەی نەفامی باپیرانە، نە شەرع پێیهاتووە نە سەرکەوتنی مسوگەرە.

*** ١١ ***

وهذا كله على سبيل التنزل لدعاة القومية، والرغبة في إيضاح الحقائق لطالب الحق.

وإلا فمن خبر أحوال القوميين، وتدبر مقالاتهم وأخلاقهم وأعمالهم، عرف أن غرض الكثيرين منهم من الدعوة إلى القومية أمور أخرى! يعرفها من له أدنى بصيرة بالواقع وأحوال المجتمع.

*(ناڕاستگویی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی لە بانگەشەکەیاندا)*

هەموو ئەمەی باسکرا خۆ دابەزاندنێك بوو تا بێینە ئاست بانگهێشتکەرانی هزری نەتەوەیی لە پێناو ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکان بۆ حەقویستەکانیان، ئەگەر نا ئەوەی هەواڵ و حاڵی بانگهێشتکارانی هزری نەتەوەبی بزانێ و بیر لە وتارەکان و ڕەوشتەکان و کردەوەکانیان بکاتەوە، بۆی دەردەکەوێت کە مەبەستی زۆرێك لە مانە سەرخستنی نەتەوەکەیان نییە، بەڵکو مەرامی دیکەیان هەیە! ئەمە ڕوونە لای هەموو ئەوکەسانەی توانای کەمترین هەڵسەنگاندنیان هەبێت بۆ بارودۆخی کۆمەڵگاکەیان.

**❊❊١٢❊❊**

ومن تلك الأمور:

❊ فصل الدين عن الدولة، وإقصاء أحكام الإسلام عن المجتمع، والاعتياض عنها(٢٨٣\١) بقوانين وضعية ملفقة من قوانين شتى.

❊ وإطلاق الحرية للنزعات الجنسية والمذاهب الهدامة ـ لا بلغهم الله مناهم ـ .

**❊❊١٣❊❊**

ولا ريب أن دعوة تفضي إلى هذه الغايات، يرقص لها الاستعمار طربا، ويساعد على وجودها ورفع مستواها ـ وإن تظاهر بخلاف ذلك - تغريرا للعرب عن دينهم، وتشجيعا لهم على الاشتغال بقوميتهم، والدعوة إليها والإعراض عن دينهم.

**❊دوو مەرامی بۆگەنی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی❊**

لەو مەرامانە:

❊ جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت و دوورخستنەوەی ئەحکامەکانی شەریعەتی ئیسلام لە کۆمەڵگا و چەسپاندنی ڕێساویاسا جۆراوجۆرەکان کە مرۆڤ دایناون لە جێگای ئەحکامە شەرعیەکان وەکو بەدیل.

❊ کردنەوەی دەرگای بەدڕەوشتی لە ئازادی سێکسی و مەزهەبە ڕوخێنەر و بەرەڵاکان ـ خودا بەم ئاواتە پیسەیان نەگەیەنێت ـ.

**❊(پاڵپشتی ناحەزانی ئیسلام بۆ هەڵگرانی ئەم مەرامانە)❊**

هیچیش جێی گومان نییە بانگەشەیەك مەبەستی ئەم ئامانجانە بێت، داگیرکەران بۆ ئەم بانگەشەیە سەما دەکەن، یارمەتی بوونی دەدن و ئاستەکەی بەرز دەکەنەوە، هەرچەندە خۆیان بە پێچەوانەی ئەمەوە نیشان بدەن بە مەلەکردن لە ئاوی لێل و هەڵخەلەتاندنی عەرەبەکان بە ڕازاندنەوەی بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی و ناشرینکردنی بانگەشە بۆ ئیسلام، تاوەکو پشت لە ئاینەکەیان بکەن.

****١٤****

ومن زعم من دعاة القومية أن الدين من عناصرها، فقد فرض أخطاءً على القوميين، وقال عليهم ما لم يقولوا، لأن الدين يخالف أسسهم التي بنوا القومية عليها، ويخالف صريح كلامهم ويباين ما يقصدونه من تكتيل العرب، على اختلاف أديانهم تحت راية القومية.

ولهذا تجد من يجعل الدين من عناصر القومية يتناقض في كلامه، فيثبته تارة وينفيه أخرى، وما ذلك إلا أنه لم يقله عن عقيدة وإيمان، وإنما قاله مجاملة لأهل الإسلام، أو عن جهل بحقيقة القومية وهدفها.

*(دانانی ئاین لە بنچینەکانی هزری نەتەوەیی ناپاکییە لەگەڵ ئاین و ناڕاستییە لەگەڵ هزری نەتەوەیی)*

ئەوەی وادابنێت لە بانگەشەکارانی هزری نەتەوەیی، کە ئاین لە بنچینەکانی ئەم هزرەیە، ئەوا هەڵەیەك دەخاتە پاڵ هەڵگرانی ئەم هزرە و گوتنێك بە دەمیانەوە دەڵێت کە هەرگیز خۆیان نەیانگوتووە، چونکە ئاین ناکۆکە لەگەڵ ئەو بناغەیەی کە هزری نەتەوەیی لە سەری بیناکراوە، جیاوەزە لەگەڵ ئەو وتارە ڕاشکاوانەی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی پەخشی دەکەن، دژە بۆ مەبەستەکانی کۆکردنەوەی عەرەب ـ بە ئاینە جیاوازەکانیانەوە ـ لە ژێر ئالأی ئەم هزرە.

لەبەرئەوە دەبینی ئەوەی ئاین بە یەکێك لە بنچینەکانی هزری نەتەوەیی دادەنێت، دژ و ناکۆکە لە قسەکەیدا، هەندێ جار دەیچەسپێنێت و هەندێ جاریش نەفی دەکات، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەیە کە لە باوەڕەوە ئەم قسەیە ناکات، بەڵکو وەك موجامەلەیەکی ئەهلی ئیسلام دەیڵێت، یان نەزانە بە حەقیقەت و ئامانجەکانی هزری نەتەوەیی.

** ١٥ **

وهكذا قول من قال: إنها تخدم الإسلام أو تسانده، وكل ذلك بعيد عن الحقيقة والواقع، وإنما الحقيقة أنها تنافس الإسلام وتحاربه في عقر داره، وتطلي ببعض خصائصه ترويجا لها وتلبيسا أو جهلا وتقليدا.

*(ئەوانەی دەڵێن هزری نەتەوەیی خزمەتی ئیسلام دەكات یان ناپاكن لە گوتنەكەیاندا یان نەزانن)*

بەهەمان شێوە ئەوانەی كە دەڵێن هزری نەتەوەیی: خزمەتی ئیسلام دەكات یان پشتگیری لێدەكات، گوتنەكەیان دوورە لە ڕاستی، بەڵكو ڕاستییەكە ئەوەیە كە هزری نەتەوەیی شەڕ و ڕكابەرایەتی لەگەڵ ئیسلامەتی دەكات لە ناو ماڵی ئیسلامدا لەگەڵ ئیسلام دەجەنگێت، هەرچەندە لەم جەنگەدا زۆرجار خۆی وەكو دوژمن دەرناخات، بەڵكو خۆی بە هەڵگری هەندێك تایبەتمەندیەكانی ئیسلام دەزانێت وەكو بانگەشەیەك بۆ خۆی لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا چ بە هەڵخەلەتاندنی خەڵكی موسڵمان یان وەكو نەشارەزایی بە ئیسلام و لاسایی كردنەوەی ئیسلام تەنها وەكو كلتورێكی نەتەوەیی!

** ١٦ **

ولو كانت الدعوة إلى القومية يراد منها نصر الإسلام وحماية شعائره، لكرس القوميون جهدهم في الدعوة إليه ومناصرته، وتحكيم دستوره النازل من فوق سبع سماوات، ولبادروا إلى التخلق بأخلاقه، والعمل بما يدعو إليه، وابتعدوا عن كل ما يخالفه لأنه الأصل الأصيل والهدف الأعظم، ولأنه السبيل الذي من سار عليه،

*(بەڵگەی عەقلی لەسەر ناپاكی و نەفامی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی)*

جا ئەگەر بانگەشەكردن بۆ هزری نەتەوەیی مەبەست پێی سەرخستنی ئیسلام و پاراستنی شەعائیرەكانی بێت، ئەوا هەڵگرانی ئەم هزرە تواناكانی خۆیان بۆ بانگەشەكردن بۆ ئیسلام و سەرخستنی تەرخان دەكرد و حوكمیان بە دەستوورەكەی دەكرد كە لە سەرەوەی حەوت ئاسمانەوە دابەزیوە، دەستپێشخەریش دەبوون لە

واستقام عليه، وصل إلى شاطئ السلامة، وفاز بالجنة والكرامة، ومن حاد عن سبيله باء بالخيبة والندامة، وخسر الدنيا والآخرة.

فلو كان دعاة القومية يقصدون بدعوتهم إليها تعظيم الإسلام وخدمته، ورفع شأنه، لما اقتصروا على الدعوة للخادم دون المخدوم، وكرسوا(١\٢٨٤) لهذا الخادم جهودهم، وغضبوا من صوت دعاة الإسلام إذا دعوا إليه، وحذروا مما يخالفه أو يقف حجرا في طريقه.

خۆ ڕازاندنەوە بە ڕەوشتی ئیسلام و کارکردن بە فەرمانەکانی دووركەوتنەوە لە هەموو ئەو کارانەی سەرپێچین بۆ ئیسلام، چونکە ئیسلام ئامانجی هەرە گەورەیە و بنەمای هەموو بنەمایەك پێویستە بۆ ئیسلام بگەڕێتەوە. کە تاکە ڕێگایە ئەوەی لە سەری بڕوات دەگاتە کەناری ئارامی و بەهەشت و سەرفرازی دەباتەوە و ئەوەی لەم ڕێگایەش لابدات تووشی پەشێمانی و نائومێدی دەبێت و دونیا و قیامەت لە دەست دەدات.

جا ئەگەر بانگەشەکارانی هزری نەتەوەیی مەبەستیان لە بانگەشەکەیان بەگەورەدانانی ئیسلام و خزمەتکردن و بەرزکردنەوەی پلەوپایەی ئیسلام بێت ـ بە مانایەکی دیکە هزری نەتەوەیی لایان خزمەتکارە و ئیسلام خزمەت بۆکراوە ـ ئەوا ئەمە لە سەریان پێویستدەکات کە بانگەشە بۆ خزمەت بۆکراوەکە بکرێت کە ئیسلامە نەك بانگەشە بۆ خزمەتکار کە هزری نەتەوەییە! بەڵام واقیعەکەی هەڵگرانی هزری نەتەوەیی پێچەوانەی گوتنەکەیانە، چونکە نەك تەنها خزمەت بە ئیسلام ناکەن، بەڵکو ڕێگری لە بانگخوازانی ئیسلام دەکەن کاتێك بانگەوازی بۆ دەکەن و هەرشتێك بە پێی ویستی هزرە نەتەوەییەکەیان نەبێت دژی دەوەستن و لای دەدەن با ڕاستیش بێت و خزمەتکاربێت بۆ

****١٧****

لو كان دعاة القومية يريدون بدعوتهم إعلاء كلمة الإسلام، واجتماع العرب عليه، لنصحوا العرب ودعوهم إلى التمسك بتعاليم الإسلام، وتنفيذ أحكامه، ولشجعوهم على نصره ودعوة الناس إليه، فإن العرب أولى الناس بأن ينصروا الإسلام، ويحموه من مكائد الأعداء، ويحكموه فيما شجر بينهم، كما فعل أسلافهم لأنه عزهم وذكرهم ومجدهم، كما قال الله تعالى: ﴿لَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ أَفَلَا تَعْقِلُونَ﴾ وقال ﴿فَاسْتَمْسِكْ بِالَّذِي أُوحِيَ إِلَيْكَ إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ﴾﴿وَإِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَوْمِكَ وَسَوْفَ تُسْأَلُونَ﴾ .

کۆمەڵگا، لێی توڕەدەبن قەبولی ناکەن و بە بەردی سەر ڕێگاکەیان دەزانن هەوڵی تێکشکاندنی دەدەن.

***(گریمان ئەگەر بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی بانگەشە بێت بۆ ئیسلام، ئەوا پێویستە بانگەشە بۆ ئەحەکام و ئەخلاقیاتی ئیسلام بکات)***

جا ئەگەر بانگەشەکارانی هزری نەتەوەیی مەبەستییان لە بانگەشەکەیان بەرزکردنەوەی وشەی (لا إله إلا الله محمد رسول الله) بێت و کۆکردنەوەی عەرەب بێت لەسەر ئەم وشەیە، با ئامۆژگاری کۆمەڵگای عەرەبیان کردبا بۆ دەستگرتن بە ئەخلاقیاتی ئیسلام و جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی و هانی عەرەبیان بدابا بۆ سەرخستنی ئیسلام و بانگەشەکردنی خەڵك بۆ ئیسلام. بەڵام ئەمە هەرگیز لە هەڵگرانی هزری نەتەوەیی عەرەبی نابینرێت و نابیسرێت، هەرچەندە عەرەبەکان لە هەموو خەڵك ئەولاترن بۆ سەرخستنی ئیسلام و پاراستنی ئیسلام لە فێڵ و تەڵەکەی دوژمنەکانی، لە هەموو خەڵك ئەولاترن بۆ گەڕاندنەوەی ناکۆکیەکانیان بۆ شەریعەتی ئیسلام وەکو پێشینانیان کە بە ئیسلام شکۆدار و سەرفرازببوون، ناویاندەرکردبوو بە هێز و چاکە، هەروەك پەروەردگار سەبارەت بەم مێژوویەوە دەفەرمێت : {سوێند بەخوا بێگومان

**١٨**

وإذا عرفت أيها القارئ ما تقدم، فاعلم أن هذه الدعوة: أعني الدعوة إلى القومية العربية، أحدثها الغربيون من النصارى، لمحاربة الإسلام والقضاء عليه في داره، بزخرف من القول، وأنواع من الخيال، وأساليب من الخداع، فاعتنقها كثير من العرب من أعداء الإسلام، واغتر بها كثير من الأغمار ومن قلدهم من الجهال، وفرح بذلك أرباب الإلحاد وخصوم الإسلام في كل مكان.

ئێمە کتێبێکمان ڕەوانە کردووە بۆتان کە یاداوەریە و سەربەرزی ئێوە لە شوێنکەوتنیایەتی، ئایا ئەوە بیرو هۆشتان ناخەنەکار و ژیر نابن؟} هەروەها فەرموویەتی: {کەواتە تۆ بێ خەم بەو پابەندی ئەوەبە کە نیگات بۆ کراوە، چونکە تۆ بەڕاستی لەسەر ڕێگە و ڕێباز و بەرنامەیەکی ڕاست و دروستیت (لە لایەن پەروەردگارتەوە ئاراستە دەکرێیت)}،{بەڕاستی ئەم قورئانە یادخەرەوەیە بۆ خۆت و بۆ قەومەکەت، لە ئایندەشدا پرسیارتان لێدەکرێت دەربارەی}.

**(هزری نەتەوەیی لە ناو عەرەب بیرۆکەی نەسرانیەکانە)**

ئەی خوێنەری بەڕێز، ئەگەر ئەوەی پێشەوەت زانی، ئەوە بزانە ئەم بانگەشەیە: مەبەستم بانگەشە بۆ هزری نەتەوایەتی عەرەبی، لە داهێنانی نەسارای ئەورووپایە، مەبەستیشیان لە داهێنانی ئەم هزرە شەڕی ئیسلام و لە ناوبردنی ئیسلامە لە ناو ماڵی ئیسلامدا، ئەوەش بە ڕازاندنەوەی گوتار و جۆرەکانی خەیاڵ و ئامرازەکانی فێڵ و تەلەکەبازی.

بەمە زۆرێك لە عەرەبەکان کە دوژمنی ئیسلام بوون باوەشیان پێی کرد، هەروەها زۆرێك لە سەرانی نەزان و بێ تەجروبە و خەڵکی لاساییکەرەوانیان پێی هەڵخەلەتان، سەرانی ئیلحاد و ڕکابەرانی ئیسلامیش بەم هزرە نەتەوەییە دڵخۆش بوون لە هەموو شوێنێك.



**١٩**

ومن المعلوم من دين الإسلام بالضرورة أن الدعوة إلى القومية العربية أو غيرها من القوميات، دعوة باطلة وخطأ عظيم، ومنكر ظاهر، وجاهلية وكيد سافر للإسلام وأهله، وذلك لوجوه:

*(هزری نەتەوەیی عەرەبی نەفامی و پیلانگێڕییە دژ بە ئیسلام)*

شتێکی زانراو و بەڵگە نەویستە لە ئایینی ئیسلام کە بانگەشەکردن بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی یان هەر هزرێکی نەتەوەیی دیکە، بانگەشەیەکی بەتاڵ و هەڵەیەکی گەورەیە و خراپەیەکی ڕوون و دیارە، و بە هەموو ماناکانی بریتییە لە نەفامی و پیلانگێڕی ئاشکرا دژ بە ئیسلام و موسڵمانان، ئەم ڕاستییەش بۆمان دەردەکەوێت لە چەندین ڕوویەوە:

**٢٠**

الأول: أن الدعوة إلى القومية العربية تفرق بين المسلمين، وتفصل المسلم العجمي عن أخيه العربي، وتفرق بين العرب أنفسهم لأنهم كلهم ليسوا يرتضونها، وإنما يرضاها منهم قوم دون قوم.

وكل فكرة تقسم المسلمين وتجعلهم أحزابا فكرة باطلة، تخالف مقاصد الإسلام وما يرمي إليه وذلك لأنه يدعو إلى الاجتماع والوئام، والتواصي بالحق والتعاون على(١\٢٨٥) البر والتقوى، كما يدل على ذلك قوله سبحانه: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ

*ڕووی یەکەمی پیلانگێڕی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان بە هزری نەتەوەیی*

- هزری نەتەوەیی پیلانی پەرتەوازەکردنی موسڵمانانە -

یەکەم: بانگەشەکردن بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی پەرتەوازەکردن و جیاکردنەوەیە لە نێوان موسڵماناندا، موسڵمانی عەجەمی ( هەر موسڵمانێك عەرەب نەبێت) لە برایە عەرەبەکەی جیادەکاتەوە، هەروەها خودی عەرەبەکان خۆیان لێك جیادەکاتەوە؛ چونکە ئەوانیش هەموویان بەم بانگەشەیە ڕازی نین و خەڵکانێك پێی ڕازین و خەڵکانێك پێی ناڕازین.

هەر بیرۆکەیەکیش موسڵمانان دابەش بکات و بیانکاتە حیزب حیزب، ئەوا بیرۆکەیەکی بەتاڵە

إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ﴾﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وَكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾ وقال تعالى: ﴿هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ﴾﴿وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنْفَقْتَ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ} وقال تعالى: ﴿مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾﴿مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾.

فانظر أيها المؤمن الراغب في الحق كيف يحارب الإسلام التفرق والاختلاف، ويدعو إلى الاجتماع والوئام، والتمسك بحبل الحق والوفاة عليه، تعلم بذلك أن هدف القومية غير هدف الإسلام، وأن مقاصدها تخالف مقاصد الإسلام.

ويدل على ذلك أيضا أن هذه الفكرة، أعني الدعوة إلى القومية العربية وردت إلينا من أعدائنا الغربيين، وكادوا بها المسلمين، ويقصدون من ورائها فصل بعضهم عن بعض، وتحطيم كيانهم، وتفريق شملهم، على قاعدتهم المشئومة (فرق تسد) وكم نالوا من الإسلام وأهله بهذه القاعدة النحيسة، مما يحزن القلوب ويدمي العيون.

و ناكۆكە لەگەڵ مەبەستەكانی ئیسلام و ئەوەی ئیسلام دەیەوێت، چونكە ئیسلام بانگەشەیە بۆ كۆبوونەوە لەسەر حەق و ڕێككەوتن و دەستگرتن بە حەق و هاریكاریكردن لەسەر چاكە و تەقواداری، هەروەك پەروەردگار دەفەرمێت: {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لە خودا بترسن و پارێزكاربن بەشێوەیەكی وا كە شایستەی ئەو زاتەیە و هەمیشە پابەند و دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەر كاتێک مردن بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن} ،{(هەوڵ بدەن) هەر هەمووتان بە توندی دەست بگرن بە ئاینی خوداوەو پەرت و بڵاو مەبن، یادی ناز و نیعمەتی خودا بكەنەوە لەسەرتان، (چونكە) كاتی خۆی دوژمنی یەكتر بوون، ئەوە بوو دڵەكانتانی بەهۆی نیعمەتی (ئیسلامەوە) پەیوەست كرد بەیەكەوە و هەموو بوونە برای یەكتر (هەروەها ئەو كاتە) ئێوە لەسەر لێواری چاڵێكی ئاگر وەستا بوون و (خەریک بوو بكەونە ناوی)، بەڵام خودا (بەڕەحم و میهرەبانی خۆی) لەو ئاگرە ڕزگاری كردن، ئا بەو شێوەیە خودا ئایەتەكانی خۆی بۆتان ڕوون دەكاتەوە، بۆ ئەوەی هیدایەت وەربگرن} وپەروەردگار دەفەرمێت: { هەر ئەو زاتە كاتی خۆی پشتیوانیی لێكردیت و سەری خستیت و ئیماندارانیشی كردە هۆیەک بۆ بەدەستهێنانی سەركەوتن...} {دڵەكانیشیانی بەست بەیەكەوە، ئەگەر هەرچی دارایی زەوی هەیە، هەر هەموویت خەرج بكردایە تا دڵەكانیانت

پەیوەند بکردایە بە یەکەوە، ئەوە نەتدەتوانی ئەو دڵانە پەیوەست بکەیت بەیەکەوە، بەڵام خودا (بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە) خۆشی و یەکێتی و برایەتی لە نێوانیاندا بەرپاکرد، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە باڵادەست و دانایە}

وپەروەردگار دەفەرمێت: { خەڵکینە: ڕوو بکەنە پەروەردگارتان، بە ملکەچی بگەڕێنەوە بۆلای، لەو بترسن و خۆتان لە سزای بپارێزن، نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن، مەبن بەو کەسانەی کە شەریك و هاوەڵی بۆ بڕیار دەدەن * لەوانەی کە ئاینەکەیان بەش بەش کردووەو بوونەتە چەندەها گرۆب و دەستە (بروایان بەهەندێکی هەیەو بروایان بەهەندێکی نییەو کوێرانە شوێن ڕابەرەکەیان دەکەون) هەر گرۆب و پارتێکیش دڵخۆش بە بەرنامە و نەخشە و پلانی خۆیان (وا دەزانن چاکترین ڕێبازیان گرتۆتەبەر)}.

جا ئەی ئیمانداری ئارەزوومەند بۆ حەق و ڕاستی، سەیر بکە چۆن ئیسلام جەنگە دژی ناکۆکی و پەرتەوازەی، بانگەشەیە بۆ کۆبوونەوە و ڕێکەوتن و بەردەوامبوون لەسەر ڕێگای حەق و مردن لەسەری.

لەمەوە بزانە ئامانجی هزری نەتەوەیی وەك ئامانجی ئیسلام نییە، هەروەها مەبەستەکانی جیاوازە لە مەبەستەکانی ئیسلام.

هەروەها بەڵگەی دیکە لەسەر ئەوەی کە هزری نەتەوەیی بریتییە لە ئامرازی دروستکردنی دووبەرەکی لە نێوان موسڵمانان ئەوەیە کە ئەم هزرە لە دوژمنەکانمانەوە بۆ هاتووە لە ئەوروپا،

بەهۆی ئەم هزرەوە پیلانگێڕییان لە ناو موسڵماناندا کردووە، بەمەرامی لێك جوداکردنیان و تێکشکاندنیان و لەناوبردنیان بە پێی بنەمای: (ئەگەر بتەوێ دەست بەسەر گەلێکدا بگری دووبەرەکیان بێخە ناو ـ فرق تسد ـ)، و بەڕاستی توانییان بە هۆی ئەم بنەمایە خراپەوە دەست لە ئیسلام و موسڵمانان بوەشێنن بە جۆرەها شێواز کە جێگای حەسرەتی دڵ و فرمێسکی چاون.

*پوختە مێژوویەکی سەرهەڵدانی هزری نەتەوەیی عەرەبی*

زۆرێك لە مێژوونووسان کە سەبارەت بە مێژووی هزری نەتەوەیی عەرەبی نووسیویانە ـ لەوانە نووسەری مەوسوعەی عەرەبی ـ مێژووی ئەم هزرە بۆ کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەی زایینی دەگەڕێننەوە، کە دەستپێکەکەی لە سەر دەستی ئەوروپیەکان بوو بەناردنی نێردەکانی (بعثات) تەبشیر و بەفەلەکردنی موسڵمانان لە سوریا، کە بە هەوڵدانی جیاکردنەوەی تورك و عەرەب دەستیان بە کارەکەیان کرد وەکو هەنگاوێکی لێکترازاندنی نێوان موسڵمانان و چاندنی تووی دووبەرەکی لە نێوانیاندا، بە بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی.

بە تێپەڕبوونی کات بانگەشەکەس بەردەوام بوو، زۆرتر و زووتر گەشەی دەکرد لە شام و عیراق و لوبنان، هەتا لە پاریس لە ساڵی (١٩١٠ز)

** ٢١ **

وذكر كثير من مؤرخي الدعوة إلى القومية العربية، ومنهم مؤلف الموسوعة العربية: أن أول من دعا إلى القومية العربية في أواخر القرن التاسع عشر الميلادي، هم الغربيون على أيدي بعثات التبشير في سوريا، ليفصلوا الترك عن العرب، ويفرقوا بين المسلمين.

ولم تزل الدعوة إليها في(١\٢٨٦) الشام والعراق ولبنان تزداد وتنمو، حتى عقد لها أول مؤتمر في باريس من نحو ستين سنة، وذلك عام ١٩١٠ م، وكثرت بسبب ذلك الجمعيات العربية، وتعددت الاتجاهات، فحاول الأتراك إخمادها، بأحكام الإعدام التي نفذها جمال باشا في سورية في ذلك الوقت، إلى آخر ما ذكروا.



ئەوروپییەكان یەكەم كۆنگرەیان بۆ بەستن، بەهۆی ئەوەشەوە جەمعیاتی عەرەبی زۆر بوون و ڕێڕەوەكانیان جیاوازبوو، توركەكان هەوڵیاندا ئەم بانگەوازە (بانگەواز بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی) دایبمركێننەوە، بە حوكمی لە سێدارەدانی سەرانی ئەم هزرە، كە جەمال پاشا لە سوریا جێبەجێی دەكردن لەو كاتەدا. مێژوونووسانی هزری نەتەوەیی عەرەبی زۆر شتی دیكەیان لەم بارەیەوە باسكردووە، ئەوەندەی گواستمانەوە كیفایەتە.

*پرسیار و وەڵامێك بۆ هەموو موسڵمانێكی هۆشمەند*

*** ٢٢ ***

فهل تظن أيها القارئ أن خصومنا وأعداءنا يسعون في مصالحنا، بابتداعهم الدعوة إلى القومية العربية، وعقد المؤتمرات لها، وابتعاث المبشرين بها؟

لا والله، إنهم لا يريدون بنا خيرا ولا يعملون لمصالحنا، إنما يعملون ويسعون لتحطيمنا وتمزيق شملنا، والقضاء على ما بقي من ديننا.

وكفى بذلك دليلا لكل ذي لب، على ما يراد من وراء الدعوة إلى القومية العربية، وأنها معول غربي استعماري، يراد به تفريقنا وإبعادنا عن ديننا كما سلف.

كەواتە ئەی خوێنەری موسڵمان تۆ وا تێدەگەیت كە دوژمنانمان دەیانەوێت پارێزگاری لە بەرژەوەندیەكانمان بكەن، بە بانگەوازكردن بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی و بەستنی چەندین كۆنگرە لە پێناویدا و ناردنی چەندین نێردە بۆ ڕازاندنەوەی ئەم هزە لە مێشكی كەسی عەرەبی موسڵماندا؟

نەخێر سوێند بەخودا ئەوانە چاكەی ئێمەیان ناوێت، كاریش بۆ بەرژەوەنیەكانمان ناكەن، بەڵكو بە هەموو تواناییەك هەوڵی لەناوبردنمان دەدەن بە چاندنی تووی دووبەرەكی لە نێوانماندا و نەهێشتنی ئەو پاشماوە ئیسلامە پیرۆزەی كەلەناوماندا ماوە.

ئەمەش بەسە بۆ هەموو موسڵمانێكی ژیر، كە

بزانێت مەبستی دوژمنانمان چییە لە هاندانمان بۆ هزری نەتەوەیی، بێگومان مەبەستیان دوورخستنی موسڵمانانە لە دینەکەیان، هزری نەتەوەیش وەکو چاکوچێکی پۆلاین لە دەستیانە بۆ ئەم مەبەستە کە بە هۆیەوە تووی دووبەرەکی دەڕوێنن لە نێوانماندا و دوورمان دەخەنەوە لە دینەکەمان وەکو باسکرا.

****٢٣****

ومن العجب الذي لا ينقضي، أن كثيرا من شبابنا وكتابنا ـ ألهمهم الله رشدهم ـ خفيت عليهم هذه الحقيقة، حتى ظنوا أن التكتل والتجمع حول القومية العربية، والمناصرة لها، أنفع للعرب وأضر للعدو، من التجمع والتكتل حول الإسلام ومناصرته!

وهذا بلا شك ظن خاطئ، واعتقاد غير مطابق للحقيقة. نعم لا شك أنه يحزن المستعمر ويقلق راحته كل تجمع وتكتل ضد مصلحته، ولكن خوفه من التجمع والتكتل حول الإسلام أعظم وأكبر، ولذلك رضي بالدعوة إلى القومية العربية، وحفز العرب إليها، ليشغلهم بها عن الإسلام، وليقطع بها صلتهم بالله سبحانه لأنهم إذا فقدوا الإسلام حرموا ما ضمنه الله لهم من النصر، الذي وعدهم به في الآيتين السابقتين، وفي

***کۆبونەوە لە دەوری هزری نەتەوەیی جێی ڕازیبوونی دوژمنانی ئیسلامە***

زۆریش جێی سەرسوڕمانە کە دەبینین زۆرێك لە گەنجان و نووسەرانمان ـ خودا بیانگەڕێنێتەوە بۆ ژیری و هیدایەت ـ ئەم ڕاستییەیان لا شاراوەیە، هەتا وا گومانیان برد کە کۆبوونەوە لە دەوری هزری نەتەوەیی عەرەبی و سەرخستنی، سوودمەندترە بۆ عەرەب و بە زیانترە بۆ دوژمن، لە کۆبوونەوە لە دەوری ئیسلام و سەرخستنی!

ئەمەش بێگومان بۆچوونێکی هەڵەیە و لێکدانەوەیەکی چەوتە و بڕواداریییەکی دوورە لە ڕاستی. بەڵێ گومانی تێدانییە کە داگیرکەر دڵتەنگ و بێ ئارام دەبێت لە هەموو کۆبوونەوە و یەکڕیزییەك کە دژی بەرژەوەندییەکەی بێت، بەڵام ترسەکەی لە کۆبوونەوە و یەکڕێزی لە دەوری ئیسلام گەورەترە لە کۆبوونەوە و

قوله تعالى: ﴿وَلَيَنْصُرَنَّ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾﴿الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾(٢٨٧\١).

**٢٤**

ومعلوم عند جميع العقلاء أنه إذا كان لا بد من أحد ضررين، فارتكاب الأدنى منهما أولى، حذرا من الضرر الأكبر، وقد دل الشرع والقدر على هذه القاعدة، وقد عرفها المستعمر وسلكها

یەکڕیزی لە دەوری هزری نەتەوەیی، هەر لەبەر ئەمەش بە بانگەشەکردن بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی ڕازی بووە و عەرەبی بۆ هاندەدات، تا بەم هزرە خەریکیان بکات و لە ئیسلامیان دوور بخاتەوە، پەیوەندیان بە خودای گەورە بپچڕێنێت، چونکە لەدەستدانی عەرەب بۆ ئیسلامەتی بریتییە لەدەستدانیان بۆ پەیمانی سەرکەوتنیان لە قورئانی پیرۆز کە پەروەردگار ـ وەك لە دوو ئایەتی پێشتر ـ دەفەرمێت: {سوێند بێت بێگومان خوا ئەو کەسە سەردەخات کە پشتگیری ئاین و بەرنامەکەی دەکات و هەواڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خودا زۆر بەهێز و باڵادەستە * ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمان کردن لە زەویدا نوێژ و دروشمەکانی بەچاکی ڕادەگرن، زەکاتیش بەتەواوی دەدەن، فەرمان بەچاکە دەکەن، قەدەغە لە خراپە دەکەن، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خودا دەگەڕێتەوە} .

*بۆچی دوژمنانی ئیسلامە کۆبوونەوە لە دەوری هزری نەتەوەیی بۆ گەلانی موسڵمان پەسەند دەکەن؟*

زانراوە لای هەموو کەسێکی ژیر، کە کاتی ناچاربوون لە سەر هەڵبژاردنی یەکێك لە دوو زیان پێویستە کەمترینیان هەڵبژێردرێت، لەپێناو دوورخستنەوەی زیانی گەورەتر، ئەم

في هذا الباب وغيره.

فتنبه يا أخي واحذر مكائد الشيطان والاستعمار وأوليائهما، تنج من ضرر عظيم، وخطر كبير، وعواقب سيئة عافاني الله وإياك والمسلمين من ذلك.

ڕاستییەش شەریعەت و عەقل دانی پێدەنێن. داگیرکەریش لەم ڕوویەوە بەکاری هێناوە، کۆبوونەوەی لە سەر هزری نەتەوەیی هەڵبژاردووە بۆ موسڵمانان نەك کۆبوونەوە لەسەر ئیسلام، هەرچەندە ناحەزن بۆ هەموو کۆبوونەوەیەك، چونکە دووبەرەکی گەلان لە بەرژەوەندی ئەواندایە.

هەروەها لە چەندین ڕووی دیکە داگیرکەر ئەم بنەمایە بەکاردێنێت، کەواتە ئەی برای بەڕێزم ئاگاداربە لە پیلانگێڕی شەیتان و داگیرکەر و لایەنگرانیان لە هەڵگرانی هزری نەتەوەیی، تاوەکو لە دوڕانێك و ترسناکیەکی گەورە ڕزگار ببیت، لە دەرەنجامە نەخوازراوەکانی ئەم هزرە دەرباز ببیت، خودا ئێمە و ئێوە و گشت موسڵمانان لەم هزرە بپارێزێت.

** ٢٥ **

ومما تقدم يعلم القارئ اليقظ أن الدعوة إلى القومية العربية ـ كما أنها إساءة إلى الإسلام ومحاربة له في بلاده ـ فهي أيضا إساءة إلى العرب أنفسهم، وجناية عليهم عظيمةٌ لكونها تفصلهم عن الإسلام الذي هو مجدهم الأكبر، وشرفهم الأعظم ومصدر عزهم وسيادتهم على العالم، فكيف يرضى عربي عاقل بدعوة هذا شأنها وهذه غايتها؟!

*خراپەی هزری نەتەوەیی بۆ سەر نەتەوەکان*

لەوەی باسکرا بۆ هەموو خوێنەرێکی ژیر و بە ئاگا دەردەکەوێت کە بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی نەك تەنها خراپەی بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەبووە لە وڵاتی موسڵماناندا، بەڵکو خراپەی بە عەرەبیش گەیاندووە وەکو نەتەوە، چونکە بەم هزرە لە ئیسلام دوورخراونەتەوە، تەنها ئیسلامیش سەربەرزی و شوکوداری ئەوانە و تەنها ئیسلام سەرچاوەی سەرکردایەتی کردنیانە بۆ هەموو جیهان، کەواتە چۆن عەرەبێکی ژیر بە بانگەوازی هزری

** ٢٦ **

ولقد أحسن الكاتب الإسلامي الشهير: أبو الحسن الندوي في رسالته المشهورة: (اسمعوها مني صريحة: أيها العرب) حيث يقول في صفحة ٢٧ و ٢٨ ما نصه:

(فمن المؤسف المحزن المخجل أن يقوم في هذا الوقت في العالم العربي، رجال يدعون إلى القومية العربية المجردة من العقيدة والرسالة، وإلى قطع الصلة عن أعظم نبي عرفه تاريخ الإيمان، وعن أقوى شخصية ظهرت في العالم، وعن أمتن رابطة روحية تجمع بين الأمم والأفراد والأشتات، إنها جريمة قومية تبز جميع الجرائم القومية، التي سجلها تاريخ هذه الأمة، وإنها حركة هدم وتخريب، تفوق جميع الحركات الهدامة المعروفة في التاريخ، وإنها خطوة حاسمة مشئومة، في سبيل الدمار القومي والانتحار الاجتماعي) انتهى.

فتأمل: أيها القارئ كلمة هذا العالم العربي الحسني الكبير الذي قد سبر أحوال العالم وعرف نتائج الدعوة إلى القوميات وسوء مصيرها، تدرك(١\٢٨٨) بعقلك السليم ما وقع فيه

نەتەوەیی ڕازی دەبێت کە ناوەڕۆکەکەی لێك جوداکردنی عەرەب و ئیسلامە!؟

*نامەی ابو الحسن الندوی بۆ ئاگادارکردنەوەی گەلانی عەرەب لە بانگەشکاری بۆ هزری نەتەوەیی*

نووسەری بەناوبانگی ئیسلام: **أبو الحسن الندوی** لە نامە بەناوبانگەکەیدا بەناونیشانی: (**عەرەبەکان: بەڕاشکاوی گوێبیستم** بن = **إسمعوها مني صريحة: أيها العرب**) بە جوانی عەرەبەکان لە ترسناکی هزری نەتەوەیی عەرەبی ئاگاداردەکاتەوە و لە لاپەڕەکانی ٢٧ و ٢٨ نامەکەیدا دەفەرمێت:

(جێگەی ئەسەف و شەرم و دڵتەنگییە، لەم کاتەدا لە جیهانی عەرەبی کەسانێك هەن بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی عەرەبی دەکەن کە هزرێکی دوورەپەرێزە لە پەیام و بیروباوەڕی ئیسلام، هەڵگرانی ئەم هزرەش بانگەشە دەکەن بۆ دابڕاندنی عەرەب لە گەورەترین پێغەمبەر کە لە مێژووی بیروباوەڕدا ناسراوبێت و دابڕاندنیان لە گەورەترین کەسایەتی کە لە جیهاندا دەرکەوتبێت، کە (محمد المصطفى)ە ـ صلى الله عليه وسلم ـ و دابڕاندنیان لە گەورەترین پەیامی ڕوحی کە گشت میللەتان یەك دەخات و باشترین تووی پەیوەندی لە نێوان تاك و کۆمەڵاندا دەڕوێنێت کە ئیسلامە.

العرب والمسلمون اليوم، من فتنة كبرى ومصيبة عظمى، بهذه الدعوة المشئومة، وقى الله المسلمين شرها، ووفق العرب وجميع المسلمين للرجوع إلى ما كان عليه أسلافهم المهديون، إنه سميع مجيب.

بەڕاستی بانگەشە بۆ ئەم هزرە تاوانێکی نەتەوەییە سەروی هەموو تاوانێکی بانگەشکارە بۆ نەتەوایەتی لە مێژووی ئەم ئوممەتەدا، بەڵکو بانگەشە بۆ ئەم هزرە بزوتنەوەیەکی تێکدان و کاولکردنە و لە سەروی هەموو هزرێکی تێکدەر و کاوڵکاردایە کە لە مێژوودا ناسراو بێت، هەروەها ئەم بانگەشەیە هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە و شۆمە بەرەو لە ناوبردنی مانا دروستەکانی نەتەوایەتی و هیمەتێکی ترسناکە بەرەو خۆکوژی کۆمەڵایەتی) ـ کۆتایی هات ـ.

ئەی خوێنەری بەڕێز، بیربکەرەوە لە گوتەی ئەم زانایە پایەبەرزە کە زانایەکی عەرەبی حەسەنیی یە، بارودۆخی جیهانی ناسیوە و ئەنجامی بانگەشەکردن بۆ هزری نەتەوەیی و چارەنووسە خراپەکەی زانیوە. تاوەکو بە ئەقڵە دروستەکەت هەست بەوە بکەیت کە عەرەب و موسڵمانان لە ئەمڕۆدا چۆن کەوتوونەتە ئاشوب و بەلایەکی گەورەوە بە هۆی بانگەواز بۆ ئەم هزرە شۆمە (هزری بانگەشە بۆ نەتەوایەتی)، خودای گەورە موسڵمانان لە خراپە و شەڕەکەی بپارێزێت، عەرەب و هەموو موسڵمانان مووەفەق بکات بۆ گەڕانەوە بۆ ئەوەی پێشینە ڕێنیشاندراوەکان لەسەری بوون، تەنها خودا بۆ پاڕانەوە بیسەر و وەڵامدەرە.

**٢٧***

ثم لا يخفاك: أيها القارئ الكريم غربة الإسلام اليوم، وقلة أنصاره والمتحمسين لدعوته، وكثرة المحاربين له والمتنكرين لأحكامه وتعاليمه، فالواجب على أبناء الإسلام بدلا من التحمس للقومية والمناصرة لدعاتها: أن يكرسوا جهودهم للدعوة إلى الإسلام وتعظيمه في قلوب الناس، وأن يجتهدوا في نشر محاسنه وإعلان أحكامه العادلة، وتعاليمه السمحة الصافية، نقية من شوائب الشرك والخرافات والبدع والأهواء، حتى يعيدوا بذلك ما درس من مجد أسلافهم، وحماستهم للإسلام، وتكريس قواهم لنصرته وحمايته، والرد على خصومه بشتى الأساليب الناجعة، وأنواع الحجج والبراهين الساطعة.

ولا شك أن هذا واجب متحتم، وفرض لازم على جميع أبناء الإسلام، كل منهم بحسب ما أعطاه الله من المقدرة والإمكانات، التي يستطيع بها القيام بما أوجب الله عليه من النصر لدينه والدعوة إليه.

فنسأل الله أن يمن على الجميع بذلك، وأن يصلح قلوبنا وأعمالنا، وأن يقر أعين المسلمين جميعا بنصر الإسلام الصافي من الشوائب، وظهوره على جميع خصومه في القريب العاجل، إنه سبحانه خير مسئول وأقرب مجيب.(١\٢٨٩).

*غوربەتی ئیسلام لە ئەمڕۆماندا و پێویستیمان بە سەرخستنی*

لە پاش ئەمەی باسکرا: ئەی خوێنەری بەڕێز لات شاراوە نییە کە لە ئەمڕۆماندا ئیسلام لەلایەك بە قوناغی غەریبی و لاوازی لایەنگران و کەمی پەروشانی بانگەوازەکەی تێدەپەڕێت، لە لایەکی دیکە بە زەبری دوژمنانی و زۆری پشت لێکەرانی دەوردراوە، کەواتە ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر لە سەر نەوەی ئیسلام پێویستە کە لەجیاتی بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی بانگەشە بۆ ئیسلام بکەن بە گەورەدانانی ئیسلام لە دڵ و دەروونی خەڵکاندا، لە پێناو بڵاوکردنەوەی جوانی و لێبۆردەیی ئیسلام و دادپەروەری ئەحکامەکانی هەموو هەوڵێك بخەنەگەڕ و لە پێناو پاککردنەوەی ئیسلام لەوەی کە پێوەی لکاوە لە شیرك و بیدعە و خورافات هەموو تێکوشانێك بکەن و وەڵامی ڕکابەرانی بدەنەوە بە جۆرەها شێوازی ڕەوا و چەندەها بەڵگەی ڕەوان، تاوەکو شکۆداری پێشینانمان بە ئیسلام بۆ بگەڕێتەوە.

گومان لەوەدا نییە کە ئەمە ئەرکێکی ڕەهای هەموو موسڵمانانە، هەریەکە بە پێی ئەو توانایەی کە خودا پێی بەخشیوە کە بەهۆیەوە دەتوانێت ئەرکەکەی لە ڕێگای خودادا بێنێتەجێ بە سەرخستنی دینەکەی و بانگەشە

بۆ کردنی.

لە خودای پەروەردگار داواکارین کە ئەم توانایەمان پێ ببەخشێت و لە کاتێکی زوودا دڵەکانمان سازگار بکات لە هزری گومڕاو و کردەوەکانمان خاوێنبکات لە کاری گومڕاو، چاومان بە ئیسلامێکی صاف و سەرکەوتوو شاد بکات، تەنها خودا پەناگەی دوعاکارانە و وەڵامدەرەوەی داواکارانە.

** ٢٨ **

الوجه الثاني: أن الإسلام نهى عن دعوى الجاهلية و حذَّر منها، و أبدا في ذلك و أعاد في نصوص كثيرة، بل قد جاء النصوص تنهى عن جميع أخلاق الجاهلية، و أعمالهم إلا ما أقره الإسلام من ذلك.

ولا ريب أن الدعوة إلى القومية من أمر الجاهلية، لأنها دعوةٌ إلى غير الإسلام، و مناصرةٌ لغير الحق، وكم جرَّت الجاهلية على أهلها من ويلات و حروب طاحنة، وقودها النفوس و الأموالو الأعراض، و عاقبتها تمزيق الشمل و غرس العداوة والشحناء في القلوب، والتفريق بين القبائل والشعوب.

*ڕووی دووەمی پیلانگێڕی دژ بە ئیسلام و موسڵمانان بە هزری نەتەوەیی *

ـ هزری نەتەوەیی نەفامییە و دژی ئیسلامە ـ

ڕووی دووەم: ئیسلام نەهی لە بانگەشەی نەفامی کرد و (کە عەرەبەکان لەسەریبوون پێش ئیسلام لە ڕەگەزپەرستی بۆ قەبیلە و بەرەباب) مرۆڤایەتی لێئاگادارکردەوە کە بانگەشەیەکی ترسناکە، بەڵکو دەقەکانی شەریعەت هەموو ڕەفتار و گوفتاری سەردەمی نەفامی ڕەتدەکەنەوە، جگە لە چەند ڕەوشتێکی جوان کە ئیسلام پەسەندی کردن.

جێی گومان نییە کە بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی بانگەشەیە بۆ نەفامی(الجاهلية)، چونکە بانگەشەیە بۆ غەیری ئیمان و ئیسلام، سەرخستنە بۆ غەیری حەق و ڕاستی، هەروەها جێی گومان نییە ـ وەك مێژوو باس دەکات ـ





کە نەفامی (هزری نەتەوەیی) چ کاولکاری و شەڕانگێزی بەسەر خەڵکەکەی ناوە لە دەیان جەنگی خوێناوی کە سەر و ماڵ و ناموسی خەڵکی تیایاندا بەهەدەر ڕۆیشتووە، ئەنجامەکەشی بەش بەش بوون و نەمانی پێکەوەژیانی خەڵکان و ڕواندنی ڕق و کینەیە لە دڵاندا و هێنانەوەی دووبەرەکییە لە نێوان هۆز و گەلاندا.

** ٢٩ **

قال شيخ الإسلام: ابن تيمية رحمه الله: (كل ما خرج عن دعوى الإسلام والقرآن من نسب أو بلد أو جنس أو مذهب أو طريقة، فهو من عزاء الجاهلية.

بل «لما اختصم مهاجري وأنصاري، فقال المهاجري: يا للمهاجرين، وقال الأنصاري: يا للأنصار، قال النبـي صلى الله عليه وسلم: أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم! ، وغضب لذلك غضبا شديدا» ) انتهى.

*وتەیەکی زێڕینی (ئیبن تەیمیە) سەبارەت بە بانگەشە بۆ جگە لە قورئان و ئیسلام*

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە( ڕحمە اللە) فەرموویەتی: (هەر بانگەشەیەك لە بانگەشەی ئیسلام و قورئان دەرچێت بانگەشەیە بۆ نەفامی و جاهیلیەت، جا ئەم بانگەشەیە چ بانگەشەی نەسەب و بەرەباب بێت یان بانگەشەی ڕەگەز و نەتەوەبێت یان بانگەشەی مەزهەب و تەریقەت بێت...هتد.

گشتی بانگەشەیە بۆ نەفامی بێجگە لە بانگەشە بۆ ئیسلام و قورئان.

بەڵکو کاتێك کەسێکی موهاجیر و کەسێکی ئەنساری مشتومڕ کەوتە نێوانیان، موهاجیرەکە هاواری کرد: ئەی موهاجیرەکان بەهانامەوە وەرن، ئەنسارییەکە هاواری کرد: ئەی ئەنسارییەکان بەهانامەوە وەرن،

ومما ورد في ذلك من النصوص قوله تعالى: ﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ وقال تعالى: ﴿إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾ وفي سنن أبي داود، عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: «ليس منا من دعا إلى عصبية، وليس منا من قاتل على عصبية، وليس منا من مات على عصبية » وفي صحيح مسلم عن النبي صلى الله عليه وسلم أنه قال: «إن الله أوحى إلي أن تواضعوا حتى لا يبغي أحد على أحد ولا يفخر أحد على أحد » ولا ريب أن دعاة القومية يدعون إلى عصبية ويغضبون لعصبية ويقاتلون على عصبية، ولا ريب أيضا أن الدعوة إلى القومية تدعو إلى البغي والفخر" لأن القومية ليست دينا سماويا يمنع أهله من البغي والفخر، وإنما هي فكرة جاهلية تحمل أهلها على الفخر بها والتعصب لها على من نالها بشيء، وإن كانت هي الظالمة وغيرها المظلوم، فتأمل أيها القارئ ذلك يظهر لك وجه

**٣٠**

پێغەمبەر(صلى الله عليه و سلم) زۆر تۆڕەبوو، وەکو ئینکارکردنێك فەرمووی: ((هێشتان من لە ناوتانم و نەمردووم، ئێوە بانگەشە بۆ نەفامی دەکەن!؟)) ـ کۆتایی هات ـ.

*چەند دەقێکی شەرعی سەبارەت بە نەفامی و خراپەیی دەمارگیری*

لەو دەقە شەرعییانەی لەم بارەیەوە هاتوون:

* لەباسی نەهی کردن لە تەبەروجی نەفامی و دەرچوونی ئافرەت بە سەرکوتی پەروەردگار دەفەرمێت:﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ .

* لە باسی خراپەی دەمارگیری نەفامی بۆ هۆز و بەرەباب پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ﴾.

* لە باسی نەهی کردن لە بانگەشە بۆ دەمارگیری، پێغەمبەرمان(صلى الله عليه و سلم) دەفەرمێت: «ليس منا من دعا إلى عصبية، وليس منا من قاتل على عصبية، وليس منا من مات على عصبية»(رواه أبو داود).

* لە باسی نەهی کردن لە فەخر و شانازییەوە بەسەریەکدا، پێغەمبەر ( صلى الله عليه و سلم) دەفەرمێت: «إن الله أوحى إلي أن تواضعوا حتى لا يبغي أحد على أحد ولا

الحق.

ومن النصوص الواردة في ذلك ما رواه الترمذي وغيره، عن النبـي صلى الله عليه وسلم أنه قال: «إن الله قد أذهب عنكم عصبية الجاهلية وفخرها بالآباء، إنما هو مؤمن تقي أو فاجر شقي، الناس بنو آدم، وآدم خلق من تراب، ولا فضل لعربي على عجمي إلا بالتقوى» وهذا الحديث يوافق قوله تعالى: (١١\٢٩٠)﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾أوضح سبحانه بهذه الآية الكريمة أنه جعل الناس شعوبا وقبائل للتعارف لا للتفاخر والتعاظم، وجعل أكرمهم عنده هو أتقاهم.

وهكذا يدل الحديث المذكور على هذا المعنى ويرشد إلى سنة الجاهلية التكبر والتفاخر بالأسلاف والأحساب، والإسلام بخلاف ذلك، يدعو إلى التواضع والتقوى والتحاب في الله، وأن يكون المسلمون الصادقون من سائر أجناس بني آدم، جسدا واحدا، وبناء واحدا يشد بعضهم بعضا، ويألم بعضهم لبعض، كما في الحديث الصحيح، عن النبـي صلى الله عليه وسلم أنه قال: «المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا وشبك بين أصابعه» وقال صلى الله عليه وسلم: «مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالحمى والسهر» يفخر أحد على أحد »(رواه مسلم).

هیچ گومانی تێدا نییە بانگەشەکارانی هزری نەتەوەیی بانگەشە بۆ دەمارگیری دەکەن و لەبەر دەمارگیری تۆرە دەبن و لەسەر دەمارگیری شەڕ دەکەن، هەروەها بانگەشە بۆ هزری نەتەوەیی بانگەشەیە بۆ دەستدرێژی و فەخرکردن بەسەریەکدا، چونکە هزری نەتەوەیی ئایینێکی ئاسمانی نییە رێگری لە ئەهلەکەی بکات، لەوەی دەستدرێژی بۆ سەر بەرامبەرەکەی نەکات یان شانازی بە رەگەزەکەی نەکات، بەڵکو بیرۆکەیەکی نەفامییە وادەکات ئەهلەکەی شانازی پێوەبکەن و بۆی دەمارگیربن دژی هەر شتێك بوەستن کە رێگری لەم دەمارگیرییە بکات با شتەکە لایان حەق و دادپەروەریش بێت و خۆیان ناحەق و ستەمکاربن.

ئەی خوێنەری بەرێز، بیر لەم نەفامییە بکەرەوە لایەنی ڕاستیت بۆ دیاردەکەوێت.

لەو دەقانەی لەم بارەیەوە هاتوون:

* پێغەمبەرمان(صلى الله عليه و سلم) دەفەرمێت: «إن الله قد أذهب عنكم عصبية الجاهلية وفخرها بالآباء، إنما هو مؤمن تقي أو فاجر شقي، الناس بنو آدم، وآدم خلق من تراب، ولا فضل لعربي على عجمي إلا بالتقوى» (خودا) دەمارگیری نەفامی و شانازیکردن بە بەرەبابەکان لە ئێوەی دوور

خستووتەوە، خەڵكان تەنها دووكەسن: ئیمانداریكی لە خواترس و تەقوادار ، یان تاوانكاریكی لە خودانەترس و تومەتبار، خەڵكان نەوەی ئادەمن ، ئادەمیش لە خۆڵ دروستكراوە، كەسی عەرەب هیچ تایبەتمەندییەكی بەسەر كەسی عەجەمدا نییە، خەڵكان تەنها بە تەقواداری و لە خوداترسان بەرزدەبنەوە و لە یەكتر جودا دەكرێنەوە )(رواه الترمذي و غيره).

ئەم فەرموودەیەش هەمان مانای ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ دەدات، كە خودای پاك و بێگەرد لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕوونی كردووتەوە كە خەڵكی كردووتە گەل و هۆز بۆ یەكترناسین، نەك بۆ شانازی بەسەریەكداكردن و خۆ بەگەورەدانان، بەڕێزترینی ئەم خەڵكانە لای خودا كەسی خوداترس و تەقوادارە.

بە هەمان شێوە فەرموودەی پێشەوە ئاماژە بەم واتایە دەكات و ڕێنیشاندەرە كە ڕێگای نەفامی بریتییە لە خۆبەگەورەزانین و شانازیكردن بە حەسەب و نەسەب، ئیسلامیش پێچەوانەی ئەوەیە و بانگەشە دەكات بۆ بێفیزی و تەقواداری و یەكترخۆشویستن لەپێناو خودا دا، هاندەدات كە موسڵمانە ڕاستگۆكان لە هەموو ڕەگەزەكانی نەوەی ئادەم یەك جەستە بن و

**٣١**

فأنشدك بالله أيها القومي: هل قوميتك تدعو إلى هذه الأخلاق الفاضلة، من الرحمة للمسلمين من العرب والعجم، والعطف عليهم والتألم لآلامهم؟ لا والله، وإنما تدعو إلى موالاة من انخرط في سلكها، ونصب العداوة لمن تنكر لها، فتنبه أيها المسلم الراغب في النجاة، وانظر إلى حقائق الأمور بمرآة العدالة والتجرد من التعصب والهوى، حتى ترى الحقائق على ما هي عليه، أرشدني الله وإياك إلى أسباب النجاة.

هەست بە ئازاری یەکتر بکەن، هەروەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە:

* «المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا وشبك بين أصابعه» .

هەروەها لەم فەرمودەیەشداباسی ئەوە دەکات:

* «مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد الواحد إذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالحمى والسهر» واتە: نمونەی بڕواداران لەگەڵ یەکتر بە خۆشویستن و بەزەیی بەیەککردن وەکو نمونەی جەستەیەکە، کاتێك ئەندامێکی هەست بە ئازاردەکات گشت جەستەکە شەونخونی بۆ دەکات.

*نەتەوە شتێك نییە بانگەشە بۆ خۆشەویستی و چاکەکاری بکات لە نێوان کۆمەڵانی مرۆڤایەتی*

تۆ خودا ئەی هەڵگری هزری نەتەوەیی: ئایا نەتەوەکەت بانگەشە بۆ ئەم ڕەوشتە بەرزانە دەکات، لە بە بەزەیی بردن بە موسڵمانان لە عەرەب و عەجەم، بە سۆزبوون بۆیان و ئازارچەشتن بۆ ئازاریان؟ سوێند بە خودا نەخێر، بەڵکو بانگەشە بۆ پشتگیری و سەرخستنی ئەو کەسە دەکات کە لایەنگیری بیرۆکەی هزری نەتەوەییە و دوژمنداری لەگەڵ ئەوە دەکات کە نکۆڵی لە بیرۆکەی هزری نەتەوەیی دەکات، جا ئەی موسڵمانی ئارەزوومەند بۆ ڕزگاربوون، بە ئاوێنەی دادپەروەری و دوور لە دەمارگیری و

**٣٢**

ومن ذلك ما ثبت في الصحيح «أن غلاما من المهاجرين وغلاما من الأنصار تنازعا، فقال المهاجري: يا للمهاجرين وقال الأنصاري: يا للأنصار فسمع ذلك النبــي صلى الله عليه وسلم فقال: أبدعوى الجاهلية وأنا بين أظهركم!؟».

فإذا كان من انتسب إلى المهاجرين واستنصر بهم على إخوانهم في الدين، أو إلى الأنصار واستنصر بهم على إخوانهم في الدين يكون قد دعا بدعوى الجاهلية، مع كونهما اسمين محبوبين لله سبحانه، وقد أثنى الله على أهلهما (١\٢٩١) ثناء عظيما في قوله تعالى: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾ الآية، فكيف تكون حال من انتسب إلى القومية واستنصر بها وغضب لها؟ أفلا يكون أولى ثم أولى بأن يكون قد دعا بدعوى الجاهلية؟ لا شك أن هذا من أوضح الواضحات.

هەوا و ئارەزوو سەیری ڕاستی شتەکان بکە، هەتا ڕاستییەکان بەو شێوەیەی هەیە ببینی، خودای گەورە من و تۆش ڕێنمویی بکات بۆ هۆکارەکانی ڕزگاربوون.

*ناوی ڕاست ناوەڕۆکی ناڕاست ڕاستناکاتەوە*

بەڵگە لەسەر ئەوە لە(صحیحی بوخاری و موسلیم)دا هاتووە، کە گەنجێك لە موهاجیرەکان و گەنجێك لە ئەنساریەکان بووە مشتومڕیان، موهاجیرەکە گوتی: ئەی موهاجیرەکان بە هانامەوە وەرن، ئەنساریەکە گوتی: ئەی ئەنساریەکان بە هانامەوە وەرن، پێغەمبەر (صلی الله علیه و سلم) گوێبیستی ئەمە بوو، بە تۆڕەیی و سەرسامییەوە فەرمووی:((ئاوا زوو بانگەشەی نەفامی و جاهیلیەت دەکەن! پێش مردنم!؟)).

جا ئەوەی خۆی بداتە پاڵ موهاجیرەکان و داوای پشتگیری و سەرخستیان لێبکات بەسەر برایانیان لە ئاییندا، یان ئەنساربییەك داوای پشتگیری و سەرختنیان لێ بکات بەسەر برایانیان لە ئاییندا، ئەوە بانگەشەی جاهیلی کردووە، لەگەڵ ئەوەی هەر دوو ناوەکە (موهاجیر و ئەنسار) لای خودای گەورە خۆشەویستن، خودای گەورە ئەوپەڕی سەنایان دەکات لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿وَالسَّابِقُونَ الْأَوَّلُونَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالْأَنْصَارِ وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُمْ

بِإِحْسَانٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ﴾. جا ئەگەر بانگەشە بۆ ئەم دوو ناوە نەفامی بێت، ئەوا دەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت خۆی داوەتە پاڵ هزری نەتەوەیی و داوا و بانگەشەی سەرخستنی دەکات و لە سەری تۆڕە دەبێت؟ ئایا ئەمە لە پێشتر نییە کە بانگەشەی نەفامی و جاهیلیەتی کردبێت؟ ئەمە ڕوون وئاشکرایە و جێی گومان نییە.

**٣٣**

ومن ذلك ما ثبت في الحديث الصحيح عن الحارث الأشعري، أن النبـي صلى الله عليه وسلم قال: «إن الله أمر يحيى بن زكريا بخمس أن يعمل بهن ويأمر بني إسرائيل أن يعملوا بهن فذكرها، ثم قال النبـي صلى الله عليه وسلم: وأنا آمركم بخمس الله أمرني بهن: السمع والطاعة، والجهاد، والهجرة، والجماعة، فإنه من فارق الجماعة قيد شبر فقد خلع ربقة الإسلام من عنقه إلا أن يراجع، **ومن دعا بدعوى الجاهلية فهو من جثي جهنم**. قيل: يا رسول الله، وإن صلى وصام؟ قال: وإن صلى وصام وزعم أنه مسلم، فادعوا بدعوى الله الذي سماكم المسلمين المؤمنين عباد الله » وهذا الحديث الصحيح من أوضح الأحاديث وأبينها في إبطال الدعوة إلى

*کۆتایی هێنان بە وەرگێڕانی بابەتەکە بە پێنج وەسیەتی پێغەمبەرمان صلى الله عليه وسلم *

لە بەڵگەکانی ئەم مانایانەی باسکران فەرمودەیەکی صەحیح، کە حارثي ئەشعەری لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (خودا فەرمانی بە یەحیای کوڕی زەکریا کردووە بە پێنج وەسیەت کە کاریان پێبکات و فەرمان بە بەنی ئیسرائیل بکات کە کاریان پێبکەن ـ پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم باسیکردن لە پاشان ـ فەرمووی: منیش فەرمانی پێنج وەسیەتتان لێدەکەم کە خودا فەرمانی منی پێکردووە:

١ ـ گوێڕایەڵی ـ بۆ کاربەدەست بەمەرجێك فەرمانەکەی سەرپێچی خودای تیادا نەبێت ـ .

٢ ـ تێکۆشان (جهاد) ـ بۆ بەرزکردنی وشەی (لا إله إلا الله) ـ .



القومية، واعتبارها دعوة جاهلية، يستحق دعاتها أن يكونوا من جثي جهنم، وإن صاموا وصلوا، وزعموا أنهم مسلمون فيا له من وعيد شديد، وتحذير ينذر كل مسلم من الدعوات الجاهلية، والركون إلى معتنقيها، وإن زخرفوها بالمقالات السحرية، والخطب الرنانة الواسعة، التي لا أساس لها من الحقيقة، ولا شاهد لها من الواقع، وإنما هو التلبيس والخداع والتقليد الأعمى، الذي ينتهي بأهله إلى أسوأ العواقب، نسأل الله السلامة من ذلك.

٣ ـ كۆچكردن ـ كە بێدەسەڵات بی لە شوێنك نەتوانی دینی خۆت بەڕێوە ببەی و كۆچ بكەی بۆ شوێنێك بتوانی دینی خۆت بەڕێوە ببەی ـ

٤ ـ پابەند بوون بە كۆمەڵی موسڵمانان (الجماعة)، پشتكردن لەم كۆمەڵە پشتكردنە لە ئیسلام تا بۆی دەگەڕێتەوە. مەبەست لەم كۆمەڵەیە دینداری كردنە بەوەی كە صەحابە و تابیعین لەسەری بوون لە چاخە زێڕینەكانی ئیسلام .

٥ ـ ئەوەی بانگەشە بۆ هزری نەفامی بكات، ئەوا لە كۆمەڵی خەڵكی دۆزەخە. فەرمویان ئەی پێغەمبەری خودا ئەگەر نوێژ بكات و ڕۆژووش بگرێت؟

فەرمووی: بەڵێ ئەگەر نوێژ بكات و ڕۆژووش بگرێت و بشڵێت من موسڵمانم، جا بانگەشە تەنها بۆ پەیامی خودا بكەن، ئەو خودایەی ئێوەی بە موسڵمان و ئیماندار و بەندەی خودا ناو ناوە).

ئەم فەرموودە صەحیحە، لە ئاشكارترین و ڕوونترینی فەرموودەكانە كە بانگەشەی هزری نەتەوەیی پۆچەڵدەكات و بە بانگەشەی نەفامی دەیژمێرێت، كە بانگەشەكارانی موستەحەقی ئەوەن لە كۆمەڵی خەڵكانی دۆزەخ بن، ئەگەر ڕۆژوو بگرن و نوێژیش بكەن و بڵێن موسڵمانین. ئەمە چەند گەفێكی توند و گەورەیە كە هەموو موسڵمانێك لە بانگەشەی نەفامی





| ئاگادارده‌کاته‌وه، هه‌روه‌ها ئاگاداریان ده‌کاته‌وه که لایه‌نگری و مه‌یلداری سه‌ران و هه‌ڵگرانی ئه‌م بانگه‌شه‌یه نه‌که‌ن، هه‌رچه‌نده ئه‌م سه‌رانه به‌نووسین و وتاری سیحراوی بانگه‌شه‌که‌یان برازێننه‌وه، چونکه ئه‌م نووسین و وتارانه هیچ بناغه‌یه‌کی ڕاستیان نییه، واقیعیش شاهێدیان بۆ نادات، ته‌نها هه‌ڵخه‌ڵه‌تاندنی خه‌ڵك و لاسایکردنی کوێرانه‌یه، که هه‌ڵگرانی ڕاده‌کێشێت بۆ دواڕۆژێکی خراپ. خودا بمان پارێزێت. | |
|---|---|

## ڕوونکردنەوەیەك سەبارەت بە پەیامەکەی شێخ بن باز رحمە اللە :

**ئەگەر لە شوێنی ( هزری نەتەوەیی عەرەبی ) بنووسین ( هزری نەتەوەی کوردی ) ـ لە ناو ئەم دەقە وەرگێڕدراوەدا ـ ئەوا لە میزانی شەریعەتدا هەر هەمان حوکم و دەرئەنجام دەدات، ئەویش بێ بنەمایی ئەم هزرەیە کە هەرگیز نابێتە پێوەر بۆ چاکە و خراپەی مرۆڤ، چونکە پەیوەندی بە ئیختیاری مرۆڤەوە نییە کە ئەم ئیختیارەی بۆ خێر و شەڕ خاڵی ڕێزلێنانی خودای پەروەردگارە بۆ مرۆڤ:** ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾ (إسراء:٧٠)، **بەڵام کە دەڵێن هزری نەتەوەیی بێ بنەمایە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە نەتەوەکان دەوڵەت و ئیدارەی خۆیان هەبێت بۆ یەکتر ناسین و چاکە بەیەکترکردن:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ﴾ (الحجرات:١٣)، **بێگومان شێخی نووسەر ( ابن باز ) ـ ڕەحمەتی خودای لێ بێت ـ زیاتر لە چاریەك سەدە موفتی دەوڵەتی عەربستان بووە و ڕەخنەی نەبووە لە هەبوونی دەوڵەتێك بەناوی عەرەبستان بە پێی بارودۆخی سەردەم بۆ یەکتر ناسین، بەڵام هزری نەتەوەیی وەکو بەدیلێك بۆ ئیسلام کە لەسەری کۆببینیەوە لە ئەحکامی شەرع دوورەپەرێز بین ئەمە لە شەرع و عەقلدا قەبوول نییە، ئەمەیە بابەتی نامەکەی کە ئیکتیفامان بە وەرگێڕانی بەشێکی کرد .**

**( دەستەی زانستی گۆڤارەکە )**

# چەند بنەمایەکی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ( کات )
# لە ڕوانگەی ئیسلامەوە

**ـ هەولێك بۆ دامەزراندنی زانستی پەرەپێدانی مرۆڤی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ـ**

ئەم بابەتە هەولێکە بۆ دامەزراندنی زانستی پەرەپێدانی مرۆڤی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، بە کۆکردنەوە و نزیککردن و پولێنکردنی هەندێك لە بابەتە پەرشوبڵاوەکانی کتێبخانەی ئیسلامی سەروی هەموویانیش دەقە پیرۆزەکانی سەرچاوە ـ قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ـ چونکە (هەموو بوارێك لە زانست و هەموو جۆرێك لە حیکمەت و هەموو پلەیەك لە ئەدەب، پێویستیان بە نووسینی پۆلێنکراو هەیە، کە بابەتە وەکویەکەکان لەتەکیەك دابنێت، حیکمەتە پەرشوبڵاوەکان کۆبکاتەوە، شتە لە یەکچووەکانی ڕێزبەند بکات، ئەگەر شارەزایان پشتیان لەمەکرد و بەم ئەرکە هەڵنەسان، ئەوا بزربوونی حیکمەت و دامرکانی زانست و مردنی ئەدەبی لێدەکەوێتەوە) [(١)] ....

بێگومان زەحمەتیشە وشەیەك وەکو گوتنەکەی حەسەنی بەصری ببینینەوە کە دەستپێکی ئەم بابەتە بێت، ئەویش کاتێ ڕوو لە ڕەگەزی بەنی ئادەم دەکات و دەفەرمێت: (يا ابن آدم إنما أنت أيام، كلما ذهب يوم ذهب بعضك)[(٢)] واتە: ئەی بەنی ئادەم تۆ ژمارە ڕۆژێکی، هەرکە یەکێکیان ڕۆیشت بەشێکت ڕۆیشت!

---

(١) ينظر : رسائل جاحظ ص٢٤٢ط. المهنا.

(٢) الزهد للحسن البصري ص٨١.





**لێرەوە پرسیارێك دێتە پێشمان: چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەم ژمارە ڕۆژانە بكەین؟ كە بەردەوام ڕووە لوس و ناسكەكانی گەنجایەتیمان بە قازمەیەكی سپیی و خاكەناسێكی ڕەش هەڵدەكەنن، نە لەم كارە بێزاردەبن، نە پێدەكەنن؟ ناوەستن لە تێپەڕبوون و دەمان بەن بەرەو تیاچوون؟**

بێگومان تەنها چینێكی پێشكەوتووی مرۆڤایەتی بیر لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەكاتەوە لە هزردا بە چەند پرسیارێك لەوانە:

**چۆن خۆم لە زەمان ڕزگاربكەم، تاوەكو بەگەنجی بمێنم؟ یان چۆن مانایەك بۆ ئەم زەمانە ببینمەوە، تاوەكو لەگەڵی ئاسوودەبم؟**

نە پزیشكەكان وەڵامی پرسیاری یەكەمیان پێكرایە و نە حەكیمەكانیش وەڵامی پرسیاری دووەمیان پێكایە[1]! بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە بۆ لای پێغەمبەری ئیسلام محمد(صلى الله عليه وسلم) دەگەڕێینەوە بە تێڕوانینێك لە گوفتار و ڕەفتاری ئەم مرۆڤە مەزنە (صلى الله عليه وسلم) لە سەر چەند یاساو بنەمایەك دەوەستین، ناویان دەنێین: **بنەماكانی هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ كات لە ڕوانگەی ئیسلامەوە.**

---

(١) ألف مارسيل بروست بهذا الصدد روايته الشهيرة بعنوان (التخلص من الزمن) ولم يأت بما يروي الغليل.

## بنەمای یەکەم:

## هیوای ڕاستەقینەی ژیان لە دەرەوەی کاتی ئەم ژیانەیە

هیوا و داخوازییەکانی مرۆڤ لە ژیاندا ناکوتان! ئەمە سروشتی مرۆڤە تاوەکو بژیت لە ژیانێکی بەماندوبوون پڕ حەسرەتدا. تۆ بڵێیت: هیوایەك هەبێت لەم ژیانەدا ئەم ماندووبوون و حەسرەتانە بنبڕ بکات؟

پێغەمبەری ئیسلام (صلى الله عليه وسلم) لە باسی ئەم هیوایەدا تابلۆیەك دروستدەکات وەکو ڕێگایەکی ڕزگاربوون لەم ماندووبوون و حەسرەتی ژیان، تابلۆیەکەش تابلۆیەکی تەشکیلییە، جوان تێگەیشتنی مانای ژیان لەخۆدەگرێت، بەڵکو خۆی وەکو شانۆگەرییەك پیشاندەدات کە ئەکتەرەکانی{(مرۆڤ) و (ئەجەلی مرۆڤ) و (خوازراوەکانی مرۆڤ) و (هیوای مرۆڤ) }ن، با لەسەر دەق و شێوەی تابلۆیەکە بوەستین:

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ( رضي الله عنه) قَالَ:

((خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم خَطًّا مُرَبَّعًا وَخَطَّ فِى وَسَطِ الْخَطِّ خَطًّا وَخَطَّ خَارِجًا مِنَ الْخَطِّ خَطًّا وَحَوْلَ الَّذِى فِى الْوَسَطِ خُطُوطًا فَقَالَ « هَذَا ابْنُ آدَمَ وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ وَهَذَا الَّذِى فِى الْوَسَطِ الإِنْسَانُ وَهَذِهِ الْخُطُوطُ عُرُوضُهُ إِنْ نَجَا مِنْ هَذَا يَنْهَشُهُ هَذَا وَالْخَطُّ الْخَارِجُ الأَمَلُ »[(١)] .

واتە: پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئێمە هێڵێکی چوارگۆشەی کێشا، لەناوەڕاستی چوارگۆشەکەشدا هێڵێکی کێشا و لە دەرەوەی چوارگۆشەکەشدا هێڵێکی کێشا و لە دەوروبەری هێڵی ناو چوارگۆشەکەشدا چەند هێڵێکی کێشا و فەرمووی:

---

(١) أخرجه البخاري (٦٤١٧) و الترمذي(٢٤٥٤) و اللفظ له. قال المباركفوري في تحفة الأحوذي (٧\١٩٥): (خَطَّ لَنَا) أي للصحابة والظاهر: أنه كان بيده المباركة على الأرض و نقل عن الطيبيِّ أن المراد بالخط الرسم و الشكل و (عُرُوض) جمع عرض قال الحافظ في الفتح(١٤\٥٤): هو ما يُنتفع به في الدنيا في الخير و في الشر.

* هێڵی ناوەڕاستی چوارگۆشەکە مرۆڤە.

* چوارگۆشەکەی چواردەورەی مرۆڤەکەش  ئەجەلی مرۆڤە.

* ئەو هێڵانەی ناوچوارگۆشەکەن لە دەوری مرۆڤەکە خوازراوەکانی ژیانن، ئەگەر بەمەیان گەیشت ـ پاش ماندووبوون ـ ئەمەیان لە دەست دەچێت ـ دەبێتە حەسرەت ـ!

* هیوا پێنەگەیشتووەکەش لە دونیادا هێڵی دەرەوەی چوارگۆشەکەیە بۆ مرۆڤی موسڵمان، کە دوورکەوتنەوەیە لە دۆزەخ و گەیشتنە بە بەهەشت لە دەرگای ئەجەلەوە، بۆ مرۆڤی کافریش تێر نەبوونە لە دونیا و حەسرەتی گەیشتنە بە زیاتر، بەڵام ئەجەل ڕێی پێنادات.

**تابلۆیەکەش لەم شێوەیە نزیکە:**



ئیمامی بوخاری (رحمه الله) لە ژێر ناونیشانی: (باب في الأمل و طوله) فەرمودەکە بە دوو ئایەتی قورئانی پیرۆز و وتەیەکی زێڕینی ئیمامی علی (رضي الله عنه) شەرح دەکات[1]:

(١) ينظر: فتح الباري شرح صحيح البخاري(١١\٢٣٦ـ٢٣٩ الطبعة القديمة أو ١٤\٥٠٠ ـ ٥٠٤ طبعة دار طيبة)، وإرشاد الساري (١٣\٤٨٩ ط. دار الفكر).

ئایەتی یەکەم: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ﴾[1]. ئەم ئایەتە پیرۆزە باسی هیوای موسڵمانە کە لە دەرەوەی ژیانی دونیایە، کە دوورکەوتنەوەیەتی لە ئاگر و گەیشتنیەتی بە بەهەشت (**= هێڵی دەرەوەی چوارگۆشەکە**) و ئەوەی بەم مەبەستە دەگات براوەیە و ئەو کەسەیە کە بە پۆشاك و جوانی دونیا لە دەوروبەری خۆی( **= هێلە زۆرەکانی دەوری هێڵی ناو چوارگۆشەکە**) هەڵنەخەڵەتاوە.

ئایەتی دووەم: ﴿ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ﴾[2] ئەم ئایەتەش باسی هیوای مرۆڤی کافرە، کە مەبەستی ژیان بە خواردن و ڕابواردن و گەیشتن بە سەروەت و پلە و پایە تێدەگەن (**= هێلە زۆرەکانی دەوری هێڵی ناو چوارگۆشەکە**)، تا دەگەن بە سزاکەیان کە حەسرەتە لە دونیاو سوتانە لە قیامەت.

وتە زێرینەکەی ئیمامی علی(رضي الله عنه): (ارْتَحَلَتِ الدُّنْيَا مُدْبِرَةً، وَارْتَحَلَتِ الآخِرَةُ مُقْبِلَةً ، وَلِكُلٍّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا بَنُونَ، فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الآخِرَةِ، وَلاَ تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا ، فَإِنَّ الْيَوْمَ عَمَلٌ وَلاَ حِسَابَ، وَغَدًا حِسَابٌ وَلاَ عَمَلَ)[3] واتە: دونیا بۆ کاروانی ڕۆیشتنی بێگەڕانەوە بەڕێکەوتووە، قیامەتیش بەرەو ڕوومان دێت لە کاروانێکی دیکەدا کە ناگەڕێتەوە (**چوارگۆشەکەی ئەجەل**) خەڵکینە لە کوڕانی قیامەت بن نەك

---

(١) آل عمران:١٨٥.(ئەوەی لە ئاگر دوورخرایەوە و خرایە بەهەشت ئەوا براوەیە، ژیانی دونیاش تەنها ڕابواردنێکی هەڵخەڵەتێنەرە).

(٢) الحجر:٣. (ـ ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) ـ لێیان گەڕێ با بیخون و ڕابوێرن و هیوا و ئاواتی دونیا سەرگەرم و بێئاگایان بکات، سەرەئەنجام خۆیان دەبینەوە چیان بەسەر دێت).

(٣) عزاه الحافظ في الفتح (١٤\٥٠١ ـ ٥٠٢) إلى ابن أبي شيبة في المصنف(١٦٣٤٢) و ابن مبارك في الزهد (ص٨٦ رقم:٢٥٥) و غيرهما و بيَّن أن الأثر لا يصح مرفوعاً و إنما يصح موقوفاً فقط.

دونیا، بۆ ئەم مەبەستەش کاربکەن، چونکە دونیا ڕۆژگاری کارە بێ لێپرسینەوەی و قیامەتیش تەنها ڕۆژگاری لێپرسینەوەیە.

لەمەی باسکرا بۆمان دەردەکەوێت، کە گەورەترین بنەمای هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ **کات** زانینی مەبەستەکانی ژیانمانە لەم ڕۆژگارەدا، ئەگەر مەبەستەکە گەیشتنبێت بە ڕازیبوونی خودا لە هەموو کاروکردەوەیەکمان لە ناو ئەم ڕۆژگارەدا، ئەوا ڕێگای ڕاستی بەختەوەریمان هەڵبژاردووە و (٢٤)ساتەکەی ژیانمان بونەتە یەکخوداپەرستی ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾[١] کە ڕێگای ڕاستی بەختەوەری و بەختەوەرانە: ﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ﴾، نیشانەکەی ئاسوودەیی دڵە بە خودا: ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾[٢].

ئەگەر مەبەستیش لەکار و کردەوەکانی ڕۆژگاری ژیان تەنها زیاتر ڕابواردن بێت بە خواردن و خواردنەوە و ڤێلاو پلەو پایەی دونیا، زیاتر کوکردنەوەی دونیابێت لە پێناو دونیا، لەگەڵ غەفلەت لەخودا و سزاو پاداشتەکەی، ئەوا لەسەر ڕێچکەیەکی بێحەسانەوەین کە هەرمانایەکی هەبێت لە بازنەی شەیتانپەرستی دەرناچێت ﴿يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴾[٣] و هەر هەڵسوکەوتێکمان هەبێت تەنها هەڵبژاردن دەبێت بۆ تۆڕەیی ئەو خالقەی کە ئێمەی خەلقکردووە:﴿ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ﴾، هەر هزرێکیشمان هەبێت تەنها نزیکبوون دەبێت لە گومڕایی و﴿ٱلضَّآلِّينَ﴾،

---

(١) الذاريات : ٥٦.

(٢) الرعد:٢٨.

(٣) مريم: ٤٤ .

نیشانەی ئەم مەبەستەش تەنها حەسرەت و دڵ تەنگییە: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴾[1].

❊❊❊❊

دووبارە دەڵێین ئەم بنەمایەی تێگەیشتنی ماناکانی (**کات**) کە: **(جیاوازیکردنی مرۆڤە ـ هێلی ناوەوەی چوارگۆشەی ئەجەل ـ لە نێوان: هیوای ڕاستەقینە کە هێلی دەرەوەی چوارگۆشەی ئەجەلە لەگەڵ هیوا ناڕاستەقینەکان کە هێلە زۆرەکانی دەوری مرۆڤن لەناو چوارگۆشەی ئەجەلدا)**، خاڵی یەکەمی هەڵسوکەوتکردنی مرۆڤی موسڵمانە لەگەڵ شەو و ڕۆژی ژیانی خۆی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خالق و مەخلوق لەم ژیانەدا. وەڵامی ئەو پرسیارەیە کە دەڵێت: بۆچی خودا ئێمەو ئەم بونەوەرەی خەلقکردووە؟ کە خەڵکانێکی زۆر بەدوایدا دەگەڕێن بەڵام حەزناکەن ئیسلام وەڵامیانبداتەوە!

**پرسیار لە ئەنیشتاین کرا: ئەگەر ڕێکەوت و دەرفەتتپێیدرا تەنها یەك پرسیار لە خالق بکەی چ دەپرسی؟**

**وتی لێی دەپرسم: (دروستبوونی گەردوون چۆن دەستپێکراوە؟ چونکە پاش دروستبوونی هەموو شتێکی لە ژێر ڕکێفی یاساکانی بیرکارییە). بەڵام لە پاش وەستانێکی بیرکردنەوە ڕای خۆی گۆڕی وتی: نەخێر پرسیارێکی دیکەی لێدەکەم: (بۆچی گەردوون دروستکراوە؟ چونکە بە وەڵامەکەی خالق بۆ ئەم پرسیارە مانای ژیانی خۆم دەزانم).**

**(العادة الثامنة لستيڤن كوڤي ص١١٤)**

---

(١) طه: ١٢٤.

## بنەمای دووەم:

## یەکەم چالاکی لەگەڵ کات: بتەکان بشکێنە بۆ داگیرساندنی مەشخەلی دڵ

ئەمە یەکەم چالاکی مرۆڤە لەگەڵ کات، کە گۆڕەپانەکەی دڵی مرۆڤە، چالاکیەکەش داگیرساندنی مەشخەلی ئیمانە لە دڵدا بۆ ڕووناککردنەوەی ژیان. ئەویش بە شکاندنی بتەکان هەروەك پێغەمبەرمان محمد (صلى الله عليه وسلم) لە سەرەتای بانگەوازەکەیدا دەیفەرموو: (خودا منی ناردووە بۆ شکاندنی بتەکان)(بَعَثَنِي اللهُ بِكسرِ الأوْثَان)[1]، بەڵام جێی تێبینی لە ژیاننامەی ئەم پێغەمبەرەدا(صلى الله عليه وسلم) ئەوەیە کە یەکەم جار هەوڵی نەدا بۆ شکاندنی بتە پەیکەرەکانی دەوری کەعبەی پیرۆز لە مەککە و جەزیرەی عەرەبی، بەڵکو تێکۆشانەکەی دژی ئەو بتەنادیارانە بوو کەلە دڵی قورەیشییەکانی مەکدابوون کە بتەپەیکەرەکان تەنها ڕووی دیاری ئەم بتە نادیارانە بوون...

لەبەر ئەمەش لە قوناغێکی درەنگی بانگەوازەکەی بتە پەیکەرەکانی شکاند لە فەتحی مەککەدا ساڵی(٨ك)[2] پاش نزیکەی بیست ساڵ بانگەواز لە سەر شکاندنی ئەو بتانە کە لە ناو دڵی خەڵکی مەککە و عەرەبەکانی جەزیرەدابوون، لە ماناکانی شیرك و هاوبەشیدانان بۆ خودای پەروەردگار.

کەواتە یەکەم چالاکی لەگەڵ کات شکاندنی بتەکانی ناو مزگەوتەکانی دڵە لە پێناو ڕووناکردنەوەی دڵ بە داگیرساندنی مەشخەلی دڵ کە مەشخەلی یەکخودا پەرستییە و

---

(١) ينظر: مسند أحمد (٢٣٢\٢٨ ، ٢٣٧ ط. المؤسسة) .

(٢) ينظر: رحيق المختوم ص٣٤٣ (فصل: الرسول صلى الله عليه وسلم يدخل المسجد الحرام ويطهره من الأصنام)

ڕووناکیەکەی لە پەیامی ئاسمانەوە وەردەگرێت کە ئەم پەیامەش بە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کۆتایی هاتووە:

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ **نُورٗا** مُّبِينٗا ١٧٤﴾[١]

* ﴿قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ **نُورٗا وَهُدٗى** لِّلنَّاسِۖ﴾[٢]

* ﴿وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ **هُدٗى وَنُورٞ**﴾[٣]

* ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ٤٥ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ **وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا**﴾[٤]

هیچ پەیامێکی دیکەش نییە بتەکانی ناو دڵ بڕۆخێنێت و مەشخەڵی دڵ داگیرسێنێت، هەرچەندە خەڵکانێك بە بەردەوام بانگەشە بۆ چەندین پەیامی دیکە دەکەن بەناوی جیاجیا، بەڵام ئەم پەیامە دەستکردانە کارانین بۆ ڕووناککردنی دڵان و ئاسوودەکردنی ژیان و ڕۆخاندنی بتەکان، پەروەردگار لە باسی ئەمانەدا دەفەرمێت:

* ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ٢٠﴾[٥]

واتە: (ئەی ئێوە نابینن کە خودا ئەوەی ناو زەوی و ئاسمانانە بۆ ئێوەی موسەخەرکردووە و نیعمەتەکانی خۆی بە سەرئێوەدا باراندووە لە نیعمەتە دیارە ماددییەکانی جەستە و

---

(١) النساء: ١٧٤.

(٢) الأنعام: ٩١.

(٣) المائدة: ٤٦.

(٤) الأحزاب: ٤٥ ـ ٤٦.

(٥) لقمان : ٢٠.

نادیارە ڕوحییەکانی دڵان، سەرەڕای ئەمەش خەڵکانێك پشت لەپەیامە ڕووناکەکەی دەکەن و بە بێ هیچ بەڵگەیەکی زانستی و ڕێنماییەکی ئاسمانی مشتومڕ و گفتوگۆی نابەجێ دەربارەی خودا و بەرنامەکەی دەکەن).

ئەمانە کارگەی بت دروستکردنن لە دڵاندا و هیچ کات توانای ڕووناککردنەوەی دڵانیان نییە، بەڵکو تاکە پەیامی ڕووناککردنەوەی دڵان پەیامی ئاسمانە کە بە شکاندنی بتەکان و ڕۆخاندنی پەرستگاکانیان لە دڵاندا مەشخەڵی دڵ دادەگیرسێنن.

**بتەکانی ناو دڵیش  بە پێی ئەم پەیامە تەنها سێ بتن کە ئەمانەن:**

١ ـ (من = أنا)ی ئیبلیس: ﴿أَنَاْ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ١٢﴾ [١]

٢ ـ (هی منه = لی)ی فیرعەون: ﴿وَنَادَىٰ فِرۡعَوۡنُ فِي قَوۡمِهِۦ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٥١﴾ [٢]

٣ ـ (لای منه = عندی)ی قاروون : ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾ [٣] .

**پەرستگاکانی شیرکیش کە ئەم بتانەی لە ناوە تەنها سێ پەرستگان کە ئەمانەن** [٤] :

---

(١) الأعراف: ١٢ ، سورة ص٧٦.

(٢) الزخرف: ٥١ .

(٣) القصص: ٧٨ .

* (ابن قیم ـ رحمه الله ـ)  موسڵمان لەم سێ بتە ئاگاداردەکاتەوە و دەفەرمێت:

((وليحذر كُلَّ الحذر من طغيان (أنا)، و(لی)، و(عندی)، فإن هذه الألفاظَ الثلاثةَ ابتُلی بها إبليسُ، وفرعون، وقارون: فـ﴿أَنَاْ خَيۡرٞ مِّنۡهُ﴾  لإبليس، و ﴿ أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ ﴾ لـفرعون، و ﴿إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ﴾لِقارون)) (زاد المعاد ٢\٤٦٥ ط. مؤسسة الرسالة).

(٤) ذكر شيخ الإسلام ابن تيمية في كتابه (العبودية ط. دار ابن حزم ت: علي حسن  ص٦٧) حديث : (الشرك في هذه الأمة أخفى من دبيب النمل) ثم شرحها من ثلاثة أوجه وهي:

* عبادة المال و جمعه ص٦٧ ـ ٧٦ .

* عبادة النسوان و الصور ص٧٦ ـ ٨٠ .

١ ـ پەرستگای خۆزگەی مەنصب و حەزی شوهرەت، کە قوتابیانی بکوژ و ستەمکارانن، بەناوی دەسەڵاتداری وسیاسەتمەداری .

٢ ـ پەرستگای حەزی کۆکردنەوەی ماڵی دونیا، کە قوتابیانی کەسی خۆپەرست و بەخیلن بەناوی پەرەپێدانی سەرمایەداری و ئابووری زانی.

٣ ـ پەرستگای شەهەواتی حەرام و دەموچاوی جوانی ئافرەت، کە قوتابییانی بانگخوازی داوێن پیس و بێ خێزانین بە ناوی سەربەستی ئافرەت و مافی مرۆڤ.

هەرکاتێك مرۆڤ بە دەستگرتن بە پەیامی ئاسمانەوە توانی ئەم بتانە بشکێنێت و ئەم پەرستگایانە بڕوخێنێت، ئەوا ئەوکات و تەنها ئەو کات مەشخەلی دڵی دادەگیرسێت چەندین بلێسە دەدات کە ڕێگای کاروانی ژیانی بەختەوەری ڕووناکدەکەنەوە بۆ :

باشترین ڕەفتار (أحسن العمل):

* ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًاۗ﴾[1]

* ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾[2]

* ﴿إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًا ۝٧﴾[3]

و باشترین گوفتار(أحسن القول):

* ﴿وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُواْ ٱلَّتِى هِىَ أَحۡسَنُۚ﴾[4] .

* ﴿ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓۚ﴾[1] .

---

* عبادة المنصب و الرئاسة ص٨٠ ـ ٨٤.

فأجاد و أفاد.

(١) هود : ٧ .

(٢) الملك: ٢ .

(٣) كهف: ٧ .

(٤) إسراء: ٥٣.

* ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾[٢] .

ئەوكات (٢٤) کاتژمێری ژیان دەبنە خوداپەرستی و زەوی گشتی دەبێتە مزگەوت باشترین نمونەی ئەمەش یوسف (علیه السلام)کە وشەکانی: {(أنا =من) و (لي= هی من) و ( عندي = لای من)} وەکو مەشخەڵێکی ڕووناکی بەکارهێنا بۆ لادانی تاریکستانی بتەکانی {(أنا =من)ی ئیبلیس و (لي= هی من)ی فیرعەون و ( عندي = لای من)ی قاروون} .

چۆن ئەمانە (ئیبلیس، فیرعەون، قاروون) خۆپەرستیان بە (أنا، لي ، عندي )کردووە خەڵکیان پێ چەوساندووتەوە، یوسف ـ علیه السلام ـ خوداپەرستیان پێکردووە و خەڵکێکی لە تەنگانە ڕزگارکردووە:

* بلێسەی(أنا=من)ی یوسف ـ علیه السلام ـ﴿أَلَا تَرَوْنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلْكَيْلَ وَأَنَا۠ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ﴾[٣] دژی تاریکستانی بتی(أنا = من)ی ئیبلیس ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ﴾[٤] .

* بلێسەی(ي = لي = هی من)ی یوسف ـ علیه السلام ـ ﴿۞ رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ﴾[٥] دژی تاریکستانی بتی (لي = هی من)ی فیرعەون ﴿أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ﴾[٦].

* بلێسەی(عندي= لای منە)ی یوسف ـ علیه السلام ـ ﴿فَإِن لَّمْ تَأْتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيْلَ لَكُمْ عِندِي وَلَا تَقْرَبُونِ﴾[٧] دژی تاریکستانی بتی(عندي = لای من)ی قاروون ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ﴾[١].

---

(١) الزمر: ١٨.

(٢) فصلت : ٣٣.

(٣) يوسف: ٥٩. هذا في الكرم و في صلة الرحم ﴿إني أنا أخوك﴾ وفي العهود و المواثيق ﴿أنا به زعيم﴾...

(٤) الأعراف: ١٢ ، سورة ص٧٦.

(٥) يوسف: ١٠١ .

(٦) الزخرف: ٥١ .

(٧) يوسف: ٦٠ .

و كاتیَ مەشخەلی خوداپەرستی لە دلّدا بەم بلیَسانەی ڕووناكی هەلّدەگیرسیَت و بتەكان دەشكیَنریَن، ئەوكات كاروانی خەباتی خوداپەرستی دەست پیَدەكات لە گشت سنورەكانی ژیان، ئەم سنورانەش لە بنەمای سیَیەمدا ـ بە پشت بەستن بە خودا ـ باسیان دەكەین، بەلاّم پیَش باسكردنیان بیر لەم هیَلّكارییە بكەرەوە كە پیَشتر لە باسیَكی تیَر و تەسەلی چاكسازیدا ـ سەبارەت بە یوسف علیه السلام ـ لە ژمارە دووی گۆڤاریی ئەیوبی بلاّوكراوەتەوە[٢]، بزانە كە **خودای پەروەردگار مەدحی خوداپەرستی یوسف علیه السلام بە زۆری نویَژ و ڕۆژوو ناكات، بەلّكو بە جوانی بەڕیَوەبردنی داهاتی دەولّەت مەدحی دەكات** كاتیَك بە دلّیَكی ڕووناكەوە خوداپەرستی بە(أنا و لي و عندي) دەكات نەك خۆپەرستی:




---

(١) القصص: ٧٨ .

(٢) بروانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە (٢) لاپەڕە ٦٣.

## بنەمای سێیەم:

## سنورەکانی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کات

## بنەمای: (٥ x ٥)

ئەم بنەمایەی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کات بە بنەمای (٥ X ٥) وەسف دەکەین، چونکە دوو باڵی هەیە هەریەکەیان پێنج بەشە کە گشت چرکەکانی سنوری (٢٤) سەعاتی شەو و ڕۆژمان دادەپۆشن:

باڵی یەکەم: پاراستنی ئەرکانەکانی ئیسلام :

**١ ـ وشەی یەکخوداپەرستی بەمانا قولەکانی لەگەڵ هەموو هەناسەیەك .**

**٢ ـ پێنج نوێژ لە کاتی دیاریکراوی شەو و ڕۆژدا.**

**٣ ـ زەکاتی ساڵانە.**

**٤ ـ ڕۆژووی ڕەمەزان ساڵانە.**

**٥ ـ حەج لە تەمەن یەك جار.**

ئەمانە بنچینەکانی ئیسلامن کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: «بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسَةٍ عَلَى أَنْ يُوَحَّدَ اللَّهُ وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَصِيَامِ رَمَضَانَ وَالْحَجِّ»[١]، کاتێك پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) ئامۆژگاری دەشتەکییەك بەمانە دەکات پێی دەفەرمێت: واجبەکان ئەمانەن، ئەگەر بتەوێ سوننەتەکانیش بکە؟ دەشتەکیەکە لە وەڵامیدا سوێند دەخوات کە لەمانە زیاتر ناکات: (**وَاللَّهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى**

(١) متفقٌ عليه و اللفظ لمسلم.

**هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ)** ، پێغەمبەرمانیش (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا بە هەڤاڵانی دەفەرمێت ئەگەر ڕاست بکات ڕزگاری دەبێت: «أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ»(١) .

ئەم پێنج خاڵەی باسکران، زانایانمان بۆ ئەوە دەچن کە ئەمانە تەکالیف و بار قورسی نین بۆ موسڵمان بەڵکو خۆراکی ڕۆحی(٢٤)سەعاتی شەو و ڕۆژی موسڵمانن، کە بەهۆیانەوە هەناسەی ئاسوودەیی هەڵدەمژێت لە ناو سەختترین ڕووداوەکانی ژیاندا(٢) .

بە تایبەت نوێژ کە لە بارەسەختەکانی ماندووبوونی ژیانی پێغەمبەرماندا(صلى الله عليه وسلم) بە (بلال ـ رضي الله عنه ـ )ی دەفەرموو: بیلال قامەت بکە با بە نوێژکردن بحەسێینەوە «يَا بِلاَلُ أَقِمِ الصَّلاَةَ أَرِحْنَا بِهَا»(٣).

---

(١) عَن طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ قال: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ، ثَائِرُ الرَّأْسِ ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ ، وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ حَتَّى دَنَا ، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِى الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ » . فَقَالَ هَلْ عَلَىَّ غَيْرُهَا قَالَ « لاَ ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ » . قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « وَصِيَامُ رَمَضَانَ » . قَالَ هَلْ عَلَىَّ غَيْرُهُ قَالَ « لاَ ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ » . قَالَ وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم الزَّكَاةَ . قَالَ هَلْ عَلَىَّ غَيْرُهَا قَالَ « لاَ ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ » . قَالَ فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ وَاللَّهِ لاَ أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أَنْقُصُ . قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ » .

(٢) ينظر: مدارج السالكين(١\١١٢) و شفاء العليل(١\٢٢٦).

(٣) أخرجه أبوداود(٤٩٨٧ مكنز). و نقل ابن القيم عن شيخه ابن تيمية قال: (**إذا لم تجد للعمل حلاوة في قلبك و انشراحاً فاتَّهمه فإن الربَّ تعالى شكور**) قال ابن القيم معقباً عليه: (**يعني إنه لابد أن يثيب العامل على عمله في الدنيا من حلاوة يجدها في قلبه و قوة إنشراحٍ و قرة عين، فحيث لم يجد ذلك فعمله مدخول**) مدارج السالكين (منزلة المراقبة). و قد جمع الشيخ عادل عبدالشكور الزرقي كتاباً من كلام ابن القيم بعنوان (ذوق الصلاة) فأجاد و أفاد.

بالّی دووەم: پاراستنی  پێنج زەروراتی ژیان[١]

**١ ـ پاراستنی ئاین.**

**٢ ـ پاراستنی سەر.**

**٣ ـ پاراستنی شەرەف.**

**٤ ـ پاراستنی عەقل.**

**٥ ـ پاراستنی مالّ.**

ئەحکامەکانی شەرعی لەسەر ئەم پێنج خالّە بنیات نراون، بۆیە هەروەك چۆن مرۆڤی موسڵمان پابەندە بە ئەرکانەکانی ئیسلام لە (٢٤) سەعاتەکەی شەو و ڕۆژدا بە هەمان شێوە پابەندە بە پاراستنی ئەم زەروراتانە، وەکو:

* دوورکەوتنەوە لە کار و گوفتاری شیرك بۆ ئەوەی ئاینەکەی پارێزراوبێت. بۆ ئەم مەبەستەش لە شەرعدا سزای کوشتن بۆ مورتەد دانراوە و جیهاد و بانگەواز بۆ یەکخوداپەرستی فەرزکراوە.

* دوورکەوتنەوە لە تاوانی کوشتن و خۆکوژی تاوەکو سەر پارێزراوبێت. بۆ ئەم مەبەستەش لە شەرعدا قیصاص و حیرابە[٢] بۆ بکوژ و ڕێگرەکان دانراوە، هەر لەم ڕوویەوە جیهادی بەرگری فەرزکراوە [٣] .

---

(١) قال الشاطبي في الموافقات(١\٣١ ط مشهور حسن): اتفقت الأمة بل سائر الملل على أن الشريعة وضعت للمحافظة على الضروريات الخمس وهي : (الدين، والنفس، و المال و العقل) و علمها عند الأمة كالضروري) و ينظر: الموافقات(٦\٥٣٦ ـ ٥٣٧ الفهرس ط. الحسين أيت سعيد).

(٢) ينظر: الموسوعة الفقهية الكويتية مادة(قصاص) و مادة (حراب).

(٣) بروانە: بلاوبونەوەی ئیسلام بە شمشێر لە نێوان دەقی شەرعی و تۆماری مێژوویدا ل٩ ـ٢٦ .

❊ دوورکەوتنەوە لە هۆکارەکانی فاحیشە بەتایبەت ڕاگەیاندنە خراپکارەکان، تاوەکو شەرەفی پارێزراوبێت. بۆ ئەم مەبەستەش لە شەرعدا سزای جەلد یان ڕەجم بۆ خراپەکار دانراوە و هانی زوو ژن هێنان و زۆر ژنهێنان(التعدد)[(١)] و بە شودانی کچان دراوە.

❊ دوورکەوتنەوە لە مادە بێهوشکەرەکان و سەرخۆشکەرەکان تاوەکو عەقل پارێزراو بێت. بۆ ئەم مەبەستەش سزای تایبەت بۆ مەیخۆر دانراوە، فەرمانکراوە بە بیرکردنەوە لە ئایەتە شەرعییەکانی قورئان و کەونییەکانی گەردوون.

❊ دوورکەوتنەوە لە ڕیبا و قومار و دزیکردن، تاوەکو ماڵ و سەروەت پارێزراوبێت. بۆ ئەم مەبەستەش لە شەرعدا سزای دەستبڕین بۆ دز دانراوە. هانی کاسبکاری و وەبەرهەم هێنان دراوە.

سزاکانی شەرعیش بۆ دادگا دەگەڕێنەوە کە ئەحکامەکانی لە قوناغی مەدینە دابەزیون، خۆپارێزیش لەم تاوانانە لە کۆمەڵگای موسڵماناندا بۆ ئیمان بە سزا و پاداشتی خودا دەگەڕێتەوە لە ڕۆژی دوایدا، کە بونیاتنانی بیروباوەڕە لە یەکەم دابەزینەکانی قورئانەوە تاوەکو دوائایەت: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ﴾[(٢)] و پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) موسڵمانانی لەسەر ئەم بیروباوەڕە پەروەردە کردووە.

**جێ شاهێد** بۆ بابەتەکەمان لەوەی باسکرا ئەوەیە کە بنەمای (٥ X ٥) واتە: پێنج خاڵەکەی ئەرکان و پێنج خاڵەکەی زەروریات، مرۆڤ لێیان بەرپرسیارە لەگشت (٢٤)

(١) ينظر: تعدد الزوجات هل هو واجب شرعي أم ضرورة إجتماعية تأليف: عثمان محمد ناعورة ط. دار النوادر

(٢) البقرة:٢٨١. بەمەزندەی هەندێك لە زانایان ئەمە دووا ئایەتە لە قورئانی پیرۆز دابەزیبێت.

سەعاتەکانی شەو و ڕۆژیدا، ئەمانە سنوری (کات)ن نابێت ببەزێنرێن، بەزاندنیان بە پێی تاوانەکە دابەزینە:

**❋ لە ئیمانەوە بۆ کوفر.**

**❋ لە تەقوادارییە وە بۆ فسق .**

و جیاوازی دابەزینی موسڵمان (لە ئیمانەوە بۆ کوفر) لەگەڵ دابەزینی (لە تەقوادارییەوە بۆ فسق) خاڵێکی جیاکاری نێوان ئیسلام و هزری تەکفیریی خەوارجە، هەروەها خاڵێکی جیاکاری نێوان ئیسلام و هزری مورجیئەیە.

جیاکاریەکەش لەوەدایە کە:

یەکەم: هەرکات موسڵمان کە خاوەن خاڵی یەکەمە لە هەردوو باڵەکە، بەڵام پێنج زەروراتەکەی نەپاراست، ئەوا لە تەقوادارییەوە شۆڕبووتەوە بۆ فسق، بەڵام هەر لەناو ئیسلامدا دەمێنێتەوە و شۆڕنابێتەوە بۆ ناو بازنەی کوفر و دەرچوون لە ئیسلام.

بە پێچەوانەی هزری تەکفیری خەوارج کە بە ئەنجامدانی تاوان موسڵمان لەبازنەی ئیسلام دەردەخەن بۆ بازنەی کوفر.

دووەم: هەرکات موسڵمان کە خاوەن خاڵی یەکەمە (گوتنی شەهادە و پاراستنی دین) لە هەردوو باڵەکە، چوار ئەرکانە کردارییەکەی(الأركان العملية) بە جێهێشتن و نەی پاراستن، ئەوا لە ئیمانەوە شۆڕبووتەوە بۆ کوفر و لە بازنەی ئیسلام دەرچووە و ڕاست ناکات لە ئیدیعای شەهادە، چونکە ئەرکانە عەمەلیەکان شاهێدی بۆ نادەن. بە پێچەوانەی هزری مورجیئەکان کە لایان عەمەل پەیوەندی بە ئیمانەوە نییە!

❋❋❋

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کارکردن بە بنەمای یەکەمی (**کات**) هاتنە بۆ ناو بازنەی ئیسلام و زانینی مەبەستی ژیانە کە ڕازیبوونی خودایە. هەروەها بۆمان دەردەکەوێت کە کارکردن بە بنەمای دووەمی (**کات**) هەنگاوی کارای یەکەمی ژیانە، کە شکاندنی بتەکانە لە دڵدا و هەڵگێرساندنی مەشخەڵی یەکخوداپەرستییە. بنەمای سێیەمیش دیارخستن و پاراستنی سنورەکانی ئەم کارەیە، ئەم پاراستنەش مانەوەیە لە بازنەی ئیسلامدا بە پاراستنی ئەرکانەکانی ئیسلام و مانەوەیە لە بازنەی سوننەدا بە خۆپارێزی لە تاوان و شوێنکەوتنی ڕێچکەکان. بنەمای چوارەمیش باسی کاتی درێژی دووبارە خۆ دامەزراندنەوە دەکات بە بێژینگکردنی ڕابردوو پێش خۆئامادەکردنێکی خاوێن و بوێرانە بۆ داهاتوویەکی گەشاوە.

قال ابن القيم رحمه الله في كتابه(الفوائد):

((إِضَاعَة الْوَقْت أَشد من الْمَوْت لِأَن إِضَاعَة الْوَقْت تقطعك عَن الله وَالدَّار الْآخِرَة وَالْمَوْت يقطعك عَن الدُّنْيَا وَأَهْلهَا ))

## بنەمای چوارەم:

## بلوێرژەن و بڕیاردان یان دیواری سەر بەفر

### ـ بێژینگکردنی ڕابردوو، پێش دامەزراندنی داهاتوو ـ

لە بەسەرهاتەکانی فلکلوری کوردیمان: بلوێرژەنێك دەچێتە گوندێك، بە گوندەکە دەفەرمێت هاتووم فێری بلوێرژەنینتان بکەم تەنها بە یەك دینار بۆ هەرکەس، ئەوانیش کارەکەیان پێباشە و نرخەکەشیان پێ گونجاوە، یەکێکیان نەبێت، بە بلوێرژەنەکە دەفەرمێت: ماموستا پێویستە تەنها نیو دینار لە من وەربگری، چونکە من هەندێك لە بلوێرژەنی دەزانم...؟ بەلاَم ماموستا بلوێرژەنەکە پێی دەلێت: ئەگەر هەندێك لە بلوێرژەنی دەزانی، ئەوا دوو دینارت لێوەردەگرم، دینارێك بۆ لادانی ئەوەی دەزانی و دینارێکیش بۆ فێرکردن لە سفرەوە وەکو هەرکەسێکی گوندەکە! .

سەبارەت بەمەوە دونیادیدە و خاوەن تەجروبەیەك دەلێت:

((**إن المشكلة ليست في توليد أفكارٍ إبتكاريةٍ جديدة في عقلك و إنما المشكلة في التخلص من الأفكار القديمة**))[1] واتە: (گرفت لەوەدا نییە کە مێشکت هزرێکی نوێ بدۆزێتەوە، بەلاَم گرفت لەوەدایە خۆی لە هزرە کۆنەکان ڕزگار بکات).

با ئەمەی باسکرا بیخەینە میزانی شەریعەت و ژیاننامەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) و لە سەر ڕووداوی گۆڕینی ئاراستەی قیبلە بوەستین:

﴿وَمَا جَعَلْنَا ٱلْقِبْلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيْهَآ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ ۚ وَإِن كَانَتْ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ ۗ﴾[1]

---

(١) القائل هو دي هوك مؤسس شركة فيزا انترناشونال و مديرها التنفيذي. ينظر: (العادة الثامنة من الفعالية إلى العظمة ص١٠١) تأليف : ستيفن ر. كوفي

واتە: (ئەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێشتر ڕووی قیبلەمان کردبوو بەیت المقدس، تاوەکو دەرکەوێت کێ بەڕاستی شوێنکەوتووی تۆیە و ئەوانەی تەنها لەبەر نەریتی باپیرانیان ڕوو لە (کەعبەی پیرۆز) دەکەن لە شوێنکەوتووانت جودابینەوە، ئەمەش تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە، دەرچوون لێی تەنها بۆ کەسێکە خودا هیدایەتی دابێت بۆ ڕاستی ئیسلام ) [٢]

کەواتە بابەتەکە شەرع و عەقل لەسەری یەکڕان: **لادانی پاشماوە خراپەکانی هزرێکی بە میرات وەرگیراو قورسترە لە وەرگرتنی هزرێکی نوێی ڕاست و ڕەوان و دەستپێکردنی کاروانی داهێنان**، با ئێمەی کورد وەکو میللەتێکی ستەم لێکراو ئەمە لە سەر ژیانی خۆمان جێبەجێبکەین بە دوو نموونە:

## نموونەی یەکەم:

### هزری نەتەوەیی و جوان تێگەیشتنی ئایەتی:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَـٰكُمۡ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾﴾ [٣]

لە ساڵی ١٩٨٨ز بەعسیەکانی بەغدا شاری هەڵەبجەیان بە کیمیایی بومب بارانکرد، ژن و منداڵیان سوتاند، بەناوی سورەتێکی قورئانی پیرۆز(الأنفال) بە دڕندەترین شێوە گوندو شارەکانی کوردستانیان ڕامالی و بە تالآنیان بردن...

---

(١) البقرة: ١٤٣. و ينظر: المحرر في أسباب نزول الكتاب(١\٢١٧ ـ ٢٢٦).

(٢) قال القرطبي (في تفسيره ٢\٤٣٩ ط. المؤسسة): (كانت قريشٌ تألفُ الكعبة، فأراد اللهُ عزَّ وجلَّ أن يمتحنهم بغير ما أَلِفوه ليَظهر مَنْ يتبعُ الرسولَ ممَّن لا يتبعهُ)

(٣) الحجرات: ١٣ .

ئایا ئەمە لە بەر ئەوەبوو کە ستەمکارەکانی بەغدای ئەو کات عەرەب ڕەگەزن بۆیە ستەمکارن؟ و خەڵکی کوردستان کورد ڕەگەزن بۆیە ستەملێکراون؟

بێگومان نەخێر... ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئەوانەی بەکیمیایی خەڵکی بێ دەسەڵات دەسوتێنن بە ماڵ و منداڵەوە لە ئینسانیەت دەرهاتوون و بوونەتە دڕندە، ئیتر هەر ڕەگەزێك بن هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، کەواتە ئەوەی کە ئێمە لە سەری پەروەردەبووین: (هەبوونی دوژمنداری نێوان دوو نەتەوەی جیران) واقعێکە لە ڕاستی دوورە بە هەموو پێوەرەکانی عەقل و شەرع!

جێ شاهێدی ئەم نمونەیە ئەوەیە ئایا چەند کاتمان پێویستە بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵەیە؟ کە لە دەروونی خەڵکێکی زۆری کوردستانەکەمان ڕەگی داکوتاوە، ئەگەر ئەم هەڵەیە ڕاستنەکرێتەوە و بتەکانی ڕەگەزپەرستی لە دڵاندا نەشکێنرێن، ناتوانین لە زوڵکاوی هزری ڕەگەزپەرستی نەتەوەیی دەربێین، و ئەگەر نەتوانین لەم زوڵکاوە دەربێین و بتەکان بشکێنین، ئەوا بۆمان نییە نوێژ بکەین، چونکە زوڵکاوەکە پیسە و خاوێنی مەرجە بۆ نوێژکردن، بتپەرستیش شیرکە و تەوحیدیش مەرجە بۆ نوێژکردن! ئەگەر دڵ و دەروونێکی ئاسوودەمان نەبێت بە نوێژ کردن، ناتوانین داهێنان بکەین بەرەو باشترین.... ئەم کاروانەش کاتێکی زۆری دەوێت، بەڵام بە هیمەت بەرزی کورت دەکرێتەوە، خاڵی هیمەتەکەش جوان تێگەیشتنی ئەم ئایەتەیە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ .



## نمونەی دووەم:

## هزری ئاینی و جوان تێگەیشتنی ئایەتی:

﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ [1]

هەڤاڵی پایەبەرز(ابن مسعود ـ رضي الله عنه ـ ) دەفەرمێت: ((كيف أنتم إذا لبستكم فتنة يهرم فيها الكبير، وينشأ فيها الصغير، تجرى على الناس، يتخذونها سُنة إذا غيرت قيل: غيرت السنة، أو هذا منكر))[2] واتە: **(ئێوە چی دەڵێن ئەگەر تووشی تاقیكردنەوەیەك هاتن لە سەرپێچی سوننە، بەناویدا گەورەبوون و بەسەرتاندا گەڕا، خەڵكان بە سوننەت لێی تێگەیشتن، ئەگەر هەوڵی گۆڕینی درا دەگوترێت: دژایەتی سوننەت دەكرێت و ئەمە خراپەیە!؟)** ئەمەباسی زەمانێكە كە سوننە و بیدعە تێكەڵ دەبێت، دینداری دروست كەمبووتەوە، تۆ بڵێی باسی زەمانی ئێستامان نەبێت، با لەسەر نمونەیەك بوەستین:

لەم شارەدا (هەولێر) لە (١٢ ربيع الأول)ی هەموو ساڵ ئاهەنگ بە بۆنەی لە دایكبوونی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەگێڕدرێت تەنانەت مانگەكە بە مانگی مەولود ناودەبرێت تا تەواو دەبێت ئاهەنگەكان بەردەوامن! با ئەم ئاهەنگ گێڕانە كە ڕەگی داكوتاوە لە ناخی هەندێك لە خەڵكی موسڵمان لە ناو تەرازووی شەرع دابنێین[3] :

---

(١) المائدة: ٣ .

(٢) أخرجه ابن أبي شيبة (٧\٤٥٢) و الدارمي (١٨٥) و ابن حزم في الأحكام (٦\٣١٥) و غيرهم ينظر: إغاثة اللهفان لإبن القيم (١\٣٧٤ ط. عالم الفوائد).

(٣) للتفصيل و رد الشبهات ينظر: (القول الفصل في حكم الإحتفال بمولد خير الرسل ـ صلى الله عليه وسلم ـ ) تأليف: إسماعيل الأنصاري ط. مكتبة الرشد.

١ ـ ڕۆژی (١٢ ربيع الأول) ڕۆژی وەفاتی پێغەمبەرمانە(صلى الله عليه وسلم) [1] !

٢ ـ نەپێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) نەهەڤاڵانی و نە تابعين و نە چوار ئیمامە خاوەن قوتابخانە فیقهییەکان ئەمانە کەس مەولودیان نەکردووە نەشیان زانیوە شتێك هەیە بە ناوی جەژنی مەولود، بێجگە لە بە ڕۆژووبوونی دووشەممە کە بەڵگەی لەسەرە «ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَأُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ»[2] .

٣ ـ دووژمنانی هەڤاڵانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لە شیعە عوبەیدیەکانی میسر(الفاطميين) وەکو لاساییەکی دیانەکان جەژنی مەولودیان داهێناوە پاش تێپەڕبوونی چاخەزێڕینەکانی ئەم ئوممەتە[3] .

پرسیار:

* مەعقولە لە ڕۆژی مردنی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم)، بە ئاهەنگ گێڕان دینداری بکەین!؟

* مەعقولە شتێك لای هەڤاڵان(رضي الله عنهم) دین نەبێت ئێمە دینداری پێبکەین!؟

* مەعقولە شتێك دوژمنانی هەڤاڵان(رضي الله عنهم) دایانهێنابێ ئێمە دینداری پێبکەین؟

* مەعقولە شێك لاساییکردنەوەی کافران بێت لە دیندا، ئێمە دینداری پێبکەین!؟ ئەمە لە کاتێکدا بێهێز لاسای بەهێز دەکات!

* مەعقولە بە داهێنان دینداری بکرێت؟ ئەی مانای کەمالی دین چییە کە هەر ڕۆژێك زیادەیەکی بۆ زیاد بکرێت؟!

---

(١) توفى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يوم الإثنين (١٢) ربيع الأول من سنة (١١) هجرية ينظر: كتاب التوفيقات الإلهامية في مقارنة التواريخ الهجرية بالسنين الإفرنكية و القطبية.

(٢) رواه أحمد (٢٢٥٣٧) و مسلم (١١٦٢).

(٣) ينظر: الخطط للمقريزي (٢\٤٣٦) ـ ذكر الأيام التي كان الخلفاء الفاطميون يتخذونها أعيادا ـ .

ئەگەر ئێمەی خەڵك بە چاونەترسیەوە دان نەهێنین بەم بیدعەیە و دەیان بیدعە و داهێنراوی بەم شێوەیە بەناوی دین ـ کە لە باپیرانەوە بۆمان ماوەتەوەـ و پشتی تێنەکەین، ئەوا توانای بڕیاردانمان زۆر لاوازە بۆ سەرلەنوێ فێربوونی ئیسلام لە سەرچاوەوە.

ئەگەر توانای جوان وەرگرتن و تێگەیشتنی دینەکەمان لاواز بێت، ئەوا هەرگیز توانای داهێنان و چاکسازیمان نابێت لە کارەکانی دونیا، چونکە چاکسازییەکانی دونیا لەسەر بناغەی بیروباوەڕە ڕوحیەکان ئاوەداندەکرێن، ئەگەر نا بە دیواری سەر بەفر ناو دەبرێت. مەبەست لێرەدا تەنها نمونەیەکە لە ناو دەیان نمونەی ترسناکتر بۆ بەیانکردنی ئەوەی کە ئەگەر ئێمە بڕیاری شکاندنی بتەکانی بیدعە و داهێنان بەناوی دین لە دڵەکانماندا نەدەین، ئەوا هەرگیز ناتوانین  بڕیاری بەرەو باشترین بدەین لە دونیادا.

ئەمە لەکاتێکدا کە بڕیار شکاندنی ئەم بتانە زۆر زەحمەت ترە و جێبە جێکردنیشی کاتی زیاتری دەوێت لە بڕیاردانی داهێنان بەرەو باشتر لە دونیادا، بەڵکو بڕیاری وەرگرتنی دین بەپاکژی دوور لە خورافات و ئەو بیدعانەی کە بە میرات بۆمان ماونەتەوە مەرجی ئەم داهێنانە یە[(١)]، چونکە ـ وەکو باسکرا ـ ئەگەر ئێمە بە جوانی بۆ دینەکەمان نەگەڕێینەوە ناتوانین دونیامان ئاوەدان بکەین، گەڕانەوەش بۆ دین ئەوەیە کە **هەوڵبدەم خۆم وەکو ڕاستی لێبکەم نەك هەوڵبدەم ڕاستی وەکو خۆم لێبکەم.**
خاڵی دەستپێکی ئەم هەوڵ و هیمەتەش تێگەیشتنی ئایەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ﴾ واتە ئاینێکە زیادە و کەمە قەبوول ناکات و

---

(١) أخرج أبو داود في سننه(٤٢٩١) : « إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا» .

تاکە پێوەرە بۆ گەیشتن بە جوانی تێگەیشتن لە هەموو هزرێك و تاکە دەرگای هیمەت بەخشە بە داهێنان لە هەموو ڕوویەکی جاکسازی لەم دونیایەدا.

❊ ❊ ❊ ❊

لە کۆتایی ئەم بنەمایەش سێ خاڵ دووپاتدەکەینەوە:

یەکەمیان: هەرکاتێك کار لەسەر ئاوەدانکردنی بناغە کرا ـ **کە کارێکی قورسە و کاتێکی زۆریشی دەوێت** ـ ئەوا دڵنیابە لە سەرکەوتن، ئەگەر نا دیواری سەر بەفر و ناحەقییە و بە یەکەم تروسکەی ڕووناکی خۆر دەڕۆخێت. ئەمەش پوختەی بنەمای چوارەمە کە باسکرا.

دووەمیان: گرنگی دامەزراندنی بناغەیەکی پتەوی بیروباوەڕ گەورەترە لە گرنگی خودی کات، چونکە بیروباوەڕ غایەتی ژیان دەردەخات و کات تەنها مەیدانەکەیەتی، لە بنەمای پێنجەمدا ئەم ڕاستییە نزیکدەکەینەوە ـ إن شاء الله ـ .

سێیەمیان: هەبوونی بناغەی تەندروست، مانای دەستپێکردنی قوناغی پەرەپێدانە لە هەموو ڕوویەکەوە، کە لە بنەماکانی (٦) تا (خاتیمە) وردەکارییان باسدەکەین ـ إن شاء الله ـ .

## بنەمای پێنجەم:

## لە نێوان ئامێری (کاتژمێر) و ئامێری (قیبلەنامە)دا

لە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: (( الْكَلِمَةُ الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ، حَيْثُمَا وَجَدَهَا، فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا ))[1] واتە: ئیماندار بەدوای وشەی حیکمەت و مفاداردا دەگەڕێت، لە هەرکات و شوێنێك بیدۆزێتەوە هی خۆیەتی.

ئەم ناونیشانەش {لە نێوان (کاتژمێر) و (قیبلەنامە)دا} وشەیەکی حیکمەتە لە کتێبەکانی زانستی (پەرەپێدانی مرۆڤی) دەبینرێت و لەبەرئەوەی حیکمەتە کەواتە خۆمانەیە، چونکە وشەی حیکمەت هی هەر زانست و نەتەوەیەك بێت لەگەڵ ئیمان و بیروباوەڕی مرۆڤی موسڵمان خوشك و برایە، شەرحی ئەم حیکمەتەش بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) لەم بنەمایەدا ئەم ڕاستییەمان بۆ دەردەخات:

(١) أخرجه ابن ماجة (٤١٦٩) بسندٍ ضعيف و الترمذي (٢٨٨٢) واستغربه.

## شەرحی یەکەم

### کامەیان گرنگترە: کاتژمێر یان قیبلەنامە؟

**کاتژمێر** دروشمی پێوانی کاتی تەمەنی مرۆڤە لەم دونیایەدا، کە پێویستە ڕێکبخرێت (**تُنَظَّمْ**) و گەورەترین سوودی لێوەربگیرێت، ئەگەر نا بەهەدەرچوونی تەمەن و خەسارەتمەندییە، هەروەك پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ۝١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ۝٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ۝٣﴾[1] واتە (پەروەردگار بەکاتی عەصران سوێند دەخوات کە مرۆڤ خەسارەت مەندە بێجگە لەو کەسانەی کاتەکانیان بە ئیمان و کاری چاکە بەسەردەبەن، ئەمەش ئەرکێکی قورسە پێویستە کۆمەڵی ئیمانداران و چاکەکاران ئامۆژگاری یەکتر بکەن بۆ پابەندبوون بەم ئەرکە پیرۆزە، هەروەها ئامۆژگاری یەکتر بکەن کە خۆگر و ئارامکێش بن لە هەڵگرتنی ئەم ئەرکە، کە تاکە ڕاستی ئەم ژیانەیە).

**قیبلەنامەش** ـ لەم بابەتەدا ـ دروشمی دیارخستنی مەبەستی ژیانی ئەم دونیایەیە، کە پێویستە دەستنیشان بکرێت (**تُحَدَدْ**) پێش هەموو هەنگاوێك، ئەگەر نا بە هەدەرچوونی هەموو ڕێکخستنێکی ژیانە کاتێك مەبەستی یەکەمی هەر هەنگاوێك بە دروستی دیارنەکرابێت، ئەم مەبەستەش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ڕازیبوونی خودای پەروەردگارە، هەروەك پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ﴾[2] واتە: (تەنها بۆ خوداپەرستی ـ بە مانا فراوانەکانیەوە ـ جنوکە و مرۆڤم خەلقکردووە) و دەفەرمێت:

---

(١) سورة العصر.

(٢) الذاريات : ٥٦.



﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾[١] واتە : با مرۆڤ وا تێنەگات کە خوداپەرستی هیچ پێوەرێکی نییە و بۆ خودی مرۆڤ دەگەڕێتەوە، نەخێر پێوەری هەیە و ئەم پێوەرەش نەدراوەتە دەست مرۆڤ، بەڵکو ئەمر و نەهییە لە ئاسمان دابەزیوە و پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَـٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ﴾[٢] واتە: (وا تێمەگەن ژیانتان بێ مەبەستە، ئێوە بۆ مەبەستێك خەلقكراون و بۆ خالقەكەتان دەگەڕێنەوە)، بڕیاردان لەسەر دەستنیشانکردنی ئەم مەبەستە خاڵی جیاکاری نێوان ئیمان و کوفرە.

❊❊❊❊❊

لەم شەرحە یەکەمەوەش بۆمان دەردەکەوێت کە سەرەڕای گرنگی کاتژمێر، بەڵام قیبلەنامە گرنگترە، چونکە ئەگەر مەبەستی ژیان دەستنیشان نەکرابێت بە دروستی ـ لە پێناو چیدا دەژین و چۆن لە پێناویدا بژین؟ ـ، ئەوا کۆتایی هەموو ماندووبوونێك خەسارەتمەندییە، بەڵكو بە پێی ماندووبوونەکە مرۆڤ دووردەکەوێتەوە لە ڕاستی، لێرەوە زانایانمان دەڵێن: «مَا ازْدَادَ مُبْتَدِعٌ اجْتِهَادًا إِلَّا ازْدَادَ مِنْ اللَّهِ بُعْدًا»[٣] واتە: كاتێك کارەکانی خوداپەرستی بە پێی هەوا و هەوەس ئەنجام دەدرێن، ئەوا خاوەنکارەکە چەند خۆی زیاتر ماندووبکات زیاتر لە خودا دوور دەکەوێتەوە! بۆچی؟ چونکە قیبلەنامەی بەکارنەهێناوە یان هەڵەی کردووە لە بەکارهێنانی لە دەستنیشانکردنی ئاراستە ڕاستەکە، کە ڕووکردنە لە خودا بەپێی سوننەتی پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم)، ئەوجا هەرکارێك ئەنجامدەدەی ئاراستەکەی گرنگە، بۆیەش خودای پەروەردگار

---

(١) القيامة : ٣٦. قال الشافعي رحمه الله : ﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى﴾ الآية، و السُّدى : الذي لا يؤمر ولا ينهى. الرسالة ص٢٥ و ينظر: الأم (٩\٦٧ ، ٧٣ ط. دار الوفاء) و تفسير الشافعي (٣\١٤١٢ ـ ١٤١٣).

(٢) المؤمنون: ١١٥.

(٣) الفتاوى الكبرى لشيخ الإسلام (٦\٦١٧) و مجموعة الفتاوى (١٩\٤٨ ـ ٤٩) دقائق التفسير (٢\١٧٠).



کاتێك باسی ڕووکردنی موسڵمانان لە قیبلە دەکات ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئەمە تایبەت نییە بە نوێژ، بەڵکو ئاراستەی واتایی هەموو کارێك دەگرێتەوە، هەریەکەو بە پێی بەهرەی خۆی: ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا ۚ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٤٨﴾ وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ۖ وَإِنَّهُ لَلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[1] زانای موفەسیر (عبدالرحمن السعدی) لە مەبەستی ئایەتەکە ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمێت: مەبەستی ئایەتەکە گشتییە و هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ لە خودا نزیك دەکەنەوە و ئاسوودەیی بە مرۆڤ دەبەخشن و تایبەت نییە تەنها بە ڕوکنی ڕوو لە قیبلەکردن لە نوێژدا: (... وليس الشأن في استقبال القبلة، فإنه من الشرائع التي تتغير بها الأزمنة والأحوال، ويدخلها النسخ والنقل، من جهة إلى جهة، ولكن الشأن كل الشأن، في امتثال طاعة الله، والتقرب إليه، وطلب الزلفى عنده، فهذا هو عنوان السعادة ومنشور الولاية، وهو الذي إذا لم تتصف به النفوس، حصلت لها خسارة الدنيا والآخرة، كما أنها إذا اتصفت به فهي الرابحة على الحقيقة، وهذا أمر متفق عليه في جميع الشرائع، وهو الذي خلق الله له الخلق، وأمرهم به...)[2] .

ولە شەرحی دووەمدا وردەکاری ئەم مانایانە زیاتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

---

(١) البقرة : ١٤٨ ـ ١٤٩.

(٢) تفسير السعدي (١\٢٧).

## شەرحی دووەم

### دڵنیایی لە تەرازووی قیبلەنامە و تەرازووی کاتژمێر

ئامێری تەرازوو لە سێ بەش پێکدێت زۆبانەی ناوەڕاست و دوو قاپ لە چەپ و ڕاستی زۆبانەکە، ئامێرەکە دروشمی دادپەروەرییە لە ناو هەموو کۆمەڵانی خەڵك بە جیاوازی نەتەوەو ئایینەکانیان، لە شەرحی یەکەمدا قیبلەنامە لە قاپێکی تەرازووەکە و کاتژمێر لەقاپەکەی دیکەدابوو، بۆمان دەرکەوت سەرەڕای گرنگی کاتژمێر قیبلەنامە گرانتر و گرنگترە.

لەم شەرحەدا ئەم ڕاستییە بە شێوەیەکی دیکە دیاردەخەین بێ ئەوەی ئامێری قیبلەنامە یان کاتژمێر بیخەینە ناو قاپەکانی تەرازوودا، چونکە هەریەك لەم دوو ئامێرە بەخۆیان تەرازوویەکن لە جۆرێکی تایبەت، هەر بۆیەش لەم شەرحەدا وەکو تەرازوو تەماشایان دەکەین:

تەماشای ئامێری قیبلەنامە دەکەین کە سێ بەشی هەبێت زۆبانە لەناوەڕاست و دوو قاپ لە چەپ و ڕاستی زۆبانەکە، تاوەکو بزانین لەسەر ڕوویەکی ڕاست دانراوە و بە دروستی ئاراستەی ڕاستمان دەداتێ.

تەماشای کاتژمێریش دەکەین بە هەمان شێوە کە سێ بەشی هەبێت زۆبانە لەناوەڕاست و دوو قاپ لە چەپ و ڕاستی زۆبانەکە، تاوەکو بەراوردێکی دروست لە نێوان خێرایی میلەکانی بکەین، بە دروستی کاتەکەمان پیشانبدات. کەواتە شەرحە دووەمەکەمان دوو بەشە :

## بەشی یەکەم:

## تەماشاکردنی قیبلەنامە وەکو ئامێری تەرازوو، تاوەکو بزانین لەسەر ڕوویەکی ڕاست دانراوە و دڵنیابین کە بە دروستی ئاراستەی ڕاستمان دەداتێ

بێگومان ئەگەر قیبلەنامە لەسەر ڕوویەکی ڕاست دانەنرێت ئاراستەی ڕاستمان پیشاننادات، ئەمەش لە ڕووی واتاییەوە سەبارەت بە بابەتەکەمان بریتییە لە دڵنیایی لە هاوسەنگی وەرگرتنی قیبلەنامە  بە دڵنیاییبوون لەوەی کە لە سەر ڕوویەکی ڕاست دانراوە.

ئەم دڵنیاییبوونەش لە سێ بەش پێکدێت کە هەریەکەیان مەرجێك هەڵدەگرێت لە مەرجەکانی ڕاست وەرگرتنی ئاراستەی میلی قیبلەنامەکە و هەرمەرجێکیش لەم سێ مەرجە لە فەرمودەیەك وەرگیراوە:

**بەشی یەکەم (قاپی لای ڕاستی تەرازووەکە):** {سەبارەت بە ناخی (الباطن) کارەکان = ئاراستەی دڵ لە کاتی ئەنجامدانی هەرکارێك = ڕووکردنی میلی قیبلەنامە بۆ ماناکانی : (لا إله إلا الله)} ئەمەش لە فەرمودەی: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى»[١] وەردەگیرێت و مەرجی ڕاست و دروستی کارەکانی ناخە(الباطن).

**بەشی دووەم (قاپی لای چەپی تەرازووەکە):** {سەبارەت بە ڕووی دیاری(الظاهر) کارەکان = نەبوونی سەرپێچی بۆ سوننەتی پێغەمبەرمان ـ صلى الله عليه وسلم ـ = ڕووکردنی میلی قیبلەنامە بۆ ماناکانی (محمدٌ رسول الله)} ئەمەش لە فەرمودەی: «مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ»[٢] وەردەگیرێت و مەرجی ڕاست و دروستی ڕووی دیاری (الظاهر)کارەکانە .

---

(١) متفقٌ عليه.(واتە: هەموو کارێك نییەتی پێویستە و بە پێی نییەتەکەش پاداشت و سزای لەسەرە).

(٢) متفقٌ عليه.(واتە: هەرکارێك بە پێی سوننەتی شەرع نەبێت بەتاڵە و قەبول نییە).

بەشی سێیەم (زۆبانەی تەرازووەکە): {هەبوونی شك و گومان لە ئاراستەی میلی قیبلەنامەکە لە دیارخستنی ئاراستەی ڕاستی کردەوەکانی دڵ و جەستە بۆ هەردوو مانای (**لا إله إلا الله**) و (**محمد رسول الله** )} ئەمەش لە فەرمودەی: «الْحَلاَلُ بَيِّنٌ وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ ، فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ إِنَّ حِمَى اللَّهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ»[١] وەردەگیرێت و مەرجی دڵنیایی ڕاست و دروستی کارەکانی باطن و ظاهرە.

کەواتە هەر کاتێك میلی قیبلەنامە ڕووی لەماناکانی (لا إله إلا الله) و (محمد رسول الله) کرد و شلەژان و لەرەلەری نەبوو، ئەوا تەرازووەکەی قیبلەنامە بە تەواوی کاردەکات و قیبلەنامەکەت لەسەر ڕوویەکی ڕاست بەکارهێناوە، ئەوکات بە دڵنیاییەوە کارەکانت ئەنجام بدە و سەرکەوتوویت. ئەگەر ئەم هاوسەنگییەت لە تەرازووەکەدا نەدیت، ئەوا دەستبەرداری کارەکە ببە، چونکە بەهەڵە قیبلەنامەت بەکارهێناوە و ئاراستەیەکت دەداتێ کە دوورە لە مەبەستە یەکەمینەکەی ژیان کە ڕازیبوونی خودای پەروەردگارە.

---

(١) متفقٌ عليه.(واتە: حەلال و حەرام دیارن، لە نێوانیاندا هەندێك شت هەن جێی گومانن، ئەوەی خۆی لەم گومانانە بپارێزێت، ئەوا خۆی پاراست و ئەوەی کەوتە ناو ئەم گومانانە، ئەوا وەکو شوانێکە کە بەرخەکانی لە ڕۆخ پاوانێکی حەرام بلەوەڕێنێ نزیکە تووشبێت بە حەرام، هەموو مەلیکێکش پاوانی خۆی هەیە، پاوانی خوداش لەسەر ئەم زەوییە حەرامکراوەکانی ئەون، بشزانن جەستە پارچە گۆشتێکی تیادایە، ئەگەر چاك بوو، ئەوا جەستەکە هەمووی چاکدەبێت لە گوفتار و ڕەفتاریدا و ئەگەر خراپ بوو، ئەوا جەستەکە هەمووی خراپ دەبێت ئەو پارچەگۆشتەش دڵە).

لێرەشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤ لە زۆرێك لە کارەکانیدا قیبلەنامە بەکاردێنێت بێئەوەی بیر بکاتەوە ئایا قیبلەنامەکەی لەسەر ڕوویەکی ڕاست دانراوە یان نا، دروست بەکاری هێناوە یان نا؟

بۆ نمونە قاروون و فیرعەون لەسەر ڕوویەکی خوار قیبلەنامەیان دانا و بە هەڵە بەکاریان هێنا، بۆیە میلی قیبلەنامەی فیرعەون ڕووی لە موڵك و دەسەڵاتی دونیا کرد و بانگی قەومەکەی کرد: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَـٰذِهِ ٱلْأَنْهَـٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾[١] و میلی قیبلەنامەی قاروون ڕووی لە ماڵی دونیاکرد کاتێك خەڵکەکەی ئامۆژگارییانکرد کە ئاگای لە قیامەتی خۆی بێت لە وەڵامیاندا گوتی: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِيٓ ۚ﴾[٢]، و لە هەمان وڵات کە میسرە، یوسف (علیه السلام) ماڵ و موڵکی میسری لە دەست بوو، بەڵام قیبلەنامەکەی لەسەر ڕوویەکی ڕاست دانابوو، قیبلەنامەکەش دروست ئاراستەی دەکرد، بۆیەش ڕووی لە **خودا** بوو ئەم سەروەت و دەسەڵاتەی لەبەر دەستی بوو لە پێناو ڕزگاری خەڵکی میسر و لە ڕێگای **خودا** دا بەکاریهێنا. هەرسێکیشیان (فیرعەون و قاروون) و (یوسف ـ علیه السلام ـ)بەوپەڕی دیقەتەوە کاتژمێریان بەکارهێناوە لە ڕێکخستنی کاتەکانی ژیان. کەواتە با دووبارە بیربکەینەوە کە قیبلەنامە زۆر لە کاتژمێر گرنگترە، لە هەمانکاتدا زۆر ترسناکتریشە بەتایبەتی کاتێك مرۆڤ قیبلەنامەکەی لەسەر ڕوویەکی یەکجار خوار دابنێت میلی قیبلەنامەکە بۆ خودی مرۆڤەکە بگەڕێتەوە، ئەوکات وەکو ئیبلیس دەڵێت ﴿أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ﴾[٣] یان وەکو فیرعون دەڵێت ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ﴾[٤] کە ئەمە حاڵی طاغوتەکانی دونیایە، خودا بمان پارێزێت.

---

(١) الزخرف: ٥١.

(٢) القصص: ٧٨.

(٣) الأعراف : ١٢ ، ص:٧٦.

(٤) النازعات: ٢٤.

بەشی دووەم:

تەماشاکردنی کاتژمێر وەکو ئامێری تەرازوو. تاوەکو بەراوردێکی دروست لە نێوان خێرایی میلەکانی بکەین، دڵنیابین کە بە شێوەیەکی دروست کاتەکە دەخوێنێتەوە

لە گەورەترین هۆکارەکانی دابڕان لە ئاواتەکانی دین و دنیا، هەڵەی خوێندنەوەی کاتە، وەکو بەهەڵە خوێندنەوەی کاتی ژنهێنان و شووکردن یان کاتی تەواوکردنی خوێندنەوەی کتێبێك کە کاتی تەواوکردنی کتێبێك لە زانستی فیزیا جیاوازە لە کاتی خوێندنەوەی ڕۆمانێك کە هەمان ژمارە لاپەڕەبن، یان کاتەکانی سەردان یان کاتی وەرزش و گوێبیستی دەنگوباس یان کاتی دانیشتن لەگەڵ خێزان ...هتد.

ئەم هۆکارە ترسناکەش سەبارەت بە کەسێکەوە بریتییە لە هەڵبژاردنی کەسەکە بۆ کاتژمێرێك کە بە هەڵە کاردەکات، کەواتە چۆن بزانین کاتژمێری دەستمان خوێندنەوەی تەواوە؟

بۆ ئەم مەبەستە وەکو سێ بەشەکەی تەرازوو تەماشای کاتژمێر دەکەین:

بەشی یەکەم (قاپی لای ڕاستی تەرازووەکە): (ئەو ئامانجانەی وەدەست هێنانیان پێویستیان بەکاتی زۆر هەیە، نابێت پەلەی لێبکەی ئەگەر نا دوادەکەوی = میلی سەعات هژمێر).

دووەم (قاپی لای چەپی تەرازووەکە): (ئەو ئامانجانەی وەدەست هێنانیان پێویستیان بە زوو ئەنجامدان هەیە لە کاتی تایبەتدا = میلی خولەك ژمێر).

سێیەم (زۆبانەی تەرازووەکە): (ئەو ئامانجانەی بۆ وەدەست هێنانیان کاتەکە کراوەیە هەموو کات خوازراون بێ دواکەوتن = میلی چرکە ژمێر).

**نمونەی یەکەمیان: (طلب العلم ـ زانست داواکردن ـ)** لە باسی لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز وگوتنەوەی، پەروەردگار بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: ﴿لَا

تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾[1] و پێی دەفەرمێت ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾[2]

**نمونەی دووەمیان: (العمل ـ کارکردن ـ)** پەروەردگار لە باسی موسا و گەیشتن بەکارەکە لە کاتی پێویست و دیاریکراودا دەفەرمێت: ﴿۞ وَمَآ أَعْجَلَكَ عَن قَوْمِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمْ أُو۟لَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِى وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَىٰ﴾[3] .

**نمونەی سێیەمیان: (ذِکر ـ يادي خودا ـ)** پەروەردگار لە باسی پیاوچاکان دەفەرمێت : ﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَـٰطِلًا سُبْحَـٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾[4] . لە فەرمودەشدا هاتووە کە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) هەموو کات زیکری خودای کردووە: «كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى جَمِيعِ أَحْيَانِهِ»[5] .

کەواتە لەم سێ نمونەیە بۆمان دەردەکەوێت کە بە پێی جۆری کار و ئامانجەکە کاتەکە دەگۆڕدرێت، بیستومانە کەسانێك بۆ لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز سالێکیان داناوە، بەلاّم لە ئەنجامی زۆر خۆماندووکردن تووشی بێزاری بوون، نەك لەکاتە دیاریکراوەکەدا قورئانیان لە بەرکردووە، بەلّکو وازیشیان هێناوە لە لەبەرکردنی و لە خوێندنەوەشی! بۆچی؟ چونکە کاتژمێرکی ناتەواویان هەلّبژاردووە بۆ دەستنیشانکردنی کاتەکان، کە هاوسەنگی خێرایی لە نێوان میلەکانیدا نییە و تەرازووەکەی تێکچووە.

---

(١) القيامة (١٦ ، ١٧).

(٢) طه: ١١٤.

(٣) طه(٨٣ ، ٨٤).

(٤) آل عمران: ١٩١.

(٥) أخرجه ابن منده (٢\٣٥).





ئەمە حاڵی هەمان کەسە کە لە تەمەنی چل ساڵی بیر لە ژنهێنان دەکات، یان حاڵی کەسێك پاش ئەوەی کچەکەی سی ساڵی تەمەنی تێدەپەڕێنێت، دەڵێت: بڕیارمداوە ئەم جارە دڵی نەشکێنم و کەس نەگەڕێنمەوە، یان پاش نوێژی بەیانی سەردانی دۆست و دراوسێیانی دەکات، یان پاش ئەوەی پزیشکی پسپور پێی دەڵێت سیەکانت بە نەخۆشییەکی ترسناك داپۆشراون، دەڵێت: جگەرە تەرك دەکەم! ....هتد. کەواتە ڕاستە قیبلەنامە لە کاتژمێر گرنگترە، بەڵام گرنگی کاتژمێریش بەڕادەیەکە کە مەرجە بۆ سەرکەوتن.

هەر لەبەر ئەمەش باسی کات و خێرایی کات (ئامێری کاتژمێر لە بابەتەکەماندا) بە چەندین شێوە لە قورئانی پیرۆزدا باسدەکرێت، گشتیشیان وەکو شوێنکەوتەن بۆ ئاراستەی میلی قیبلەنامە، بۆ نمونە ئەو ئایەتانەی کە باس لە بڕیاری گەڕانەوە بۆ خودا دەکەن ( = ڕووی میلی قیبلەنامە لە ڕەزامەندی خودا دا بێت) گشتیان باسی خێرایی ئەنجامدانی کارەکان دەکەن (= میلی چرکە ژمێری ئامێری کاتژمێر):

* ﴿فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ﴾[1] (ئەوپەڕی خێرایی) بۆ دوورکەوتنەوە لە هەرکارێکی سەرپێچی، کە مرۆڤ لە ئاگری دۆزەخ نزیك بکات.

* ﴿سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ﴾ [2] (پێشبڕکێ) بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانەی مرۆڤ لە لێبوردەیی خودا و بەهەشتی پان و بەرین بەقەد پان و بەرینی زەوی و ئاسمان نزیك بکاتەوە....

* ﴿۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ﴾[1] (خێراییەکی زۆر) بۆ ...

---

(١) الذاريات: ٥٠.

(٢) الحديد: ٢١ .

❊ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ﴾[٢] ( خێرایی بۆ نوێژ و زیکری خودا کە تێکەڵە بە پەرۆشبوون بە هیوای قەبوولبوونی)

و لەو ئایەتانەی کەباس لە وەدەستخستنی پێداویستییەکانی ژیان دەکەن لە پێناو بەردەوامی خوداپەرستی:

❊ ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ﴾[٣] (بڵاوبوونەوە بۆ کاسبکاری و بازرگانی کە دابینکردنی زەروریاتی ژیانە لە خواردن و خواردنەوەو جلوبەرگ ....هتد لە پێناو بەردەوامبوونی بەندایەتی بۆ خودا).

❊ ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولٗا فَٱمۡشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ﴾[٤] (گەڕان و سوڕان لە ڕێگاو بانی ئەم زەوییە لە پێناو دابینکردنی زەروریاتی ژیانە لە خواردن و خواردنەوەو جلوبەرگ ....هتد لە پێناو بەردەوامبوونی بەندایەتی بۆ خودا).

وشەکانی ﴿فَفِرُّوٓاْ﴾ و ﴿سَابِقُوٓاْ﴾ و ﴿وَسَارِعُوٓاْ﴾ و ﴿فَٱسۡعَوۡاْ﴾ و ﴿فَٱنتَشِرُواْ﴾ و ﴿فَٱمۡشُوا﴾ خێرایی پێویستیان بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان جودایە بە پێی پیرۆزی کارەکە، وەك لە ڕێزبەندیاندا دیارە لە زۆرترین خێرایی لە ئەنجامدانی کارەکان بۆ کەمتر و هەروەها، بە پێی مەبەستی کارەکە.

بەهەمان شێوە زۆرترین گرنگیدان بەکات پێویستە بە کاتە تایبەتەکان بێت وەك لەبنەمای شەشەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

---

(١) آل عمران: ١٣٣.

(٢) الجمعة:٩.

(٣) الجمعة: ١٠.

(٤) الملك : ١٥.

## ( پوختەی بنەمای پێنجەم )

## نمونەی کاتژمێر و قیبلەنامە

## لە ژیانی موسڵمانی بێئاگا لە ماناکانی ژیان؟

- ئەو موسڵمانەی ڕێزبەندی ڕازیبوونی خۆی و خەڵك و خودا تێکەڵدەکات.
- ئەو موسڵمانەی پێی وایە موسڵمانە، چونکە لە دایك و باوکێکی موسڵمان لە دایك بووە ئەگەرنا دیانەتێکی دیکە دەبوو.
- ئەو موسڵمانەی حاڵی نییە لەو کارەی کە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بە خەڵکی مەککەو مەدینەیانکرد، کە بەهۆیانەوە بوون بە سەرکردە و ڕێنیشاندەری مرۆڤایەتی بۆ ماناکانی ژیان و خەلافەتی زەوی.
- ئەو موسڵمانەی زۆبانی سەناو صەلەواتە لەسەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەلاَم لە واقعی ژیانیدا بێ قودوە دەژێت یان کەسێکی دیکە قودوەیەتی بێجگەلە شەخصی محمد (صلى الله عليه وسلم) .

ئەو موسڵمانە وەکو ئەو یاریزانەی تۆپی پێ وایە کە بێئاگایە لە کاتی یارییەکە و لای وایە هیچ حەکەمێك نییە زەنگی کۆتایی یاریەکە لێبدات(کاتژمێر).و ناشزانێت گۆلی تیمی بەرامبەر کامەیە، لای وایە دەباتەوە کاتێك گۆل لە تیمی خۆی دەکات (قیبلەنامە)؟.

**( مَا ازْدَادَ مُبْتَدِعٌ اجْتِهَادًا إِلَّا ازْدَادَ مِنْ اللَّهِ بُعْدًا )**

## بنەمای شەشەم:

## هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ (کات)ە تایبەتەکان

**ـ هەنگاوێك لە قوناغی جێگیربوون و پاراستنەوە بەرەو قوناغی ڕووناکبوون و بەرزبوونەوە ـ**

ئەوەی باسکرا لە بنەماکانی پێشتر بریتی بوو لە بڕیاری ژیان کە کاتەکە لە پێناو ڕەزامەندی خودا دابێت، پارێزگاریش لەم بڕیارە بکرێت بە جێبەجێکردنی ئەرکان و پاراستنی زەروریاتی ژیان.

لەم بنەمایەشدا ـ بنەمای شەشەم ـ لە ڕوویەکی دیکەوە تەماشای **کات** دەکەین، کە تەماشاکردنێکە بۆ جۆرێکی تایبەتی کات، کە پیرۆزتر و بەبەرەکەتترە لە کاتەکانی دیکە، ئەم تەماشاکردنەش بە مەبەستی زیاتر بەرزبوونەوەیە بۆ پلە بەرزەکانی بەندایەتی خودا و زیاتر ڕووناکبوونەوەیە بە خزمەتکردنی دەوروبەر، ئەمەش بە دەرفەت وەرگرتن لەم جۆرە کاتانە کە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، کە دەتوانین بە دوو شێوە پۆلێنیان بکەین:

**یەکەمیان: ئەو کاتانەی خودا تایبەتمەندیکردوون بە زیاتر پیرۆزی و بەرەکەت.**

**دووەمیان: ئەو کاتانەی لەبەر ڕووداوەکانی ژیان تایبەتمەندی شەرعی وەردەگرن و بەرەکەت و پیرۆزیان زیاتر دەبێت.**

بەڵام پێش ئەوەی باس لەم دوو کاتە تایبەتمەندە بکەین، پێویستە بزانین کە ئەصل لەکاتدا ئەوەیە کە پیرۆزە لە ڕووی شەرعەوە، پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) نەهی کردووە کە جوێن بەکات بدرێت، چونکە خودا کات و زەمان هەڵدەسوڕێنێت: ((لَا تَسُبُّوا الدَّهْرَ، فَإِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: أَنَا الدَّهْرُ، الْأَيَّامُ وَاللَّيَالِي لِي، أُجَدِّدُهَا وَأُبْلِيهَا، وَآتِي

بِمُلُوكٍ بَعْدَ مُلُوكٍ»[١] هەروەها پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) فەرمان دەكات كە هەمووكاتێك بە دەرفەت وەربگیرێت بۆ چاكەكردن، تەنانەت ئەگەر بزانی قیامەت هەڵساو نەمامێكت لە ناو دەستە نەمامەكە بڕوێنە« إِنْ قَامَتْ عَلَى أَحَدِكُمُ الْقِيَامَةُ وَفِي يَدِهِ فَسِيلَةٌ فَلْيَغْرِسْهَا»[٢]. مەبەست لێرەدا ئەوەیە كە گشت كاتەكان پیرۆزن و تایبەتمەندكردنی هەندێكیان بە زیاتر پیرۆزی و بەرەكەت مانای ناپیرۆزی ئەوانی دیكە ناگەیەنێت و لەم ڕوانگەیەوە ڕاڤەی دوو پۆلێنەكە دەكەین:

**یەكەمیان: ئەو كاتانەی خودا تایبە تمەندیكردوون بە زیاتر پیرۆزی و بەرەكەت.**

كاتی بەرەبەیان(السَحَر) یان بەیانی(الصبح) یەكێكە لەو كاتانەی كە خودا تایبەتمەندی كردوون بە زۆری بەرەكەت و ڕێزلێنان، ئەم كاتە موبارەكەش كە نمونەیەكی كاتی تایبەتمەندی ڕۆژانەیە، وەكو نمونەیەكی كاتی تایبەتمەند باسی لێدەكەین بە شێوەیەك كە ڕێبەرمان بێت بۆ كاتە تایبەتمەندەكانی دیكەش لە ڕۆژ و هەفتە و مانگ و ساڵ و تەمەندا[٣].

---

(١) متفقٌ عليه و هذا لفظ أخرجه أحمد(١٠٤٣٨) .

(٢) أخرجه أحمد (١٣١٠٠مكنز).

(٣) نمونەی دیكەی كاتە تایبەتمەندەكان:

* شەوانە : وەكو بەشی سێیەمی كۆتایی شەو كە كاتی پاڕانەوە و ئیستیغفاركردنە.

* هەفتانە: وەكو كاتی دوعا قەبوولبون لە ڕۆژی هەینی، یان بە ڕۆژوو بوونی دووشەممە و پێنج شەممە.

* مانگانە: وەكو بەڕۆژووبوونی ڕۆژە سپییەكان(١٣ ، ١٤ ،١٥)ی ناوەڕاستی مانگ.

* ساڵانە: وەكو شەوەكانی قەدر لە ڕەمەزاندا و نۆ ڕۆژەكەی مانگی (ذي الحجة).

مەبەستیش لەم نمونانە تەنها ئاماژەكردنە بەگرنگی ئەم كاتانە كە پێویستە موسڵمان لێیان بە ئاگابێت. بەدرێژی باسكردنیان و هێنانەوەی بەڵگە لەسەر پیرۆزییان جێگای ئەم بابەتە نییە و پێویستی بە لێكۆڵینەوەیەكی سەربەخۆی هەیە.

بەرەبەیان وەك لە قورئانی پیرۆزدا باس دەکرێت کاتی ڕزگاربوونی پێغەمبەرانە(): ﴿إِلَّآ ءَالَ لُوطٍۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ﴾(١) و کاتی لەناوبردنی ئەو ستەمکارانەیە کە دژایەتی پەیامی پێغەمبەران دەکەن: ﴿إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ﴾(٢) .

ئەمەش ئاماژەیەکی قورئانی پیرۆزە بۆ گەشبینی بە ڕۆژی نوێ لە یەکەم هەناسەکانی ژیانی نوێ پاش هەستانەوە لە خەو، خەویش جۆرێکە لە جۆرەکانی مردن.

پەیامەکە بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێت کە تۆ لەکاتی سەرکەوتنندای، کاتەکەش لەگەڵ تۆ ڕوو لە ڕووناکی دەکات و تاریکی بەجێ دێلێت: ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ﴾(٣) و هەناسەی ئاسوودەیی ژیان هەڵدەمژێت: ﴿وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾(٤) کەواتە گەشبین بە بە ڕۆژی نوێ، کە لەم ڕۆژەدا خودا بەگەورەیی خۆی لەگەڵتە و سەرت دەخات، سروشتیش لاسایی تۆ دەکاتەوە لە هەنگاوەکانیدا بەرەو ڕووناکی و لە هەناسەکانیدا بەرەو ئاسویەکی نوێ، بەڵکو بانگت دەکات:

((يا ابنَ آدم أنا خَلقٌ جَدِيد و أنا فِيما تَعملُ عليك غداً شهيد، فاعْمَلْ فيَّ خَيْراً أَشْهَدُ لَكَ بهِ غَداً فإِنِّي لَو قَد مَضَيْتُ لم تَرَني أَبَداً))(٥)

---

(١) القمر: ٣٤.

(٢) هود:٨١.

(٣) المدثر :٣٤.

(٤) التكوير: ١٨.

(٥) حلية الأولياء (٢\٣٠٣ ) أمالي ابن سمعون الواعظ (١\٢٢٦). واتە: (ئەی بەنی ئادەم من ڕۆژێکی نوێم شاهێدی لە سەر کارەکانت دەدەم کە لە مندا ئەنجامدەدەیت، کەواتە چاکە ئەنجام بدە، تاوەکو بە چاکە سبەی شاهێدیت بۆ بدەم، چونکە ئەگەر من تێپەڕیم، ئەوا هەرگیز ناگەڕێمەوە و بە ڕۆیشتنم دەرفەتی کارکردنت لە دەست دە چێت).

مرۆڤی موسڵمان کاتێك هەست بەم خۆشییە دەکات بۆ سەرچاوەکانی هێز دەگەڕێتەوە، تاوەکو بەوپەڕی هێزەوە بڕوانێتە ڕۆژی نوێ و بەجوانترین و باشترین شێواز هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات و کاری تیادا بکات، قورئانی پیرۆز باس لە سەرچاوەی هێزی موسڵماندەکات لەم کاتە پیرۆزەدا لەدوو ئایەت کە ئەمانەن:

* ﴿وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾[١] لە قوناغی مەککیدا دابەزیوە، لە ئایەتەکەدا پیرۆزی کات پێش پیرۆزی مرۆڤی ئیستیغفارکار هاتووە.

* ﴿وَٱلۡمُسۡتَغۡفِرِينَ بِٱلۡأَسۡحَارِ﴾[٢] لە قوناغی مەدینە دابەزیوە، لە ئایەتەکەدا پیرۆزی مرۆڤی ئیستیغفارکار پێش پیرۆزی کات هاتووە.

ئەمەش وەکو پەیامێك کە پێش ئیستیغفار پیرۆزی کات لە تۆ زیاترە و پاش ئیستیغفاریش پیرۆزی تۆ لە کات زیاترە، چونکە پاش ئیستیغفار تۆ خاوەن هیوای بە خودای پەروەردگار کە پاڵپشتت دەبێت:

* بۆ زیاتر ڕووناکبوونەوە بە پلەکانی بەندایەتی بە نوێژ و پاڕانەوە و پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەمە دەفەرمێت: « يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ »[٣]

---

(١) الذاريات:١٨.

(٢) آل عمران:١٧.

(٣) متفقٌ عليه و اللفظ لمسلم (١٤٦٤ مكنز). واتە: (فریشتەی شەو و ڕۆژ یەك بە دوای یەك جێگۆڕکێ دەکەن لە سەردانتان، لە نوێژی بەیانی و ئێوارە کۆدەبنەوە، ئەوانەی شەو لاتانبوون بەرز دەبنەوە بۆ لای خودای پەروەردگار، پەروەردگاریش ـ کە هەر خۆی زانایە بە هەموو شتێك ـ لێیان دەپرسێت چۆن بەندەکانی منتان

* بۆ زیاتر ڕووناككردنی دەوروبەر بە خزمەتكردن و بەخشین و یارمەتیدان، پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بەمە دەفەرمێت: « مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا ، وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا»[١] .

بەمە هێز و هیوا كۆدەبنەوە بەرامبەر ڕۆژێكی نوێ، ئەم هێز و هیوایەش هەموو بەیانییەك خۆیان دووبارە دەكەنەوە.

ئەمە(كاتی بەرەبەیان) نمونەیەكی ئەو كاتە تایبەتانەیە كە خودا تایبەتمەندی كردوون، دەرفەت وەرگرتن لەم كاتە بەرزبوون و ڕووناكییە بۆ كاتەكانی دیكە، بەفیڕۆدانی ئەم كاتەش هۆكاری بزربوون و سەرلێشێوانە بۆ كاتەكانی دیكە، چونكە هێزی مرۆڤ لەم كاتەدا بە زیكرو ئیستیغفار و گومانبردنی باش بەخودا نوێدەبێتەوە.

(ابن قيم ـ رحمه الله ـ) لە باسی ماموستاكەی (ابن تيميه ـ رحمه الله ـ) دەفەرمێت: پاشی نوێژی بەیانی ماموستاكەم زیكر و ئیستیغفاری دەكرد تاوەكو ڕۆژ بەرزدەبوویەوە و دەیفەرموو: ئەم زیكرو ئیستیغفارە خواردن و خواردنەوەی ڕۆژانەمە، ئەگەر ئەنجامیان نەدەم، ئەوا بێ هێزی ڕووم تێدەكات[٢].

---

بەحێهێشت، ئەوانیش لە وەڵامدا دەفەرموون: كە بۆ لایان ڕۆیشتین نوێژیان دەكرد و كە بە جێمان هێشتن نوێژیان دەكرد).

(١) متفقٌ عليه و اللفظ للبخاري (١٤٦٤مكنز). واتە: (لە بەرەبەیانی هەموو ڕۆژێك دوو فریشتە دادەبەزن، یەكێكیان دەفەرمێت: خودایە ئەو كەسەی دەبەخشێت پێی ببەخشە، ئەوەی دیكەش دەفەرمێت: خودایە ئەو كەسەی دەگرتەوە لەسەری بگرەوە).

(٢) الوابل الصيب من الكلم الطيب (١\٤٢).

کەواتە با هەنگاوی نوێی ژیانمان زیاتر گرنگیدان بێت بە هەموو کاتێك، بەتایبەت کاتە تایبەتمەندکراوەکان لەهەموویانیش زیاتر بەرەبەیان کە پێشەنگی ژیانی نوێیە لە ڕۆژێکی نوێی تەمەن.

**دووەمیان: ئەو کاتانەی لەبەر ڕووداوەکانی ژیان تایبە تمەندی شەرعی وەردەگرن و بەرەکەت و پیرۆزییان زیاتر دەبێت.**

ئەمانەش جۆرەها شێوازی تایبەتمەندی وەرگرتنی کاتن کە تایبەتمەندییەکە لەئەنجامی بەریەککەوتنی کاری شیاو لە کاتی پێویستدا وەردەگیرێت، لەم شێوازانەش:

**یەکەم: بەریەککەوتنی خۆڕاگری کاتی تەنگانە (نۆێژ ڕاهێنانە بۆ ئەم جۆرە خۆڕاگرییە)**

بە تێڕوانینێك لە ژیاننامەی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) دەبینین ئاماژەیەکی زۆر بۆ ئەم بابەتە کراوە بە چەند نمونەیەك لە ژیاننامەی پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بابەتەکە ڕوون دەکەینەوە:

(نمونەی یەکەم) کاتێك لە نێوان ابوبکر(رضي الله عنه) و یەکێك لە هەڤاڵانی ناکۆکییەك ڕوودەدات بۆ داوای لێبوردن دەگەڕێنەوە بۆ لای پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) وەکو خستنەڕووی ئەم بابەتە گرنگە بەرگری لە أبوبکر (رضي الله عنه) دەکات و دە فەرمێت: «إِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِي إِلَيْكُمْ فَقُلْتُمْ كَذَبْتَ، وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ صَدَقَ، وَوَاسَانِي بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَهَلْ أَنْتُمْ تَارِكُو لِي صَاحِبِي»[1]

---

(١) عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ (رضى الله عنه) قَالَ كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم إِذْ أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ آخِذًا بِطَرَفِ ثَوْبِهِ حَتَّى أَبْدَى عَنْ رُكْبَتِهِ ، فَقَالَ النَّبِىُّ صلى الله عليه وسلم « أَمَّا صَاحِبُكُمْ فَقَدْ غَامَرَ » . فَسَلَّمَ ، وَقَالَ إِنِّى كَانَ بَيْنِى وَبَيْنَ ابْنِ الْخَطَّابِ شَىْءٌ فَأَسْرَعْتُ إِلَيْهِ ثُمَّ نَدِمْتُ، فَسَأَلْتُهُ أَنْ يَغْفِرَ لِى فَأَبَى عَلَىَّ، فَأَقْبَلْتُ إِلَيْكَ فَقَالَ: «يَغْفِرُ اللَّهُ لَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ». ثَلاَثًا، ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ نَدِمَ فَأَتَى مَنْزِلَ أَبِى بَكْرٍ فَسَأَلَ أَثَمَّ أَبُو بَكْرٍ فَقَالُوا: لاَ. فَأَتَى إِلَى النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم ، فَسَلَّمَ فَجَعَلَ وَجْهُ النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم يَتَمَعَّرُ حَتَّى أَشْفَقَ أَبُو بَكْرٍ، فَجَثَا عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ أَنَا كُنْتُ أَظْلَمَ مَرَّتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِىُّ صلى الله عليه وسلم: «إِنَّ اللَّهَ بَعَثَنِى

واتە: (واز لە هەڤاڵەکەم بێنن، خودا منی نارد ئێوە منتان بە درۆخستەوە، ئەبوبەکر بڕوای پێکردم و بە سەروماڵی بەرگری لێکردم). **جێی شاهێد** لە فەرمودەکە جیاوازی کاتی ئیمان هێنان و بەرگریکردنی ئەبوبەکرە(رضي الله عنه) لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ کاتی ئیمان هێنان و بەرگریکردنی هەڤاڵانی دیکە(رضي الله عنهم) لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم).

ئەم بە ئەرك هەڵسان و خۆڕاگرییەی ئەبوبەکر(رضي الله عنه) لە ڕۆژی مردنی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دووبارەبوویەوە، کاتێك گشت هەڤاڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تووشی دلەڕاوکێ ببوون لە ئازاری هەواڵی مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بێجگە لە ئەبوبەکر(رضي الله عنه) کە خۆڕاگربوو و فەرموی: ((أَلاَ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا صلى الله عليه وسلم فَإِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ مَاتَ ، وَمَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ . وَقَالَ ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُمْ مَيِّتُونَ﴾ وَقَالَ ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلاَّ رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِ الرُّسُلُ أَفَإِنْ مَاتَ أَوْ قُتِلَ انْقَلَبْتُمْ عَلَى أَعْقَابِكُمْ وَمَنْ يَنْقَلِبْ عَلَى عَقِبَيْهِ فَلَنْ يَضُرَّ اللَّهَ شَيْئًا وَسَيَجْزِى اللَّهُ الشَّاكِرِينَ﴾ قَالَ فَنَشَجَ النَّاسُ يَبْكُونَ))(١). ئەم جۆرە بە ئەرك هەڵسانە لە کاتە پێویستەکاندا تایبەتمەندی خۆی هەیە، وەکو هەموو بەئەرك هەڵسانێك نییە، خودای پەروەردگار تەنها بە نوخبەیەك لە ئیمانداران دەبەخشێت بە حیکمەتی خۆی، بە پیاوەتیش وەسفیان دەکات و دەفەرمێت: ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٌ ﴾(٢) واتە:(لە ئیمانداران پیاوانێك هەن) مەبەست لێرەدا پیاوەتی ڕەگەز نییە، چونکە ئەم

---

إِلَيْكُمْ فَقُلْتُمْ كَذَبْتَ، وَقَالَ أَبُو بَكْرٍ صَدَقَ، وَوَاسَانِى بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَهَلْ أَنْتُمْ تَارِكُو لِى صَاحِبِى». مَرَّتَيْنِ فَمَا أُوذِىَ بَعْدَهَا. أخرجه البخاري(٣٦٦١)(٤٦٤٠) .

(١) أخرجه البخاري (٣٧١٢ مكنز). بڕوانە: ژمارەی یەکەمی گۆڤاری ئەیوبی (ل٦١ ـ٦٨).

(٢) الأحزاب: ٢٣.





وانەیەی پیاوەتی کە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بە پیاوانی ئوممەتەکەی ڕاگەیاند لە ڕێگای باسکردنی لە کەسایەتی ئەبوبەکر (رضي الله عنه) هەمان وانە بە ژنانی ئوممەتەکەی ڕادەگەیەنێت وەك لە نمونەی دووەمدا دەبینیت:

(نمونەی دووەم) کاتێك پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) باسی خەدیجەی دایکی موسڵمانان دەکات یەکێك لە خێزانەکانی تووشی غیرە دەبێ و قسەی نەخوازراو دەکات و بە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: ((خودا خێزانی باشتری پێ بەخشیوی؟)) پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا دەفەرمێت: ((مَا أَبْدَلَنِي اللهُ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرًا مِنْهَا، قَدْ آمَنَتْ بِي إِذْ كَفَرَ بِي النَّاسُ، وَصَدَّقَتْنِي إِذْ كَذَّبَنِي النَّاسُ، وَوَاسَتْنِي بِمَالِهَا إِذْ حَرَمَنِي النَّاسُ، وَرَزَقَنِي اللهُ عَزَّ وَجَلَّ وَلَدَهَا إِذْ حَرَمَنِي أَوْلَادَ النِّسَاءِ ))[1] واتە: (نەخێر هیچ خێزانێکم لە خەدیجە باشتر نییە، ئەو ئیمانی پێهێنام لە کاتێك کە خەڵك کوفری پێدەکردم، ئەو بڕوای پێهێنام لە کاتێك خەڵك بەدرۆی دەخستمەوە، ئەو بە ماڵی خۆی پشتیدەگرتم کاتێك کە خەڵك پشتی لەمن دەکرد، خوداش تەنها لە خەدیجە منداڵی پێ بەخشیوم) **جێی شاهێد** لەم فەرمودەیەشدا وەك فەرمودەی پێشتر تەنها **کاتە،** لەکاتی پێویستدا خەدیجە(رضي الله عنها) بە ئەرکە گەورەکە هەڵساوە.

---

(١) عَنْ عَائِشَةَ ( رضي الله عنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا ذَكَرَ خَدِيجَةَ أَثْنَى عَلَيْهَا، فَأَحْسَنَ الثَّنَاءَ، قَالَتْ: فَغِرْتُ يَوْمًا، فَقُلْتُ: مَا أَكْثَرَ مَا تَذْكُرُهَا حَمْرَاءَ الشِّدْقِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا خَيْرًا مِنْهَا، قَالَ: (( مَا أَبْدَلَنِي اللهُ عَزَّ وَجَلَّ خَيْرًا مِنْهَا، قَدْ آمَنَتْ بِي إِذْ كَفَرَ بِي النَّاسُ، وَصَدَّقَتْنِي إِذْ كَذَّبَنِي النَّاسُ، وَوَاسَتْنِي بِمَالِهَا إِذْ حَرَمَنِي النَّاسُ، وَرَزَقَنِي اللهُ عَزَّ وَجَلَّ وَلَدَهَا إِذْ حَرَمَنِي أَوْلَادَ النِّسَاءِ )) أخرجه أحمد و صححه محققوا المسند(٤١\٣٥٦ط. المؤسسة).

ئەم دوو نمونەیەش وەکو تەفسیرێکن بۆ ئایەتی: ﴿ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ وَقَـٰتَلَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَـٰتَلُوا۟ ۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ ﴾ (١)

واتە: (ئەو هەڤاڵانەی پێش سەرکەوتن ماڵیان بەخشیوە و جیهادیان کردووە، وەکو ئەوانە نین کە پاش سەرکەوتن ماڵیان بەخشیوە و جیهادیان کردووە، یەکەمینەکان پلەدارترن لای خودا، خودای پەروردگاریش پەیمانی بەهەشتی بە هەردووکیانی داوە).

هۆکاری پلەداریەکەش لای پەروەردگار وەك لەئایەتەکەدا دیارە بۆ **کات** دەگەڕێتەوە، ئەحکامی هەمان کار(بەخشینی ماڵ و جیهاد) پێش سەرکەوتن وەکو پاش سەرکەوتن نییە، چونکە کاتە **زۆر پێویستەکەی** کارەکە لە پێش سەرکەوتن بوو.

پەروردگاریش کە پەیمانی بەهەشت بە هەموویان دەدات، ئەم پەیمانەش ئاماژەیەکە کە ئەوانەی پاش سەرکەوتنیش کاری بەخشین و جیهادیان کردووە بە کاتە **پێویستەکان** گەیشتوون هەرچەندە بە یەکەمینەکان نەگەیشتوون(٢).

ئەم کاتە پێویستانەش بەدرێژایی زەمان دووبارەدەبنەوە، ڕێزدار لای خودای پەروەردگار ئەوەیە لە کاتە پێویستەکاندا بە ئەرکە گەورە و زەحمەتەکان هەستابێت، عومەر(رضي الله عنه) تێگەیشتنێکی بەرزی بۆ ئەم مانایانە هەبوو، هەروەك لە نمونەی سێیەمدا بۆمان دەردەکەوێت:

(نمونەی سێیەم) کاتێك یەکێك لە هەڤاڵە کۆنەکانی عومەر(رضي الله عنه) پرسیاری لێدەکات و دەفەرمێت:

---

(١) الحديد: ١٠.

(٢) ئەمەش پایەیەکی گشت هەڤاڵانی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم)، بۆیە جێی ڕێزن لای موسڵمانان بۆ هەتا هەتا، ئەو موسڵمانەی ڕێزداری ئەمانەی لە دڵیدا کوژابێتەوە بەقەد ئەم کوژانەوەیە لە ئیسلام دوورکەوتووتەوە.

ــ دەم ناسیتەوە؟ (أتعرفني؟)

عومەر(رضي الله عنه) پێی دەفەرمێت :

ــ (نعم آمنتَ إذ كفروا، و عرفتَ إذ أنكروا، و وفيتَ إذ غدروا، وأقبلتَ إذ أدبروا)[١]

واتە: (بەڵێ ئەتناسم، کاتێك خەڵك هەڵگەڕاوە تۆ ئیمانپارێز بووی، کاتێك خەڵك ئینکاری چاکەیانکرد، تۆ چاکەناس بووی، کاتێك خەڵك ناپاکییان کرد تۆ وەفادار بووی، کاتێك لە تەنگانە خەڵك هەڵات و پشتی لە دوژمنکرد تۆ چاونەترس بووی ڕووت لە دوژمن کرد). **جێی شاهێد** لە وەسفی عومەر (رضي الله عنه) بۆ هەڤاڵە کۆنەکەی بریتییە لە بەستنەوەی خەسلەتی بەرز و بڵند بە کاتی زەحمەت و تەنگانە.

**ڕوکنی نوێژ لە ئیسلامەتیدا بە مانا قوولەکانی سورەتی فاتیحەوە ڕاهێنانی موسڵمانە بۆ خۆڕاگری و بە ئەرکی پێویست هەڵسانە لە کاتی تەنگانە و زەحمەتدا، چونکە نوێژ گەورەترین عیبادەتی هزر و جەستەیە کە موسڵمان ئەنجامی دەدات.**

---

(١) الإصابة في تمييز الصحابة لإبن حجر (٦١١٩ ترجمة عدي بن حاتم ـ رضي الله عنه ـ).

و كأن عماداً الكاتب (ت٥٩٧ هـ)أخذ مدح البطل المجاهد شيركوه الأيوبي من قول عمر(رضي الله عنه) لما قال يمتدح بطولاته و جهاده(شفاء القلوب في مناقب بني الأيوب لأحمد بن إبراهيم الحنبلي ص٣١):

سَهرتَ إذا رَقدوا، بَلْ هُجتَ إذا سكنوا وَصُلْتَ إذا جَبَنوا، بَلْ طُلتَ إذا قصروا

## دووەم: بەریەککەوتنی بەخشین و کاتی پێویستی بەخشین (زەکات ڕاهێنانە بۆ ئەم جۆرە بەخشینە)

ئەمەش لە شێوازی یەکەم نزیکە، بەڵام زیاتر پەیوەندی بە لایەنی بەندایەتیکردن بە ماڵ و سەروەتەوە هەیە لە چەند ڕوانگەیەکەوە لەسەری دەوەستین ـ إن شاء الله ـ لەوانە:

(ڕوانگەی یەکەم) **بەخشین لە کاتی نەبوونییەکی گشتی وەك قەیرانە ئابوورییەکان** کە ئایەتی: ﴿أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾[1] ئاماژە پێدەکات، واتە: (خۆراك بەخشین لە ڕۆژێکدا کە گرانی و برسییەتی هەبێت). **جێی شاهێد** لە ئایەتەکە جیاوازیکردنە لە نێوان دوو کات یەکەمیان کاتی هەبوونییە کە تیادا میوانداری و بەخشین کارێکی چاکە، بەڵام وەکو ئەوە نییە کە هەمان کار لەکاتی نەبوونی بکرێت ﴿فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ﴾ ئەمە تایبەتمەندی خۆی هەیە.

(ڕوانگەی دووەم) **بەخشین لە کاتی نەبوونییەکی تایبەت** کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێدەکات دەفەرمێت: (( ثَلاَثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَدْ جَمَعَ الإِيمَانَ الإِنْصَافُ مِنْ نَفْسِكَ ، وَبَذْلُ السَّلاَمِ لِلْعَالَمِ ، وَالإِنْفَاقُ مِنَ الإِقْتَارِ))[2]. **جێی شاهید:** ((وَالإِنْفَاقُ مِنَ الإِقْتَارِ)) واتە: بەخشین لە کاتێکدا کە مرۆڤ هەژاربێت و ببەخشێت جیاوازە لە بەخشینی کاتی دەوڵەمەندی و هەبوونی، چونکە بەخشین **کاتی** نەبوونی و هەژاری زیاتر سەلماندنی ئیمان وگومانی باش بردنە بە خودای پەروەردگار.

---

(١) البلد: ١٤ .

(٢) علقه البخاري في صحيحه موقوفاً على عمار بن ياسر ( رضي الله عنه) و له أسانيد مرفوعة حسَّنها الحافظ بالشواهد في تغليق التعليق(٢\٣٦) وذكر في فتح الباري (١\١٥٥ ـ ١٥٦ ط. طيبة): إن مثله لا يقال بالرأي فهو في حكم المرفوع و لأنه يشبه أن يكون كلام من أوتي جوامع الكلم.

(ڕوانگەی سێیەم) **دەستپێشخەری لە بەخشین لە کاتی پێویستدا**، بەڵگەی ئەمەش فەرمودەی (جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ) یە کە دەفەرمێت : (( جَاءَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَلَيْهِمُ الصُّوفُ فَرَأَى سُوءَ حَالِهِمْ قَدْ أَصَابَتْهُمْ حَاجَةٌ فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ فَأَبْطَئُوا عَنْهُ حَتَّى رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ - قَالَ - ثُمَّ إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ مِنْ وَرِقٍ ثُمَّ جَاءَ آخَرُ ثُمَّ تَتَابَعُوا حَتَّى عُرِفَ السُّرُورُ فِي وَجْهِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَىْءٌ وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَىْءٌ » [(١)] .

واتە: (خەڵکانێکی دەشتەکی هەژار بە جلوبەرگێکی بێسەروبەر لە نەبوونیا بۆ لای پێغەمبەرمان (صلی اللە علیه وسلم) هاتن، پێغەمبەرمان (صلی اللە علیه وسلم) کە حاڵیانی بینی هانی خەڵکیدا بۆ بەخشین، خەڵکەکەش دەستپێشخەرییان نەکرد، تاوەکو ئازارەکە لە دەمو چاوی پێغەمبەرەوە (صلی اللە علیه وسلم) بینرا، لە پاشان کەسێکی ئەنصاری هات کیسێك زیوی هێنا، لە دوای ئەویش کەسێکی تر لەپاشان خەڵکەکە بە تێکڕا دەستیان بە بەخشینکرد، تاوەکو دەموچاوی پێغەمبەرمان(صلی اللە علیه وسلم) گەشایەوە و فەرمووی: هەرکەسێ سونەتێکی چاکە لە ئیسلامدا بکات ـ دەستپێشخەر بێت لە چاکەکاری ـ ئەوا ئەوانەی دوای ئەو سونەتەکە دەکەن پاداشتەکەیان بۆ دەست پێشخەرەکە دەگەڕێتەوە بێئەوەی لە پاداشتیان کەم بێت و هەرکەسێکیش سونەتێکی خراپ لە ئیسلامدا بکات ـ دەست پێشخەربێت لە خراپەکاری ـ ئەوا ئەوانەی دوای

(١) رواه مسلم (١٠١٧) و الترمذي (٢٦٧٥) و غيرهما.

ئەو سونەتەکە دەکەن سزاکەیان بۆ دەست پێشخەرەکە دەگەڕێتەوە بێئەوەی لە سزاکانیان کەم بێت).

**جێی شاهێد** لە فەرموودەکە ئاماژەی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم) کە دەست پێشخەر لە چاکەکاریدا جیاوازە لە چاولێکەرانی، چونکە لە **کاتە** زۆر پێویستەکە بە کارە زەحمەتەکە هەستاوە بە کردنەوەی دەرگای گەیاندنی پێویستییەکە، پێویستییەکەی گەیاندووە و زەحمەتەکەی شکاندووە، کە ئەمە نەك بە هەموو کەس، بەڵکو بە هەمو ئیمانداریێکیش ناکرێت ﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ﴾[1] !

**ڕوکنی زەکاتیش لە ئیسلامەتیدا ڕاهێنانە بۆ بەرزکردنەوەی موسڵمان تاوەکو لەئاستی ڕووبەڕووبوونەوەدا بێت لە کاتە پێویستەکاندا، فەشەل بە بیرۆکەی (رأس المال جبان) بهێنێت، بەڵکو لە کاتە تەنگانە و نەخوازراوەکاندا چرا بێت بۆ هەژار و لێقەوماوان بەوەی کە هەیەتی.**

❊❊❊

---

(١) الأحزاب:٢٣.

پوختەی ئەم دوو خاڵە کە گەورە ڕوکنەکانی ئیسلام (نوێژ، زەکات) لێی هەڵدەقوولێن، بەڵکو پوختەی ئەم بنەمایە بەگشتی بریتییە لە ئەنجامدانی کاری پێویست لە کاتی پێویست، زانایانمان ئایەتی ﴿ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَـٰمُوسَىٰ ﴾[١] بە بەڵگە و بناغەی ئەم بنەمایە دادەنێن، ابن قیم (رحمه الله) ئیقراری ئەمە دەکات و دەفەرمێت: دیارکردنی پەروەردگار بۆ **کاتی** هاتنی موسا(علیه السلام) لەو بارەدا بوو کە خەڵکان بۆ هاتنی زۆر پێویست بوون[٢].

**قال ابن القيم رحمه الله في (مدارج السالكين):** «إِنَّ الشَّيْءَ إِذَا وَقَعَ فِي وَقْتِهِ الَّذِي هُوَ أَلْيَقُ الْأَوْقَاتِ بِوُقُوعِهِ فِيهِ: كَانَ أَحْسَنَ وَأَنْفَعَ وَأَجْدَى، كَمَا إِذَا وَقَعَ الْغَيْثُ فِي أَحْوَجِ الْأَوْقَاتِ إِلَيْهِ».

و هەروەك چۆن کاتە تایبەتەکان گرنگی خۆیان هەیە، بە هەمان شێوە کۆکردنەوەی تواناکان لە هەمانکاتدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە کە لە بنەمای حەفتەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

---

(١) طه: ٤٠.

(٢) قال رحمه الله في مدارج السالكين (١٥٣\٣): (وَجْهُ اسْتِشْهَادِهِ بِالْآيَةِ: أَنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ قَدَّرَ مَجِيءَ مُوسَى أَحْوَجَ مَا كَانَ الْوَقْتُ إِلَيْهِ. فَإِنَّ الْعَرَبَ تَقُولُ: جَاءَ فُلَانٌ عَلَى قَدَرٍ. إِذَا جَاءَ وَقْتَ الْحَاجَةِ إِلَيْهِ. قَالَ جَرِيرٌ:

نَالَ الْخِلَافَةَ إِذْ كَانَتْ عَلَى قَدَرٍ ... كَمَا أَتَى رَبَّهُ مُوسَى عَلَى قَدَرِ )

## بنەمای حەفتەم:

## کاری بەکۆمەڵ و کۆکردنەوەی تواناکان لە یەك کاتدا

ئەمەش چەند شێوازێکی هەیە کە هەر یەکەیان لەوەی دیکە جودا نابێتەوە و دەتوانین بۆ سێ جۆرەکار پۆلێنیان بکەین کە ئەمانەن:

یەکەم: کارە عەقلییەکان

دووەم: کارە مادییەکان

سێیەم: کارە رۆحییەکان

کۆکردنەوەی هێزە ئەنجامدەرەکانی ئەم سێ کارە لە هەر کۆمەڵگایەکدا رێگای پێشکەوتنی کۆمەڵگایەکەیە، لێرەشدا بە پوختەیی لە روانگەی ئیسلامەوە باسیان دەکەین ـ إن شاء الله ـ:

### یەکەم: کۆکردنەوەی هێزە عەقلییەکانی موسڵمانان لە یەك کاتدا

#### مەشورەت ( الشوری )

لە قوناغی سەرەتایی خوێندن بابەتێکی وانەی کوردی هەبوو بەناوی: (برا لە پشت برا بێت مەگەر قەزا لە لای خودا بێت) کە پوختەکەی: (چیرۆکی باوکێکە کە ویستی کورەکانی تاقی بکاتەوە بە شکاندنی گورزە دارێك، بەڵام کاتێك تاك تاك هەوڵی شکاندنی گورزە دارەکە دەدەن کەسیان ناتوانێت بیشکێنێت. کاتێك گورزە دارەکە پەرت دەکرێت و هەر دارێکی بە برایەك دەدرێت بەئاسانی دارەکان دەشکێنرێن، گورزەکە ئەشکێنرێت...) ئەم چیرۆکە لە چەندین روویەوە باس لەوە دەکات کە هێز لە کاری هەرەوەزی و یەکێتیدایە. بەڵام ئەمە تەنها وانەیەکی هێزە ماسولکەیەکانی جەستە نییە، کە بە کۆبوونەوەی چەند کەسێك هێزەکە زیاد دەبێت، بەڵکو گەورەترین وانە لەم چیرۆکە کۆکردنەوەی هێزە عەقلییەکانە، کاتێك چەند کەسێك پێکەوە لە

کارێك بیردەکەنەوە دەتوانن بە جوانتر و بە ئاسانتر و بە دەرئەنجامی بەسوودتر کارەکە بە جێبگەیەنن، هەروەها بەهێزتر و شکۆدارتر کارەکە بپارێزن، ئەمەش بیرۆکەی مەشورەتە کە ئەوپەڕی جوانی بیرکردنەوەی عەقلە و شەریعەتیش مەدح و سەنای دەکات لە چەندین ئایەت و فەرمودەدا لەوانە: پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات (صلی الله علیه وسلم) کە مەشورەتی هەڤاڵانی بکات: ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ﴾[1] و لە دەیان ڕووداودا پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) مەشورەتی هەڤاڵانی دەکرد[2] هەروەها پەروەردگار مەدح و سەنای هەڤاڵان (رضي الله عنهم) دەکات بەوەی کە مەشورەت دەکەن لە ناو خۆیاندا: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ﴾[3] و لە دەیان ڕووداودا نهێنی سەرکەوتنیان مەشورەت بووە[4] .

**جێی شاهێد** لەمەی باسکرا تەنها ئەوەیە کە بڵێین: **مەشورەت کۆکردنەوەی هێزە عەقلییەکانە لە یەك کاتدا**. بۆیەش زۆرجار دەرچوون لە ئاستەنگێکی کۆمەڵایەتی یان هەڵسەنگاندنی کارێکی پەروەردەیی یان بڕیاردان لە هەر پڕۆژەیەکی ژیان لەوانەیە بە زۆری بیرکردنەوەی تاك لایەنی مرۆڤ نەگاتە ئەنجامی ڕاست، بەڵام مەشورەت ڕێگاکەی بۆ کورت دەکاتەوە و دەگەیەنێتە پێکانی بڕیار لە ماوەیەکی کورتدا و بە ماندووبوونێکی کەمتر.

---

(١) آل عمران:١٥٩

(٢) ينظر: تفسير ابن كثير الآية ١٥٩ من سورة (آل عمران) و ماذكره من مشاورات الرسول (صلى الله عليه وسلم) مع أصحابه.

(٣) الشورى: ٣٨.

(٤) ينظر: النبذ في طلب العلم (ص٣٣٢ ـ ٣٣٤ ط. الدار الأثرية) تأليف حمد العثمان.

هەر بۆیەش پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) کەسی مەشورەت لێکراو ئاگاداردەکاتەوە لە تاوانی ناپاکی لە دەربڕینی بۆچوونەکەی و دەفەرمێت: (وَمَنِ اسْتَشَارَهُ أَخُوهُ الْمُسْلِمُ، فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِغَيْرِ رُشْدٍ، فَقَدْ خَانَهُ)[١] واتە: (هەرکات مەشورەت لێکراو بە پێچەوانەی ڕاستییەکان و بەنەزانینەوە مەشورەت بداتە ئەو کەسەی کە داوای مەشورەتی لێ کردووە ئەوا خیانەتکارە)، پەروەردگاریش ڕێنمایی خاوەن پیلانی خیانەت ناکات و لە سەر زاری خێزانی عزیزی میسر دەفەرمێت: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ﴾[٢].

هەروەها پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) نەهی لە موسڵمانان دەکات کە داوای **یارمەتی ماددی** لە کەسانی دیکە بکەن (وأن لا تَسْأَلُوا النَّاسَ شَيْئاً)[٣]، بەڵام هانی موسڵمان دەدات بۆ داوای **یارمەتی عەقلی** بە مەشورەت وەرگرتن، کە جۆرێکە لە داواکاری یارمەتی، بەڵام ئەم داواکارییە لە بابەتی زانست و زانیارییەوە کارێکی خوازراوە لە عەقل و شەرعدا، بەڵکو بنەمایەکی گرنگی ئیجتیهادە لە شەرعدا لەسەر ئەم بنەمایە ئیمامی شافعی (رحمە الله) بۆ ئەوە دەچێت کە گوتنەکانی هەر سێ خەلیفەی ڕاشدی (رضي الله عنهم) وەکو حوججە تەماشادەکرێن بێجگە لە علی (رضي الله عنه)، چونکە لەکاتی خەلافەتی علی(رضي الله عنه) زۆربەی هەڤاڵانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە ئەهلی مەشورەت کۆچی دواییان کردبوو، دووبەرەکیش سەری هەڵدابوو لە نێو موسڵماناندا، تواناکانی مەشورەت وەکو زەمانی

---

(١) رواه أحمد في المسند (١٤\١٧) و يشهد له قوله (صلى الله عليه وسلم) : (المستشار مؤتمنٌ) ينظر: مشكل الآثار للطحاوي(١١\٧٩).

(٢) يوسف: ٥٢.

(٣) أخرجه النسائي (٤٦٤ مكنز).

سێ خەلیفەکەی پێشتر نەمابوو[١]. تەنانەت (عبيدة الله السلماني) کە قوتابییەکی بەڕێزی ئیمامی علی یە (رضي الله عنه) لە مەسەلەیەکی فیقهی کە ئیمامی علی (رضي الله عنه) دوو بۆچوونی هەبووە کۆن و نوێ بە ئیمام علی (رضي الله عنه) دەفەرمێت: (رأيُكَ مَعَ رَأيِ عُمَرَ في الجَماعَةِ أَحَبَ إِلَيْنَا مِنْ رَأيِكَ وَحْدَكَ في الفُرْقَةِ)[٢] واتە: بۆچوونەکەت لەگەڵ عومەر (رضي الله عنه)کاتی جەماعەت لای ئێمە باشترە لە بۆچوونەکەت بە تەنها لە کاتی دووبەرەکی[٣] .

هەر لەم بارەیەوەش زۆر لەزانایان بۆ ئەوە دەچن کە: بۆچوونە کۆنەکانی شافعی (رحمه الله) لە بەغدا باشترن لە بۆچوونە نوێیەکانی لە میسر، چونکە شافعی(رحمه الله) لە بەغدا بە زانایانی وەکو خۆی دەورەدرابوو، بەڵام لە میسر کەسی لێهاتووی وەکو خۆی لەگەڵ نەبوو[٤]! جێی شاهێدیش: کۆبوونەوەی هێزە عەقلییەکانە لە هەمان کاتدا کە بەرەکەت و ڕێنیشاندەرن بۆ کۆمەڵگا لە گشت بوارەکانیدا.

ئەمەی باسکرا یەکێکە لە حیکمەتەکانی فەرمودەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دێتە بەرچاومان کە دەفەرمێت: (باشترین خەڵك خەڵکی سەردەمی منە پاش ئەوانیش ئەوانەی دوای ئەوان، پاش ئەوانیش ئەوانەی دوای ئەوان) (خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ)[٥] چونکە هێزە عەقلییەکان و توانا زانستییەکان لە

---

(١) ينظر: الفكر السامي في تأريخ الفقه الإسلامي للفاسي(١\١٤٣ ط. المدينة).

(٢) أخرجه عبد الرزاق في المصنف(٧\٢٩١) والبيهقي في السنن الكبير(١٠\٣٤٨) صحح إسناده ابن حجر في تلخيص الحبير(٤\٢١٩).

(٣) ينظر: الفكر السامي في تأريخ الفقه الإسلامي (١\٢٥٧).

(٤) ينظر: مناقب الإمام أحمد لإبن الجوزي (ص٦٦٤ ت.التركي).

(٥) رواه البخاري

سەردەمی ئەودا زیاتربوون لە سەردەمی هەڤاڵانی و لە سەردەمی هەڤاڵانی دوای ئەویش زیاتربوون لە سەردەمی شوێنکەوتووانیان .

جێگای سەرنجیش لە بابەتی کۆکردنەوەی هێزە عەقلییەکاندا (مشورەت) ئەوەیە کە ئەم بابەتە مرۆڤایەتی لەسەری یەکڕایە و مێژووی هەر شارستانیەتێکیش بخوێنی دەبینی ڕابەرەکانیان هانی مەشورەت دەدەن و نهێنی سەرکەوتنیان بۆ مەشورەت دەگەڕێتەوە.

**عومەری کوڕی خەطاب ( رضي الله عنه ) دەیفەرموو:**

**( بۆچوونی کەسێك وەکو پەك داو وایە، بۆچوونی دوو کەسیش وەکو دوو داوە، بەڵام بۆچوونی سێ کەس پەتێکە پسانی زەحمەتە ).**

**ئەسکەندەری مەکدونی بە یەکێك لە سەرکردەکانی دەفەرمێت:**

**( پشت لە بۆچوونی چاك مەکە لەبەر خراپی خاوەنەکەی، مەلەوان چەند کەسێکی خراپ بێت، خراپییەکەی هیچ لە نرخی ئەو لوئلوئە کەمناکاتەوە کە لە بنی دەریا دەریدەهێنێت ).**

**ئەنەوشێروانی فارسی دەیفەرموو:**

**( نابینرێت هیچ شتێك وەکو مەشورەت ڕێگا بێت بۆ دیتنەوەی ڕاستی ).**

(آداب الملوك للثعالبـي ص ٩٢ ، ٧١ ، ٦٩)

(و ينظر: سراج الملوك للطرطوشي ص١٤٥ ـ ١٥١ )

## دووەم : کۆکردنەوەی هێزە مادییەکانی موسڵمانان لە یەك کاتدا

### کاری دامەزراوەیی( زەکات ـ وەکو نمونە ـ )

فەریزەی زەکات وەکو نمونە بەسە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە، کە پەروەردگار لە ئایەتی مەصاریفی زەکاتدا جەخت لە کاری هەرەوەزی ئەم فەریزەیە دەکات و دەفەرمێت: ﴿وَٱلۡعَـٰمِلِينَ عَلَيۡهَا﴾[١] واتە ئەوانەی لە سەری کاردەکەن چ بەکۆکردنەوەی یان بە دابەشکردنی، ئەمەش پەیامێکە موسڵمانان ئاگاردارەدەکاتەوە لە پێویستی کاری دامەزراوەیی بۆ یەکخستنی هێزە مادییەکان لە یەك کاتدا، کە ساڵانە حکومەتێکی دادپەروەر بەڕێوەی دەبات، بۆ ڕزگارکردنی کۆمەڵگا لە هەژاری و گەیاندنی هێزە مادییەکان بۆ جێی مەبەست و پەرەپێدانیان[٢].

کاتێك لە وڵاتی موسڵماناندا حکومەتەکان پشت لەم ئەرکە دەکەن یان متمانەیان نامێنێت لە بەڕێوەبردنی ئەم ئەرکە پیرۆزە، ئەوا پێویستە ڕێکخراوە ناحکومییەکان یان هەر دەزگایەکی کاری هەرەوەزی ئەم ئەرکە ئاینییە پیرۆزە بەجێبگەیەنێت، کە یەکخستنی هێزە مادییەکانی کۆمەڵگایە و پاراستنیانە لە بەفیڕۆچوون و پەرەپێدانیانە بۆ زیادبوون و گەیاندنیانە بۆ جێی مەبەست، لە کاتی پێویستدا. بەڕاستیش جێی داخە کە لەم بارەیەوە ـ کاری هەرەوەزی ناحکومی ـ ئەوروپییەکان زۆر لە پێش ئێمەی موسڵمانن لە ئەمڕۆماندا، بەڵکو لەم بارەیەوە ئەوان هەڵگری ئیسلامن نەك ئێمە[٣] خودا ڕێنماییمان بکات بۆ هەموو چاکەیەك!

---

(١) التوبة : ٦٠ .

(٢) ينظر: كتاب فقه الزكاة (فصلٌ بعنوان: العاملون عليها أو الجهاز الإداري و المالي للزكاة) (٢\٥٧٩ ـ ٥٩٣) تأليف الدكتور يوسف القرضاوي. قال فيه: إن الزكاة في الإسلام ليست وظيفة موكولة إلى الفرد وحده، وإنما هي وظيفةٌ من وظائف الدولة، تشرف عليها و تدبر أمرها، و تعين لها من يعمل عليها ...

(٣) ينظر: مذاكرات محمد كرد علي (٤\١٠٤٣) و كلمات طيبة تحت عنوان (داء الإتكال).



## سێیەم: کۆکردنەوەی هێزە ڕۆحییەکانی موسڵمانان لە یەك کاتدا

### ( نوێژی جەماعەت وەکو نمونەیەك )

نوێژی موسڵمانان پەیوەندییەکی زۆری بەکاتەوە هەیە تەنانەت کاتە دیاریکراوەکانی نوێژ، ڕوکنی نوێژن: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا﴾(١) هەر لەبەر ئەم گرنگییەش نوێژەکان بەکات ناودەبرێن: (نوێژی بەیانی، نوێژی خۆرهەڵات، نوێژی نیوەڕۆ، ... ،شەونوێژ ...هتد) ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەرنامەیەکی ڕێکخستنی کاتە، دووبارە شەحنکردنەوەی هێزە ڕۆحییەکانی تاکی موسڵمانە لەم کاتانەدا.

لێرەدا جێی مەبەست ئەوەیە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانی ئەوە دەدات کە ئەم هێزە ڕۆحییانە کۆبکرێنەوە لە یەك کاتدا ئەویش نوێژی جەماعەتە، بەمە ئەم هێزە ڕۆحییانە چەندجارە دەبنەوە لە ئەنجامی کۆبوونەوەیان لە هەمان کاتدا، ئەمەش کارێکی هەستپێکراوە لای ئەو کەسانەی کە نوێژەکانیان بە جەماعەت ئەنجامدەدەن.

دەتوانین بڵێین تەنها ئەوان ئەو ئایەت و فەرمودانە بە تەواوی تێدەگەن کە هانی نوێژی جەماعەت دەدەن لەوانە ئایەتی:﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴾(٢) و فەرمودەی: (صَلَاةُ الْجَمِيعِ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ خَمْسَةً وَعِشْرِينَ ضِعْفًا كُلُّهَا مِثْلُ صَلَاتِهِ) (٣). بەڵکو هانی موسڵمانان دەدەن کە سەفەربکەن بۆ سێ مزگەوتی (مەککە، مەدینە، قودس): « لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ، وَمَسْجِدِ الرَّسُولِ – صلى الله عليه وسلم – وَمَسْجِدِ الأَقْصَى »(٤) و چەندجارەبوونی نوێژ

---

(١) النساء: ١٠٣ .

(٢) البقرة : ٤٣ .

(٣) أخرجه البخاري و أحمد (٣٥٦٧) و اللفظ له .

(٤) متفقٌ عليه.

لەم مزگەوتانە (صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنْ الْمَسَاجِدِ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ وَصَلَاةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ صَلَاةٍ فِي هَذَا)(١) یەکێك لە حیکمەتەکانی کۆکردنەوەی هێزە ڕۆحییەکانە لە هەمان کات و شوێندا و تەنها ئەو موسڵمانانەی کە حەج و عومرە ئەنجامەدەن سەردانی ئەم مزگەوتانە دەکەن وەکو پێویست هەست بە کۆبوونەوەی ئەم هێزە ڕۆحییانە دەکەن لەم مزگەوتانەدا.

ئەمەی لە نوێژی جەماعەت باسکرا هەمان شتە سەبارەت بە کۆبوونەوەی بەڕۆژووبوونی موسڵمانان لە یەك کاتدا کە مانگی ڕەمەزانە یان حەجکردنیان لە یەك کاتدا کە مانگی حەج کردنە (ذي الحجة).

ئەمەش لایەنێکی گەورەی ئیسلامە کە هێزی ئیمان لە تاك و کۆمەڵگادا بەرزتر دەکاتەوە و مرۆڤی موسڵمان دەکاتە خاوەن دڵێکی زیاتر ئاسوودە و کۆمەڵگای موسڵمانان زیاتر بەرەو بەختەوەری و ئاسوودەیی دەبات.

هەروەها وەگەڕخستنەوەی کاتەکانی ڕابردووش هەنگاوێکی دیکەی بەختەوەری و ئاسوودەییە کە لە بنەمای هەشتەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

---

(١) رواه أحمد (١٦١١٧) و أصله في الصحيحين.



## بنەمای هەشتەم:

## وەگەڕخستنەوەی کاتی ڕابردوو! ( إستدراك الوقت الفائت )

لە کۆتاییەکانی سورەتی فورقان پێش ئەوەی پەروەردگار باسی سیفەتەکانی پیاوچاکان بکات(عباد الرحمن) دەفەرمێت : ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا ﴿٦٢﴾﴾ واتە: خودای پەروەردگار ڕۆژ و شەوی بەشوێن یەکدا ڕێکخستووە بۆ کەسێك کە بیەوێت زیکر و شوکرانە بکات، (عمر بن الخطاب ـ رضي الله عنه ـ) و (عبدالله بن العباس ـ رضي الله عنهما ـ) و زۆر لە زانایانی پێشین بۆ ئەوە دەچن: کە لە مەبەستەکانی ئایەتەکە گەڕاندنەوەی کاتە بە گەڕاندنەوەی ئەو چاکەکارییەی کە کاتەکەی شەو بووە، بەڵام لەبەر هۆکارێك نەکراوە، خاوەنەکەی بە ڕۆژ چاکەکارییەکە ئەنجام دەداتەوە یان کاتەکەی ڕۆژ بووە لە بەر هۆکارێك نەکراوە، خاوەنەکەی بە شەو دەگەڕێنێتەوە[1] ئەمەش وانەیەکی پاراستنی کاتە بە گەڕاندنەوەی کاری چاکە کاتێك بەهۆی هۆکارێکەوە لە کاتی دیاریکراودا ناکرێت و پەروەردگار بەم ئایەتە ڕێنماییمان

---

(١) قال ابن كثير في تفسير آية الفرقان (رقم:٦٢): وَقَوْلُهُ: ﴿لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ أَيْ: جَعَلَهُمَا يَتَعَاقَبَانِ، تَوْقِيتًا لِعِبَادَةِ عِبَادِهِ لَهُ، فَمَنْ فَاتَهُ عَمَلٌ فِي اللَّيْلِ اسْتَدْرَكَهُ فِي النَّهَارِ، وَمَنْ فَاتَهُ عَمَلٌ فِي النَّهَارِ اسْتَدْرَكَهُ فِي اللَّيْلِ. وَقَدْ جَاءَ فِي الْحَدِيثِ الصَّحِيحِ: (( إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ، وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ)).قَالَ أَبُو دَاوُدَ الطَّيَالِسِيُّ: حَدَّثَنَا أَبُو حُرَّة عَنِ الْحَسَنِ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ أَطَالَ صَلَاةَ الضُّحَى، فَقِيلَ لَهُ: صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ؟ فَقَالَ: إِنَّهُ بَقِيَ عَلَيَّ مِنْ وِرْدِي شَيْءٌ، فَأَحْبَبْتُ أَنْ أُتِمَّهُ(أَوْ قَالَ: أَقْضِيهِ) وَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾. وَقَالَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَلْحَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضي الله عنهما) في الآية يَقُولُ: مَنْ فَاتَهُ شَيْءٌ مِنَ اللَّيْلِ أَنْ يَعْمَلَهُ، أَدْرَكَهُ بِالنَّهَارِ، أَوْ مِنَ النَّهَارِ أَدْرَكَهُ بِاللَّيْلِ. وَكَذَا قَالَ عِكْرِمَةُ، وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ. وَالْحَسَنُ.

دەكات بۆ ئەنجامدانی، ئەمەش خۆی لەخۆیدا مانایەكە لە ماناكانی گەڕاندنەوەی كات بە گەڕاندنەوەی چاكەكردنێك كە پێشتر لەدەستچووە بەهۆی هەرهۆكارێك بێت.

كاتێك پەروردگار پاش ئەم ئایەتە باسی سیفاتی (عباد الرحمن) دەكات، ڕێنماییمان دەكات بۆ چەند خاڵێك لەوانە:

**یەكەمیان:** گەڕاندنەوەی كارێكی چاكە كە لە كاتی خۆیدا نەكرابێت لە بەر هۆكارێك سیفەتێكە لە سیفەتەكانی پیاوچاكان (عباد الرحمن).

**دووەمیان:** تەوبەكردنی خاوەن تاوان بۆ ئەم بنەمایە دەگەڕێتەوە، بە ئەندازەی مەرجەكانی تەوبە[1]، بەرزی تەوبە لەدڵدا كاتە ڕابردووەكانی تاوان كە شایستەی سزان، دەگۆڕێتەوە بە چاكە و پاداشت، پەروەردگار لەكۆتایی باسكردنی سیفەتەكانی (عباد الرحمن)دا دەفەرمێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴾[2] واتە:(ئەمانە بێجگە لە خودا كەس بەخودا نازانن كە لێیانبپاڕێنەوە، كەسیش ناكوژن كە خودا كوشتنی حەرامكردبێ مەگەر بەحەق نەبێت، و زینا ناكەن،

---

(١) مەرجەكانی تەوبە:

١ ـ دەست هەڵگرتن لە تاوانەكە.

٢ ـ دەست هەڵگرتنەكە تەنها لە پێناوی خودادا بێت.

٣ ـ پەشیمان بوون لەوەی كە كردوویەتی.

٤ ـ نیەت هێنان پڕ بەدڵ كە بۆ تاوانەكە نەگەڕێتەوە.

٥ ـ ئەگەر تاوانەكە حەقی كەسێكی تیادابێت حەقەكە بۆی بگەڕێنێتەوە.

٦ـ تەوبەكردنەكە لەكاتی تەوبە قەبوولبووندا بێت.

بۆ زیاتر بڕوانە: (ریاض الصالحین بشرح الشیخ محمد بن صالح العثیمین ـ رحمه الله ـ ١\٨٥ ـ٩٧) .

(٢) الفرقان :٦٨ ـ ٦٩.

ئەوەی ئەم کارانە دەکات (پاڕانەوە لە بێجگە لە خودا۔ کە شیرکە ۔، تاوانی قەتل ۔ لە تاوانە گەورەکانە(الکبائر) ۔، تاوانی داوێن پیسی ۔ لە تاوانە گەورەکانە(الکبائر) ۔ تووشی سزای خودا دەبێت) و لە دوای ئەم ئایەتە پڕ گەف و گوڕە، پەروەردگار باسی ڕەحمەتی خۆی دەکات بە تاوانبار و ڕێنمایی دەکات بۆ تەوبە و دەفەرمێت: ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[1]: واتە: (بێجگە لەوانەی تەوبەیان کردووە لەم تاوانانە و ئیمان و کاری باشیان ئەنجامداوە، ئەمانە خودای پەروەردگار تاوانەکانی پێشتر بۆیان دەگۆڕێت بە چاکە، خودا لێبوردە و میهرەبانە ) وبێگومان تەوبەکردنیش لە خراپە گەورەترین چاکەیە، کە کاتە لەدەست چووەکان بە جوانترین شێوە زیندوودەکاتەوە، خودا پشت و پەنامانبێت بۆ بەردەوامی تەوبەکردن.

**قال رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) :**

« إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا » رواه مسلم

لەکۆتایی ئەم بنەمایەش پێویستە بزانرێت کە هەروەك چۆن کاتەکانی ڕابردوو لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بەگەڕدەخرێنەوە، هەمان شت لەڕوانگەی ئیسلامەوە دەتوانی کاتەکانی نەهاتووی دوارۆژ بەگەڕبخەین و(کات) لە کۆگادابنێین بۆ دوارۆژ! وەك لە بنەمای نۆیەمدا باسی دەکەین ۔ إن شاء الله ۔

---

(١) الفرقان : ٧٠.



## بنەمای نۆیەم:

## لە کۆگا دانانی کات!( تخزين الوقت )

## وەگەڕخستنی کاتی داهاتوو ( إستخدام وقت المستقبل )

بێگومان کات وەستانی نییە، کەواتە مەبەست لە بەکۆگاکردنی(تخزين)کات دەبێ چی بێت!؟ یان چۆن دەتوانین کاتی نەهاتوو بەگەڕبخەین!؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە ناو چەند فەرمودەیەکی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بەرچاومان دەکەوێت کە هانی موسڵمانان دەدەن بۆ لە کۆگادانانی کات و وەگەڕخستنی کاتی داهاتوو بە چەند شێوازێك لەوانە:

**یەکەمیان: بەجێهشتنی: ( وەقف ) ( زانست و زانیاری ) ( منداڵی صالح ) پاش مردن**

واتە: بەجێهێشتنی موسڵمان بۆ شتێك پاش مردنی کە بەهۆیەوە کردەوە چاکەکانی لە بەردەوامیدابن. وەك لە فەرمودەدا هاتووە: ((إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ صَدَقَةٌ جَارِيَةٌ وَعِلْمٌ يُنْتَفَعُ بِهِ وَوَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ))[(١)] واتە: ئەگەر مرۆڤ مرد لەکاری چاکەکاری دادەبڕێت سێ شت نەبێت:

**یەکەمیان:** صەدەقەیەکی بەردەوام ـ نمونەی وەکو: مولکێکی وەقف کردبێت کە داهاتەکەی بۆ هەژاران بێت یان بۆ جێی پێویست، کیتابی سوودبەخشی لە پاشەخۆی بەجێهشتبێ چ بەچاپدان یان نووسین ... هتد.

**دووەمیان:** زانستێکی پیشانی کەسێك دابێت یان سوننەتێکی مردووی زیندووکردبێتەوە...

**سێیەمیان:** منداڵێکی صالحی هەبێت دوعای بۆ بکات.

ئەم سێ شتە بریتین لە مانەوەی کاتی چاکەکاری پاش مردن!

(١) أخرجه مسلم (١٦٣١) و الترمذي(١٣٧٦) و غيرهما.

کەواتە مرۆڤ دەتوانێت لە کاتی ئێستای ژیان پاشەکەوتی کات بکات بۆ دوای ژیان، ئەمەش وەکو بەکۆگاکردنی کاتە یان وەگەڕخستنی کاتێکە لە داهاتوودا، کە بەردەوامی دەداتە بەرهەم هێنانی چاکە پاش مردن.

**دووەمیان : ( سوننەی حەسەنە )**

بریتییە لە دەستپێشخەری چاکەکاری لە کاتی تەنگانە، کە کەسە دەستپێشخەرەکە دەبێتە نمونە بۆ ئەوانی تر کە هەمان کار ئەنجام بدەن (وەکو باسکرا لە بنەمای شەشەمدا).

جێی شاهێدیش چاولێکراو پاداشتی هەموو ئەو کەسانە وەردەگرێت کە چاویان لەو کردووە بۆ چاکەکاری (مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ)[1] بەمە دەستپێشخەر لە چاکەکاری توانیویەتی بێ ئەوەی کاری ئەوان بکات پاداشتی ئەوان وەربگرێت، کەواتە توانیویەتی بەقەد ژمارەی ئەوانەی چاویان لێکردووە کاتی پڕ چاکەکاری وەدەست بهێنێت، ئەم کاتانەش زیادەن لە تەمەنی دیاری کراوی مرۆڤ کە لەوانەیە پاش مردنی مرۆڤیش بەدەیان ساڵ بەهۆیانەوە چاکەکاریەکانی بەردەوام بن . داواکارین لە خودای پەروەردگار کە لەوانەبین کە سوننەت نوێ دەکەنەوە و دەستپێشخەربین لە چاکەکاریدا.

---

(١) پێشتر تەخریجکراوە، هەندێك برا ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە کە (بیدعە حەسەنە) لە دیندا هەیە و بە تەماشاکرنی هۆکاری گوتنی فەرموودەکە (سبب الورود) پۆچەڵی ئەم بۆچوونە دەردەکەوێت.

قال الحافظ ابن حجر في الفتح (١٣\٢٧٨): « **وَأَمَّا الْبِدَعُ فَهُوَ جَمْعُ بِدْعَةٍ وَهِيَ كُلُّ شَيْءٍ لَيْسَ لَهُ مِثَالٌ تَقَدَّمَ فَيَشْمَلُ لُغَةً مَا يُحْمَدُ وَيُذَمُّ وَيَخْتَصُّ فِي عُرْفِ أَهْلِ الشَّرْعِ بِمَا يُذَمُّ وَإِنْ وَرَدَتْ فِي الْمَحْمُودِ فَعَلَى مَعْنَاهَا اللُّغَوِيِّ** »

بۆ زیاتر بڕوانە: الإعتصام للشاطبي(١\٣٠٣ ـ ٣٠٨ ط. مشهور حسن) و وەڵامێکی تێر و تەسەل بۆ ئەو برایانەی ئەم فەرمودەیە دەکەنە بەڵگە کە (بیدعە حەسەنە) لە دیندا هەیە.

## سێیەمیان: دەستکەوت (غەنیمە)

پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: «اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغْلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ»[(١)] واتە: (پێنج شت پێش پێنج شت بەدەستبێنە: گەنجایەتی پێش پیربوون، لەشساغی پێش نەخۆش کەوتن، دەوڵەمەندی پێش هەژاربوون، هەبوونی کاتی فەراغ پێش کۆبوونەوەی کارەکان، ژیانت پێش مردنت) مانای ئەم فەرمودەیەش بۆ ئەم خاڵەی بابەتەکەمان کە (لە کۆگادانان و وەگەڕخستنی کاتی داهاتوویە) لە چەند فەرموودەی دیکەدا دێتە بەرچاومان لەوانە: «إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ كُتِبَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا»[(٢)] واتە: (ئەگەر بەندە نەخۆش کەوت یان سەفەری کرد، ئەوا ئەوکارەچاکانەی بەهۆی سەفەر و نەخۆشییەوە بە جێی هێشتوون، بۆی ئەنووسرێن وەکو پێشتر).

ئەمەش ئاماژەیەکی شەریعەتە کە بەندە کاتی هەبوونی و لەشساغی و فەراغ وەکو غەنیمە و دەستکەوت تەماشا بکات بۆ ئەنجامدانی زۆرترین چاکە، چونکە کاتێك نەخۆشی یان هەر هۆکارێکی دیکە ڕێگری لە ئەنجامدانی ئەم چاکانە دەکات ناتوانێت ڕێگری لە بەردەوامی پاداشتیان بکات «كُتِبَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ مُقِيمًا صَحِيحًا» بەمەرجێك کۆڵنەدەر بێت کاتی فەراغ و لەشساغی و پەروەردگاریش فەرمان بەم کۆڵنەدانە دەکات کاتێك بە پێغەمبەرەکەی (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: ﴿فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب ۝﴾[(٣)] .

---

(١) أخرجه البيهقي في شعب الإيمان و الحاكم في المستدرك و ابن مبارك في الزهد و غيرهم. ينظر: صحيح الترغيب و الترهيب (٣٣٥٥) و صحيح الجامع (١٠٧٧).

(٢) أخرجه أحمد (٣٢\٤٥٧ ط. المؤسسة) وقال محققوا المسند إسناده صحيحٌ على شرط البخاري.

(٣) الشرح: ٧ ـ ٨ .

ئەم ئایەت و فەرمودانەی باسکران ڕێنیشاندەرن بۆ لە کۆگا دانانی کات و وەگەڕختنی کاتی داهاتوو وەکو تەفسیرێکن بۆ دەیان ئایەتی دیکەی قورئانی پیرۆز لەوانە:

دوعای ئیبراهیم (علیه السلام): ﴿وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ﴾ [١] واتە: خودایە لەپاش مردنم باشەیەك بەجێ بێڵم کە یادی خێر بێت لە سەر زاری نەوەکانی داهاتوو.

هەروەها پەروەردگار لە باسی نووسینەوەی چاکە و خراپەی مرۆڤ دەفەرمێت: ﴿وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ﴾ [٢] واتە: ئەوەی کردوویەتی و ئەوەی بەجێی هێشتووە هەمووی دەنووسین، هەمووشمان سەرژمێر و ئامارکردووە لە کیتابێکی ڕوون و ئاشکرادا. لە باسی لێپرسینەوەی مرۆڤیش دەفەرمێت: ﴿يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ﴾[٣] واتە: لە ڕۆژی حیسابدا هەواڵی هەموو کار و کردەوەکان بە مرۆڤ دەدرێت ئەوەی کردوویەتی و ئەوەی پاش خۆی بەجێ هێشتووە.

ئەم ئایەتانەش هاندانێکن بۆ لە کۆگادانانی کات و وەگەڕختنی کاتەکانی داهاتوو بە چاکەکاری، تاوەکو پاش مردنی مرۆڤیش ژیانێکی دیکەی چاکەکاری لە دونیادا بۆی نەبڕاوە و بەردەوامبێت. خودا لەو چاکەکارانە حیسابمان بکات کە لە پاشەخۆیان چاکەی نەبڕاوە بە جێ دەهێڵن.

---

(١) الشعراء: ٨٤.

(٢) یس: ١٢.

(٣) القیامة : ١٣.



## پاشكۆیەكی فرمانی (بكە) بۆ بنەمای حەفتەم: وەگەڕخستنی كاتە نزیكەكانی داهاتوو

ئەمەش بە چەند خاڵێك نزیكی دەكەینەوە:

### ١ ـ چارەسەری پێش نەخۆشی:

پاراستنی تەندروستی بریتییە لە پاراستنی هێزی كاركردن و بەرهەم هێنان و لە دەستدانی تەندروستیش بریتییە لە لەكارخستنی هێزی كاركردن و وەبەرهەم هێنان، جێی شاهێد لەم خاڵەدا بۆ ئەم بنەمایەی بابەتەكەمان بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەكانی وەگەڕخستنی كاتی داهاتوو، چونكە لادانی نەخۆشی لە داهاتوو بە چارەسەری ئێستا جۆرێكی وەگەڕخستنی كاتی داهاتووە، پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لەم بارەیەوە دەفەرمێت: (مَنْ تَصَبَّحَ بِسَبْعِ تَمَرَاتٍ مِنْ عَجْوَةٍ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سُمٌّ وَلا سِحْرٌ)[١] واتە: ئەوەی بەیانیان حەفت دانە لە عەجوە (جۆریكی خورمای مەدینەیە) بخوات لەو ڕۆژەدا تووشی ژەهراویبوون و سیحر نابێت.

شێخ بن باز(رحمه الله) فەرمودەكە دەكاتە بەڵگە بۆ دروستی دەرمان وەرگرتن و تەلقیحات پێش نەخۆش كەوتن[٢].

كەواتە خۆپارێزی لە نەخۆشی جۆرێكە لە پاراستنی هێزەكانی كار لە دواڕۆژدا، ئەمەش بەشێكە لە بەشەكانی لە كۆگادانانی كات بۆ دواڕۆژ.

---

(١) متفقٌ علیه و هذا لفظ أحمد(١٥٧١).

(٢) مجموع فتاوی بن باز (٦\٢١).



### ٢ ـ هەڵگرتنی پێداویستییە ئابووریەکان بۆ داهاتوو:

هەر لەم ڕوویەوە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە هەبوونیدا ئەرزاقی ساڵێکی لەماڵ پاشەکەوت دەکرد[١] ئەمەش وەکو فێرکردنێك بۆ ئوممەتەکەی کە ئەمە دژ نییە بە (توکل) لەسەر خودا، بەڵکو (توکل)ە لەسەر خودا بە گرتنەبەری هۆکار(الأسباب)[٢].

جێی شاهێد لەم خاڵەدا ـ وەکو خاڵی پێشترـ بۆ ئەم بنەمایە بریتییە لە سافبوونی توانای بیرکردنەوە لەم ماوەیەدا بە خۆ دوورگرتن لە گشت کێشەیەکی ئابووری کە زۆرجار ڕێگر دەبێت لە وەگەڕخستنی کات و بیرکردنەوەی ساغلەم.

### ٣ ـ پلاندانان و خۆ ئامادەکردن بۆ کاتەکانی داهاتوو:

بینینی دواڕۆژ بە چاوی عەقل و پلان دانان بۆی بەشێکە لە (توکل) لەسەر خودا، لە ژیاننامەی پێغەمبەرماندا (صلى الله عليه وسلم) بە جوانی ڕەنگدەداتەوە، لە پلانی کورت خایەنی ڕۆژانە بۆ پلانێك کە دەیان ساڵ دەگرێتەخۆی، **نمونەی یەکەم** پلان دارشتنی بۆ شەڕی ئوحد پێش دەرچوونی یان پلانی خۆ ئامادەکردنی بۆ شەڕی خەندەق ... هتد . **نمونەی دووەم** پلان دانانی بۆ کۆچکردن بۆ مەدینە لە بەیعەی عەقەبەی یەکەم و دووەم بە زیاتر لە دوو ساڵ پێش کۆچکردنی، یان پەیمانی حودەیبییە لەگەڵ موشریکەکانی مەککە بۆ دە ساڵ، یان سافکردنی چەقی بەڕێوەبردنی ئوممەتەکەی کە

---

(١) ينظر : صحيح البخاري (٧\٨١)( بابُ حَبْسِ نَفَقَةِ الرَّجُلِ قُوتَ سَنَةٍ عَلَى أَهْلِهِ، وَكَيْفَ نَفَقَاتُ الْعِيَالِ؟)

(٢) ينظر : منزلة التوكل في مدارج السالكين لإبن القيم.

جەزیرەی عەرەبییە بە دەرکردنی جولەکە و دیانەکان کەجێبەجێکردنی بە جێهێشت بۆ هەڤاڵانی پاش مردنی[١] .

ئەمانە و پلانی دیکە کە لە ژیاننامە پیرۆزەکەیدا دێتە بەرچاومان باشترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) هەموو کات خوێندنەوەی هەبووە بۆ دوارۆژ و پلانی بۆ دارشتووە و خۆی بۆ ئامادەکردووە، ئەم خۆ ئامادەکردنانەش باشترین هۆکاری جوان دەستەبەرکردنی کاتی ئێستا و وەگەڕخستنی کاتی داهاتوون، کە نابێت مرۆڤ لێیان بێئاگابێت.

### ٤ ـ هاندانی منداڵ بۆ داهاتوویەکی گەشاوە:

فەرمودەی: (حەسەنی کوڕم سەرکردەیە و خودا لەسەر دەستی ئەو ئوممەتەکەم کۆدەکاتەوە) « إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ »[٢] زۆرجار وەکو بەڵگەیەکی ڕاستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) لە مەلا و ماموستایان دەبیستین، چونکە چی فەرمووە ئەو هاتەجێ ئیمامی حەسەن (رضي الله عنه) بەڕاستی سەرکردەبوو، ئوممەتی ئیسلامی لە دووبەرەکی دەرهێنا بۆ تەبایی، وەك لە لاپەڕەکانی هەموو کیتابە مێژوویەکانی ئیسلامدا دەبینرێت[٣]، بەڵام ئەمە جێی شاهێد نییە لەم بابەتەدا، بەڵکو جێی شاهێد لەم بابەتەدا پەروەردەکردنی پێغەمبەرمانە بۆ حەسەنی نەوەی (رضي الله عنه) بە

---

(١) بڕوانە هەرکتێبێك لەسەر ژیاننامە پیرۆزەکەی دەیان نمونەت لەم بارەیەوە دێنەبەرچاو و وەکو نمونەیەك کە بەدرێژی باسی کاری پلانداری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کرابێت بڕوانە: (التخطيط النبوي لحادثة الهجرة تأليف: أ . د . نوال بنت عمرباسعد ط. دار الصميعي)

(٢) رواه البخاري (٢٧٤٤مكنز).

(٣) الإنصاف فيما وقع في العصر الراشدي من الخلاف تأليف: د. حامد محمد خليفة ص٦١٤ ـ ٦١٥ ط. الميمان.

وشەیەك كە بەرچاوی ڕووندەكات و ڕووی دەكاتە سەركردایەتی بۆ چاكە و تەبایی ئوممەت، بەڕاستیش ژیاننامەی حەسەنی سەركردە (رضي الله عنه) ڕەنگدانەوەی فەرموودەكەبووە:«إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ .....».

و بەڕاستی جێگای داخە و سەرپێچی سوننەتی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم) كە باوكێك لە سەركارێك لە منداڵەكەی تۆڕە دەبێت پێی دەڵێت: تۆ فاشلی تۆ نابیتە هیچ! باوكی بەڕێز نەكەی ئەمە بڵێیت، چونكە سەرپێچی سوننەتی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵكو هەردەم گەشبین و هیوابەخشبە بە منداڵەكەت تاوەكو دوا ڕۆژمان گەشاوەتر بێت. كەواتە پرۆژەی ڕاست و دروستی پەروەردەیی خۆی لە خۆیدا جۆرێكی لە كۆگادانانی كاتە بۆ دواڕوژ.

## پاشکۆیەکی فرمانی ( نەکە ) بۆ بنەمای حەفتەم:

## پاراستنی کاتە نزیکەکانی داهاتوو

ئەمەش بە چەند خاڵێك نزیکی دەکەینەوە:

### ١ ـ ترسناکی بێئاگایی لە تێپەڕبوونی کات ( الغفلة ):

غەفلەت خوشکی لەبیرچوونەوەیە (النسیان)، جیاوازیان ئەوەیە کە لە بیرچوونەوە لەویست و ئیرادەی مرۆڤدا نییە، بەڵام غەفلەت خۆ لەبیربردنەوەیە کە بە ویست و ئیرادەی مرۆڤە، وەکو خۆ ڕاهێنانێك کە مرۆڤ هەست بە ئەرکەکانی نەکات بەرامبەر **خودا** و خەڵك و خۆی لە گێلی بدات، قورئانی پیرۆز بە زۆر شێواز موسڵمان لەم تاوانە ئاگادارەدەکاتەوە، لەوانە: ﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ﴾[١] و خودای پەروەردگار موسڵمان ئاگادارەدەکاتەوە گوێڕایەڵی ئەو جۆرە کەسانە نەکات کە تووش هاتوون بە نەخۆشی غەفلەت: ﴿وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾[٢] .

بابەتی نەخۆشی غەفلەت بابەتێکی سەربەخۆیە، هەویرێکە زۆر ئاوی پێویستە، لێرەدا ئەم پوختەیە کیفایەتە و جێی شاهێدیش بۆ پاشکۆیەکە بریتییە لە ترسناکی جۆرێك لە جۆرەکانی بەفیڕۆدانی کات، چونکە کات شتێکە خودا پیرۆزی پێ بەخشیوە[٣] کەواتە بەفیڕۆدانی دەرچوونە لە پیرۆزی بۆ ناپیرۆزی: ﴿فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ﴾[٤] . تووشبوونە

---

(١) الأعراف: ١٧٩.

(٢) کهف: ٢٨.

(٣) بڕوانە: بنەمای سێیەم.

(٤) یونس:٣٢.

بە نەخۆشی دلڕەقی کە سەردەکێشێ بۆ دەرچوون لە تەقوادارییەوە بۆ فیسق، پەروەردگار موسڵمانان لەم نەخۆشییە ئاگاداردەکاتەوە بە باسی لاپەڕەیەکی مێژووی ئەهلی کیتاب کە دەفەرمێت: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾[١]

واتە: (کاتی ئەوە هاتووە کە ئیمانداران دڵەکانیان ملکەچی حەق بکەن و بەزیکری خودا ڕووناك بکەنەوە، وەکو ئەهلی کیتاب غافل نەبن کە **بە تێپەڕبوونی کات** تووشی دلڕەقی هاتن و لە تەقواداری دەرچوون).

## ٢ ـ ترسناکی دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی (التسویف[٢]):

ئەم خاڵە ناونیشانەکەی کیفایەتە جێی شاهێدیش تیادا بۆ پاشکۆیەکە هەمان جێی شاهێدی خاڵی یەکەمە.

ئەوانەی ناویان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا گەشاوەیە هەرگیز کاری ئەمڕۆیان دوانەخستووە بۆ سبەی لەوانە عومەری کوڕی عبدالعزیز، کاتێك ماندووبوونێکی زۆری پێوە دیاربووە، هەڤاڵانی پێیانی فەرمووە: ئەی میری موسڵمانان ماندوو دیاری کارەکە بخەرە سبەی؟ ئەویش لە وەڵامیاندا فەرمووی: ئەگەر دەستبەرداری کاری ڕۆژێك ببم لەبەر ماندووبوون دەبێ بۆ کاری دوو ڕۆژ چی بکەم!؟[٣].

---

(١) الحدید: ١٦ .

(٢) التسویف واتە: دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی یان کاری ئێستا بۆ داهاتوو، عەرەب بە خاوەنی ئەم خەسڵەتە خراپە دەڵێن: (باوکی دووڕاو ـــ أبو خائب) ینظر: (کتاب المُرَصَّع لإبن الأثیر الجزري ص١٢٦ ط.عالم الکتب)،.

(٣) ینظر: کتاب الوقت في حیاة المسلم ص٦٦ لدکتور یوسف القرضاوي.

زانای ناودار (الخطيب البغدادي ـ مات ٤٦٣ هـ ـ) کیتابەکەی(إقتضاء العلم العمل ط. المكتب الإسلامي) بە (باب ذم التسويف) کۆتایی دێنێت لەبەر گرنگییەکەی پوختەیەکی وەردەگێڕین:

* ئایەتی ﴿وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾[١] بە دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی تەفسیرکراوە[٢].

* بە موسڵمانێکیان گوت ـ کەلەسەرەمەرگدا بوو ـ: وەسیەت بکە. فەرمووی: (إحذروا التسويف) ئاگاداربن لە دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی[٣].

* (سوف ـ دواخستنی کاری ئەمڕۆ بۆ سبەی ـ) سەربازێکی لەشکری ئیبلیسە[٤].

**قال يُوسُفُ بْنُ أَسْبَاطٍ: ‹ كَتَبَ إِلَيَّ مُحَمَّدُ بْنُ سَمُرَةَ السَّائِحُ، بِهَذِهِ الرِّسَالَةِ › :**

«أَيْ أَخِي، إِيَّاكَ وَتَأْمِيرَ التَّسْوِيفِ عَلَى نَفْسِكَ، وَإِمْكَانَهُ مِنْ قَلْبِكَ؛ فَإِنَّهُ مَحَلُّ الْكَلَالِ، وَمَوْئِلُ التَّلَفِ، وَبِهِ تُقْطَعُ الْآمَالُ، وَفِيهِ تَنْقَطِعُ الْآجَالُ، فَإِنَّكَ إِنْ فَعَلْتَ ذَلِكَ أَبْدَلْتَهُ مِنْ عَزْمِكَ وَهَوَاكَ عَلَيْهِ فِعْلًا، وَاسْتَرْجَعَا مِنْ بَدَنِكَ مِنَ السَّآمَةِ مَا قَدْ وَلَّى عَنْكَ، فَعِنْدَ مُرَاجَعَتِهِ إِيَّاكَ لَا تَنْتَفِعُ نَفْسُكَ مِنْ بَدَنِكَ بِنَافِعَةٍ، وَبَادِرْ يَا أَخِي فَإِنَّكَ مُبَادَرٌ بِكَ، وَأَسْرِعْ فَإِنَّكَ مَسْرُوعٌ بِكَ، وَجِدَّ فَإِنَّ الْأَمْرَ جِدٌّ، وَتَيَقَّظْ مِنْ رَقْدَتِكَ، وَانْتَبِهْ مِنْ غَفْلَتِكَ، وَتَذَكَّرْ مَا أَسْلَفْتَ وَقَصَّرْتَ وَفَرَّطْتَ، وَجَنَيْتَ وَعَمِلْتَ، فَإِنَّهُ مُثْبَتٌ مُحْصًى، فَكَأَنَّكَ بِالْأَمْرِ قَدْ بَغَتَكَ فَاغْتَبَطْتَ بِمَا قَدَّمْتَ، أَوْ نَدِمْتَ عَلَى مَا فَرَّطْتَ»

إقتضاء العلم العمل للخطيب (٢٠١)

---

(١) الكهف: ٢٨ .

(٢) إقتضا العلم العمل (١٩٧).

(٣) إقتضاء العلم العمل (١٩٨).

(٤) إقتضاء العلم العمل(٢٠٠).

### ٣ ـ ترسناكی وشەی ( ناتوانم ) بە بێ بیانوویەكی ڕاست:

ئەم خاڵەش وەكو خاڵی پێشتر تەنها ناونیشانەكەی كیفایەتە جێی شاهێدیش بۆ پاشكۆیەكە هەر ئەوەیە كە لەدوو خاڵی پێشتردا باسكرا.

بۆ ئەم خاڵەش ئەوەندە بەسە كە وشەی ناتوانم (لاأستطيع) بەبێ بیانوویەكی ڕاست وشەیەكە پێغەمبەرمانی تۆڕەكردووە (صلى الله عليه وسلم) هەروەك لە فەرمودەدا هاتووە: (أَنَّ رَجُلاً أَكَلَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم بِشِمَالِهِ فَقَالَ: «كُلْ بِيَمِينِكَ». قَالَ: لاَ أَسْتَطِيعُ. قَالَ: «لاَ اسْتَطَعْتَ» مَا مَنَعَهُ إِلاَّ الْكِبْرُ. قَالَ فَمَا رَفَعَهَا إِلَى فِيهِ.)[١] واتە: كەسێك لای پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بەدەستی چەپ دەیخوارد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو: (بەدەستی ڕاست بخۆ). ئەویش لە وەڵامیدا گوتی: (ناتوانم) پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لێی تۆڕە دەبێت، چونكە بەبێ بیانوو گوتی ناتوانم، پێی دەفەرمێت: (دەی هەر نەتوانی) تۆ لە بەر تەكەبور سەرپێچیت كرد، پاش ئەمەش پیاوەكە نەیدەتوانی دەستی چەپی بۆ دەمی بەرزكات.

**قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم:**

«الْمُؤْمِنُ الْقَوِيُّ خَيْرٌ وَأَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِ الضَّعِيفِ وَفِي كُلٍّ خَيْرٌ احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ وَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَلاَ تَعْجِزْ وَإِنْ أَصَابَكَ شَىْءٌ فَلاَ تَقُلْ لَوْ أَنِّى فَعَلْتُ كَانَ كَذَا وَكَذَا، وَلَكِنْ قُلْ قَدَرُ اللَّهِ وَمَا شَاءَ فَعَلَ فَإِنَّ لَوْ تَفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطَانِ». رواه مسلم

(١) رواه مسلم:٥٣٨٧.

**٣ ـ ترسناکی نا ئومێدکردنی منداڵ لە خەونی دواڕۆژ:**

ئەم خاڵەش بە پێچەوانەکردنی خاڵی:(هاندانی منداڵ بۆ داهاتوویەکی گەشاوە) دێتە بەرچاومان، کە لەگەڵ فەرمودەی: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ .....» باسکرا، زۆریش بەداخەوە کە چەندین دایك وباوك کاتێك بە منداڵەکەیان دەڵێن:(هەی نەزان!) تۆی نەزانین بۆ دواڕۆژی میللەتەکەیان دەڕوێنن بە ئامادەکردنی کەسێکی نەزان لە دواڕۆژدا و دەیان ماموستا کە لە وەڵامدانەوەی هەڵەیەکی قوتابیەکەیان دەڵێن: (دانیشە لە خۆتەوە قسە مەکە) مرۆڤێکی ترسنوك بۆ دواڕۆژی میللەتەکەیان ئامادەدەکەن ...

کەواتە با دووبارە هەموو پیاوێك بیر لە فەرمودەی: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ .....» بکاتەوە ئەگەر بیەوێت منداڵەکەی وەکو حەسەن (رضي الله عنه) سەرکردەی ئاشتی و تەبایی بێت. هەموو ئافرەتێکیش بە چاوی خێزانی فیرعەون تەماشای منداڵ بکات، کاتێك موسای ساوا بە پێچراوی لە ناو زەنبیلەیەکدا بینی و فەرمووی: ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ۝﴾[1] کە بە هۆی ئەم گەشبینییەوە بە منداڵێکی ساوا لە کوفرەوە ڕزگاری بوو بۆ ئیمان.

لەکۆتایی ئەم بنەمایەشدا پێویستە بزانین کە گەشبینی دڵ بە ڕووداوەکان، پشتێکردنی عەقل نییە لە هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکاندا، وەك لە بنەمای دەیەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

---

(١) القصص: ٩ .



## بنەمای دەیەم:

## {تێگەیشتنی ماناکانی دەستپێشخەری بۆ باشترین( فقهُ الأولويات ) و هەڵسەنگاندنی دەرهاوێشتەی کارەکان پێش کردنیان( إعتبار المآلات )}[١]

هەڵبژاردن لە نێوان چاکە و خراپە، ژیری و ناژیری مرۆڤ دیار ناخات، بەڵکو ئەوەی مرۆڤی ژیر و ناژیر لە یەکتر جودا دەکاتەوە هەڵبژاردنی باشترینە، کاتێك دوو کاری باشە کۆدەبنەوە لە هەمان کاتدا یان هەڵبژاردنی کەمترینی خراپەیە، کاتێك دوو کاری خراپە کۆدەبنەوە لە هەمان کاتدا[٢] .

سەبارەت بەم بابەتە لە فیقهی ئیسلامیدا چەندین زانستی سەربەخۆ دامەزراون لەوانە:

❊ زانستی: (إعتبار المآلات)[٣]

❊ زانستی: (فقه الأولويات)[٤]

❊ زانستی: (سد الذرائع)[١]

---

(١) لەبەرئەوەی ئەم بنەمایە بنەمایەکی زۆر گرنگ و بەربلاوە و لێرەدا ناتوانین زیاتر لە پوختەکەی باس بکەین، بۆیە لەکاتی ڕاڤەکردنی لە پەراوێزەکان ئاماژە بۆ سەرچاوە گرنگەکانی ئەم بنەمایە دەکەین بۆ کەسێك کە حەزی لە بەدواداچوون بێت.

(٢) ينظر: المنتخب من كلام شيخ الإسلام ابن تيمية ص١٩٤ ـ ٢١٨ انتخبه و خدمه الشيخ علوي بن عبدالقادر السقاف.

(٣) (إعتبار المآلات) واتە: هەڵسەنگاندنی لێکەوتەی هەرکارێك لە داهاتوودا پێش ئەنجامدانی کارەکە، لە لێکۆڵینەوە هەرەباشەکان سەبارەت بە إعتبار المآلات:

❊ إعتبار مآلات الأفعال و أثرها الفقهي رسالة دكتوراه . تأليف: د. وليد بن علي الحسين. ط.دار التدمرية.

❊ إعتبار المآلات و مراعاة نتائج التصرفات ـ دراسة مقارنة في أصول الفقه و مقاصد الشريعة ـ . تأليف عبد الرحمن بن معمر السنوسي . ط. دار ابن الجوزي.

(٤) (فقه الأولويات) واتە: کردنی کاری باشترین پێش کاری باش کاتی کۆبوونەوەیان لە هەمان کاتدا، لە لێکۆڵینەوە هەرەباشەکان سەبارەت بە فقه الأولويات ( فقه الأولويات في ظلال مقاصد الشريعة الإسلامية رسالة دكتوراه تأليف : عبدالسلام الكربولي. ط. دار طيبة).

* زانستی: (فتح الذرائع) [٢] ......هتد

زۆربەی ئەم زانستانەش لە ژێر چەتری زانستی: (مەبەستەکانی شەریعەت ـ مقاصد الشريعة)[٣] دان.

هەرچەندە ئەم زانستانە درەوشاوەتر دەبینین لە کتێبەکانی (ابن تيمية) و (شاطبـي)دا، بەڵام ئەوەی جێی ڕاستی بێت هیچ کتێبێکی تەفسیری قورئانی پیرۆز و شەرحی فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و ئیجتیهاداتی فیقهی حەلال و حەرام ....هتد لە کتێبخانەی ئیسلامیدا نابینی کە ئەم زانستانەیان تیادا نەبێت و لە هەموو تەفسیر و شەرح و ئیجتهادێکدا ڕەچاو نەکرابن و لەم دواییەدا چەندین لێکۆڵینەوەی تایبەت بەم زانستانە بە چاپ گەیشتوون، کە بەڕاستی هەوڵێکن بۆ پەرەپێدانی هزری مرۆڤ بەگشتی و هزری مرۆڤی موسڵمان بەتایبەتی.

---

(١) (سد الذرائع) واتە: بەجێهێشتنی کارێکی ڕەوا و باش، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە لە هەندێك کاتی تایبەتدا ئەنجامدانی ئەم کارە ڕەوایە دەرگا بۆ لێکەوتەی ناڕەوا و خراپ بکاتەوە، لە لێکۆڵینەوە هەرەباشەکان سەبارەت بە (سد الذرائع):

* قاعدة سد الذرائع و آثارها التربوية في تحقيق العبودية ...، تأليف الدكتور مروان محمد رشدي.

* سد الذرائع عند شيخ الإسلام ابن تيمية رسالة ماجستير. إعداد: إبراهيم بن مهنا المهنا.

* سد الذرائع عن الإمام ابن قيم الجوزية و أثره في إختياراته الفقهية . تأليف: سعود بن ملوح العنزي.

(٢) (فتح الذرائع) واتە: کردنی کارێك کە دەبێتە هۆکار بۆکار و لێکەوتەی باشتر، لە لێکۆڵینەوە هەرەباشەکان سەبارەت بە فتح الذرائع: (فتح الذرائع و أثره في الفقه الإسلامي. تأليف : د. محمد رياض فخري الطبقجلي).

(٣) لە لێکۆڵینەوە هەرە باشەکان سەبارەت بە (مقاصد الشريعه):

* الإجتهاد المقاصدي (حقيقته .... وتطبقاته المعاصرة) تأليف: د. نورالدين مختار الخادمي ط. دارابن حزم.

* الإتجاهات المعاصرة في مقاصد الشريعة . تأليف: سعد العنزي ط. دار طيبة الخضراء.

* مقاصد الشريعة عند ابن تيمية . تأليف: د. يوسف أحمد محمد البدوي ط. دار النفائس.

* قواعد المقاصد عند الإمام الشاطبـي عرضاً و دراسة و تحليلاً . تأليف: د.عبدالرحمن الكيلاني ط.دار الفكر.

* مقاصد الأحكام المالية عند ابن القيم الجوزية و اثرها الفقهي. تأليف: محمد اليحيى ط. كنوز إشبيليا.

بە چاوپێخشاندنێك لەم لێكۆڵینەوانە بۆمان دەردەكەوێت كە گشت ئەم زانستانە لە یەك خاڵدا هاوبەشن ئەویش:

(**هەڵسوكەوتكردنی پێویست لە كاتی پێویستدا یان بڕیاری شیاو لە كاتی شیاودا**) ئەم خاڵەش بناغەی ئەم زانستانەیە و كاكلەی بابەتەكەمانە، بابەتەكەش لێرەدا هەر ئەوەندە هەڵدەگرێت كە بە دوو نمونە نزیكی بكەینەوە:

یەكەمیان: یوسف (علیه السلام)

هەڵبژاردنی باشترین شێوازی خوداپەرستی بە وەرگرتنی دەسەلاتی ئیداری ﴿قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ﴾[1] بۆ پاراستنی خەڵك لە هەژاری[2].

---

(١) یوسف: ٥٥

(٢) قال شيخ الإسلام (مجموعة الفتاوى ٢٠\ ٥٦ ـ ٥٧): « الْوِلَايَةُ وَإِنْ كَانَتْ جَائِزَةً أَوْ مُسْتَحَبَّةً أَوْ وَاجِبَةً فَقَدْ يَكُونُ فِي حَقِّ الرَّجُلِ الْمُعِينِ غَيْرُهَا أَوْجَبُ. أَوْ أَحَبُّ فَيُقَدَّمُ حِينَئِذٍ خَيْرُ الْخَيْرَيْنِ وُجُوبًا تَارَةً وَاسْتِحْبَابًا أُخْرَى. وَمِنْ هَذَا الْبَابِ تَوَلِّي يُوسُفَ الصِّدِّيقَ عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ لِمَلِكِ مِصْرَ بَلْ وَمَسْأَلَتُهُ أَنْ يَجْعَلَهُ عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ وَكَانَ هُوَ وَقَوْمُهُ كُفَّارًا كَمَا قَالَ تَعَالَى: ﴿وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ﴾ (الغافر:٣٤) الْآيَةَ وَقَالَ تَعَالَى عَنْهُ: ﴿يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ﴾(يوسف: ٣٨ ـ ٣٩) الْآيَةَ وَمَعْلُومٌ أَنَّهُ مَعَ كُفْرِهِمْ لَا بُدَّ أَنْ يَكُونَ لَهُمْ عَادَةٌ وَسُنَّةٌ فِي قَبْضِ الْأَمْوَالِ وَصَرْفِهَا عَلَى حَاشِيَةِ الْمَلِكِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ وَجُنْدِهِ وَرَعِيَّتِهِ وَلَا تَكُونُ تِلْكَ جَارِيَةً عَلَى سُنَّةِ الْأَنْبِيَاءِ وَعَدْلِهِمْ وَلَمْ يَكُنْ يُوسُفُ يُمْكِنُهُ أَنْ يَفْعَلَ كُلَّ مَا يُرِيدُ وَهُوَ مَا يَرَاهُ مِنْ دِينِ اللَّهِ فَإِنَّ الْقَوْمَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا لَهُ لَكِنْ فَعَلَ الْمُمْكِنَ مِنْ الْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَنَالَ بِالسُّلْطَانِ مِنْ إكْرَامِ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُمْكِنُ أَنْ يَنَالَهُ بِدُونِ ذَلِكَ وَهَذَا كُلُّهُ دَاخِلٌ فِي قَوْلِهِ: ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾(التغابن:٥٥٧). فإذا ازْدَحَمَ وَاجِبَانِ لَا يُمْكِنُ جَمْعُهُمَا فَقُدِّمَ أَوْكَدُهُمَا لَمْ يَكُنْ الْآخَرُ فِي هَذِهِ الْحَالِ وَاجِبًا وَلَمْ يَكُنْ تَارِكُهُ لِأَجْلِ فِعْلِ الْأَوْكَد تَارِكَ وَاجِبٍ فِي الْحَقِيقَةِ. وَكَذَلِكَ إذَا اجْتَمَعَ مُحَرَّمَانِ لَا يُمْكِنُ تَرْكُ أَعْظَمِهِمَا إلَّا بِفِعْلِ أَدْنَاهُمَا لَمْ يَكُنْ فِعْلُ الْأَدْنَى فِي هَذِهِ الْحَالِ مُحَرَّمًا فِي الْحَقِيقَةِ وَإِنْ سُمِّيَ ذَلِكَ تَرْكُ وَاجِبٍ وَسُمِّيَ هَذَا فِعْلُ مُحَرَّمٍ بِاعْتِبَارِ الْإِطْلَاقِ لَمْ يَضُرَّ. وَيُقَالُ فِي مِثْلِ هَذَا تَرْكُ الْوَاجِبِ لِعُذْرِ وَفِعْلُ الْمُحَرَّمِ لِلْمَصْلَحَةِ الرَّاجِحَةِ أَوْ لِلضَّرُورَةِ" أَوْ لِدَفْعِ مَا هُوَ أحرم...)).

دووەمیان: الحسن بن علي ( رضي الله عنه)

هەڵبژاردنی باشترین شێوازی خوداپەرستی بە دوورکەوتنەوە لە دەسەڵات بۆ پاراستنی سەر و ماڵی خەڵك [(١)] .

لەم دوو نمونەیەدا بە ڕوونی دیارە کە هەمان کار جارێك کردنی باشترینە، جارێکی دیکە نەکردنی باشترینە، بەمانایەکی دیکە هەڵبژاردنی باشترین بە پێی کات و بار و کەس و دەوروبەر دەگۆڕێت.

**گۆڕینی فەتوا بە پێی زەمان و مەکانیش** بۆ ئەم بنەمایە دەگەڕێتەوە، چونکە بەهۆیەوە مرۆڤی موسڵمان حوکمی شەرعی دەپێکێت و بڕیار لەسەر باشترین دەدات[(٢)]، بۆ زیاتر ڕوونبوونەوە لەسەر چەند لاپەڕەیەکی فیقه و تێگەیشتنی هەڤاڵانی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) دەوەستین:

**قال ابن القيم رحمه الله في كتابه( مدارج السالكين ١\١١١ ):**

﴿فَالْأَفْضَلُ فِي كُلِّ وَقْتٍ وَحَالٍ إِيثَارُ مَرْضَاةِ اللَّهِ فِي ذَلِكَ الْوَقْتِ وَالْحَالِ، وَالِاشْتِغَالُ بِوَاجِبِ ذَلِكَ الْوَقْتِ وَوَظِيفَتِهِ وَمُقْتَضَاهُ﴾

---

(١) قال شيخ الإسلام (مهاج السنة٤\٥٣٦): كان الحسن (رضي الله عنه) ذا خُلق يجنح إلى السلْم و كراهة الفتنة و نبذ الفرقة، جعل الله به رأب الصدع و جمع الكلمة. و قال الدكتور خالد الغيث في كتابه: (مرويات خلافة معاوية في تأريخ الطبري ص١٣٤): (كان الحسن رضوان الله عليه في صلحه مع معاوية رضي الله عنه و حقنه لدماء المسلمين كعثمان في جمعه القرآن و كأبي بكر في الردة ) ينظر: الحسن بن علي ( رضي الله عنه) شخصية عصره للصلابي ص٢٨٨، ٣٥٠ ط. دار ابن كثير. و فقه الأولويات ص٤٤١ ـ ٤٤٤ .

(٢) حول مسألة تغير الفتوى بتغير الزمان و المكان ينظر:

* (تغير الأحكام ـ دراسةٌ تطبقية لقاعدة : لا ينكر تغير الأحكام بتغير القرائن و الأزمان في الفقه الإسلامي) تأليف: د.سها سليم بكتاش ط. دار البشائر .

* (إختلاف الإجتهاد و تغيرهُ و أثر ذلك في الفُتيا ص١١٣ ـ١١٦ط.مؤسسة المجد) تأليف: د.محمد عبدالرحمن المرعشلي.

یەکەمیان: (أبو بکر و عمر ـ ( رضي الله عنهما) ـ ) لە هەموو جەژنێکی قوربان، قوربانیان نەدەکرد(سەرەڕای هەبوونی توانایان بۆ قوربانیکردن و زانینیان بە زۆری پاداشتی قوربانیکردن)! دەترسان ئەگەر لە هەموو جەژنێکدا قوربانی بکەن خەڵك واتێبگات کە قوربانی واجبە[١].

دووەمیان: (عبد الله بن عباس) فەتوا بۆ کەسێك دەدات کە تاوانی کوشتن تەوبەی نییە(ئەمە لەکاتێکدا کە دەزانێت هەموو تاوانێك تەوبەی هەیە)! چونکە تۆڕەیی لەسەر دەموچاوی کەسە پرسیارکەرەکەی خوێندەوە و بۆی دەرکەوت کە نییەتی پیاوکوشتنی هەیە بۆیە ئەم پرسیارە دەکات[٢].

*** 

هەر لەم ڕوویەشەوە زۆر لە زانایان دژی بیرۆکەی بەیاساکردنی دەقەکانی شەریعەتن (التقنين) لە دادگاکاندا، چونکە ئەم بەیاساکردنە دەسەڵاتی قازی کەم دەکاتەوە لە هەڵسەنگاندن و دابەزاندنی حوکمی شەرعی بە سەر ڕووداوی واقیعیدا، ئەوانەی ڕێ بەم پرۆژەیە دەدەن بە مەرجداری ڕێی پێدەدەن ـ کە لێرە دەرفەت نییە بە درێژی باسی ئەم بابەتە گرنگە بکەین ـ[٣]، ئەمەش خاڵێکە گەورەیی ئیسلام دەخاتە ڕوو لە پاراستنی

---

(١) ينظر: الموسوعة الفقهية الكويتية (٥\٧٧) و إعتبار مآلات الأفعال و أثرها الفقهي (١\١٦٣) (٢\٥٥٢). وأثر أبوبكر وعمر (رضي الله عنهما)أخرجه عبد الرزاق في المصنف (٤\٣٨١) و البيهقي في السنن الكبير(٩\٢٦٥ ط. العثمانية) و حسنة النووي في المجموع(٨\٣٨٣ ط. المنيرية).

(٢) فتوى ابن عباس في حكم التوبة من جريمة القتل رواه ابن أبي شيبة في المصنف (٥\٤٣٥ رقم: ٢٧٧٥٣) وقال ابن حجر في تلخيص الحبير (٤\١٨٧): رجاله ثقات. و ينظر: إعتبار مآلات الأفعال و اثرها الفقهي (١\١٧٦).

(٣) سەبارەت بە خراپی کاردانەوەی بەیاساکردنی دەقەکانی شەریعەت بەسەر دەسەڵاتی دادوەر و حوکمی شەرعی بەیاساکردنی شەریعەت بڕوانە:

مافەکانی مرۆڤ کە زۆر لە موسڵمانە یاساناسەکان لێی بێئاگان، چونکە ئیسلامیان وەکو نەریت وەرگرتووە نەك وەکو زانست، بۆیە دەیانبینی بەرەو یاساو ڕێسای دادگا ئەورووپیەکان ڕادەکەن و پشتیان لە بەهێزترین و بە ڕەحمترین شەریعەت دەکەن کە لە بەردەستیانە، لە ئاسمان دابەزیوە! ژیاننامەی دەیان یاسازان و ڕۆژهەڵاتناس دەخوێنن، بێئەوەی گەورەزاناکانی خۆیان بناسن، کە چۆن توانیویانە بە هوشمەندی خۆیان دادپەروەری بپارێزن بە دابەزاندنی دەقە شەرعییەکان لەو کات و حاڵەتانەی کە لە خزمەت ماف و سەروەری تاکەکەس و کۆمەڵگادابن[1].

ئەم هوشمەندییەش بریتییە لە پێکەوە وەرگرتنی (توانایی ـ الطاقة ـ) و (دانایی ـ الحكمة ـ) لە دەقی شەرعی و کارەسات ئەوکات دروست دەبێت کە تەنها توانایی(طاقة) لە دەقی پیرۆز وەربگیرێت بەبێ دانایی(حكمة)، هەروەك لە بنەمای یازدەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

**قال ابن القيم في كتابه ( أعلام الموقعين١\٨٣ ):**

( وَمَنْ أَفْتَى النَّاسَ بِمُجَرَّدِ الْمَنْقُولِ فِي الْكُتُبِ عَلَى اخْتِلَافِ عُرْفِهِمْ وَعَوَائِدِهِمْ وَأَزْمِنَتِهِمْ وَأَمْكِنَتِهِمْ وَأَحْوَالِهِمْ وَقَرَائِنِ أَحْوَالِهِمْ فَقَدْ ضَلَّ وَأَضَلَّ )

---

* (التقنين و الإلزام )لفضيلة الشيخ بكر أبوزيد رحمه الله (١\٩ ـ ١٠٠ فقه النوازل ط. مؤسسة الرسالة).
* إستقلال القضاء في الفقه الإسلامي. تأليف: محمد السحيم (تقنين القضاء ص٣٤٥ ـ ٣٩٢ط. دارابن الجوزي).

(١) حول فقه تنزيل الأحكام في الواقع ينظر:
* البعد التنزيلي في التنظير الأصولي عند الإمام الشاطبي. إعداد: بلخير عثمان. ط.دار ابن حزم.
* فقه التنزيل دراسةٌ اصوليةٌ تطبقية. تأليف أحمد مرعي المعماري ط. مركز نماء للبحوث و الدراسات.

## بنەمای یازدەم:

## ترسناکترین کاتی ژیان:

### هەبوونی (توانایی)یە، بە بێ (دانایی)

دەقی پیرۆز (الکتاب ، السنة) هێز و توانایی لەگەڵ حیکمەت و دانایی پێکەوە دەبەخشێت و لێرەدا مرۆڤی موسڵمان و مرۆڤی توندڕەو لەیەکتر جودا دەبنەوە با لەسەر دەقێکی قورئانی پیرۆز بوەستین لەم بارەیەوە:

پەروەردگار لە مەدحی پێغەمبەرانیدا (علیهم السلام) بە پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمێت: ﴿وَٱذۡكُرۡ عِبَـٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَـٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَـٰرِ ٤٥﴾[1]

واتە: {ئەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) باس و یادی بەندە بەڕێزەکانم بکە ـ ئیبراهیم، ئیسحاق، یەعقوب ـ کە خاوەن دوو خەسلەت بوون:

یەکەم: ﴿ٱلۡأَيۡدِي﴾ هێز و توانایی (الطاقة و القُدرة)

دووەم: ﴿وَٱلۡأَبۡصَـٰرِ﴾ حیکمەت و دانایی (الحِكمة و الرُؤية)}

بە تێڕوانین لە ئایەتەکەدا دوو هاوکێشە دێنە بەرچاومان:

توانایی + دانایی = کەسی دادپەروەر و چاکەکـار ـــــــــــــــ(١)

توانایی ـ دانایی = کەسـی توندڕەو و تـاوانکـار ـــــــــــــــ(٢)

هاوکێشەی دووەم هاوکێشە ترسناکەکەیە کە باسی کاتێکی ژیان دەکات کە توانا و هێزەکانی ناخی مرۆڤ گەرم دەبن و دەجولێنەوە، بەڵام کە دەکرێنە کار و کردەوە بەبێ دانایی و حیکمەت کار و کردەوەکان ئەنجامدەدرێن، بەمە زیانێکی ترسناکیان

---

(١) ص: ٤٥.

لێدەكەوێتەوە، نمونەی ئەمەش وەكو ئەو گەنجەی تووشی هزری خەوارج دەبێت و دەست بۆ چەك دەبات بەناوی جیهاد...هتد. كە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە دەیان فەرمودەدا لەم هزرە ئاگادارماندەكاتەوە لەوانە حوزەیفە (رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی :

(إن أخوف ما أخاف عليكم رجل قرأ القرآن، حتّى إذا رُئيتْ بهجتُه عليه، وكان رِدْءاً للإسلام؛ انسلخ منه ونبذه وراء ظهره، وسعى على جاره بالسيف ، ورماه بالشرك. قلت: يا نبيَّ الله! أيُّهما أولى بالشرك، الرامي أو المرمي؟ قال: بل الرامي) [١]

واتە: ( ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر لێتان دەترسێم، كەسێكە قورئانی خوێندووە تاوەكو جوانی ئەم قورئانە لە هەڵسوكەوت و دەموچاوی دەركەوتووە، لەپاشان لە مانابەرزەكانی ئەم قورئانە دەرهاتووە و پشتی تێكردووە، دەستی داوەتە شمشێر بۆ سەر ماڵی جیرانەكەی و بەشیرك تاوانباری كردووە!

حوزەیفە رضي الله عنه دەفەرمێت پرسیاری پێغەمبەرم كرد: كامیان شایستەی تاوانی شیركە تاوانهاوێژەكە ـ كە قورئانخوێنە شمشێر هەڵگرەكەیە ـ یان جیرانەكەی فەرمووی: تاوان هاوێژەكە).

ئەمە مانای **هاوكێشە دووەمینەكەیە** كە هەڵگەڕانەوەی مرۆڤی قورئان خوێنە بۆ مرۆڤێكی خوێناوی لە ئەنجامی وەرگرتنی توانایی(طاقة) لە دەقە پیرۆزەكە بەبێ دانایی (حكمة)، كە هەرگیز ئەم كەسە نمونەی موسڵمان نییە، بەڵكو نمونەی موسڵمانی ڕاستەقینە **هاوكێشە یەكەمینەكەیە،** كاتێك موسڵمان بەدوو باڵی توانایی(طاقة) و دانایی(حكمة) بۆ بەرزی پلەكانی ئیمان و سوود گەیاندن بە دەوروبەر دەفڕێت.

---

(١) ينظر: السلسلة الصحيحة (٤\٦٠٥) رقم (٣٢٠١).

**هاوکێشە یەکەمینەکە** بەرنامەی ئیسلام و ڕەوشتی پێغەمبەرمانە (صلی الله علیه وسلم). با لەسەر نمونەیەکی ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) بوەستین لەم بارەیەوە کاتێك لەوپەڕی دەسەڵاتدا بووە پاشی فەتحی مەککە:

**(پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بە عائیشەی دایکی موسڵمانان ( رضي الله عنها) دەفەرمێت: قوڕەیشییەکان کاتی ئاوەدانکردنەوەیان بۆ کەعبە ئەوەندە پارەی حەلالیان نەبوو لە سەر بناغەی ئیبراهیم دروستی بکەنەوە، و ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە خەڵکەکە ئیستا هاتوونەتە ناو ئیسلام و هێشتان لە کوفر نزیکن و بە باشی لە ئیسلام تێنەگەیشتوون، ئەوا بینایەی کەعبەم تێکدەدا و لە سەر بناغەی ئیبراهیم (علیه السلام) دروستم دەکردەوە ـ حیجری ئیسماعلیم دەخستەناوی ـ دەرگاکەشم نەوی دەکرد و دەمکردە دوو دەرگا،...)** [١]

بێگومان کەس بەقەد پێغەمبەرمان پەرۆشی شوێنکەوتنی ئیبراهیم (صلی الله علیهما وسلم) نییە هەروەها پاش فەتحی مەککە لەوپەڕی دەسەڵاتیشدا بوو(هەبوونی توانا)، سەرەڕای ئەمە هەڵنەسا بە کاری گەڕاندنەوەی بینایەی کەعبە بۆ سەر بناغەی ئیبراهیم(علیه السلام) کە کارێکی زۆر پیرۆز و گرنگیش بوو، لە پێناو پاراستنی ئەو دڵانەی نوێن لە ناو ئیسلامەتیدا(هەبوونی دانایی)، تاوەکو تووشی شەك و نائارامی نەبن.

نمونەش لەم بارەیەوە لە ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و هەڤاڵانیدا(رضي الله عنهم) زۆرە و نمونەکانی بنەمای پێشتریش بۆ ئەم بنەمایە دەشێن.

---

(١) متفقٌ علیه. ینظر: مختصر صحیح البخاري للألباني و جمعه لألفاظ الحدیث (١\٤٦٧ ـ ٤٦٩ ط.المعارف)

لێرەدا ئەوەی پێویستە کە لە کۆتایی ئەم بنەمایەدا بڵێین ئەوەیە کە دانایی سەرکردایەتی توانایی دەکات، هیچ کەسێکیش نییە ئاستێکی تواناداری نەبێت، بەڵکو ناتوانین تەصەوری کەسێك بکەین کە ژیانی هەبێت و توانای نەبێت! بەڵام جێی سەرکردایەتی و بڕیار کە چاکە و خراپەی لێدەکەوێتەوە داناییە(الحكمة) بۆیە پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ﴾(١) واتە: ( هەرکەس دانایی پێ بەخشرا، ئەوا خێرێکی زۆری پێ بەخشراوە).

لێرەشەوە جیاوازی نێوان هەبوونی تێگەیشتنی دەقی شەرعی و تێگەیشتنی چۆنیەتی جێبەجێکردنی دەقی شەرعی دەکرێت(٢)، ئەوانەی بەهەڵە دەقەکە جێبەجێ دەکەن خەڵکانێکن تواناییان (الطاقة)لە دەقەکە وەرگرتووە بە بێ دانایی(الحكمة) لە کاتێکدا پێویست ئەوەیە کە هەردووکیان {(توانایی)،(دانایی)} پێکەوە لە دەقەکە وەربگیرێن، چونکە دەقە پیرۆزەکە هەردووکیان دەبەخشێت.

هەڤاڵی پایە بەرز (ابن مسعود ـ رضي الله عنه ـ ) لەم بارەیەوە جیاوازی نێوان (وتاربێژ ـ خطیب ـ) و ( زانا ـ فقیه ـ) دەکات لە ئاماژەیەکی خۆ ئامادەکردن بۆ کاتە سەختەکان کە دەفەرمێت:

**(ئێوە لە زەمانێکن زانا زۆرن و وتاربێژ کەمن، زەمانێکتان بەسەردا دێت وتاربێژ زۆر دەبن و زانا کەم دەبن).**

---

(١) البقرة: ٢٦٩ .

(٢) بەمە دەگوترێت:(فقە التنزيل = چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەحکامە شەرعییەکان لە واقیعی ڕۆژانەدا) ينظر: الإستقامة لشيخ الإسلام (١١\١ ط. محمد رشاد سالم) و و زاد المعاد (٤٧٢\٥ ط. المؤسسة) و الفوائد(١٣٢٢\٤ ط. عالم الفوائد) كلهما لإبن القيم.

مەبەست ئاگاداركردنەوەی موسڵمانانە لەو زەمانەی كە وتاربێژان تەنها حەماسیان پێیە لەسەر مینبەری مزگەوتەكان بەبێ دانایی و بە هاوار هاوار بە ناوی ئیسلام پەیامەكەیان دەگەیەنن و ئەو زانایانە كەم دەبن كە خاوەن حیكمەت و داناییين لە گەیاندنی پەیامی ئیسلام، كە زەمانی ئەمڕۆمانە، كاتێك دەبینین وتاربێژی سەر مینبەر بە جوێندان[١] وەڵامی لیبراڵییەك[٢] دەداتەوە كە زۆر بە جوانی شوبهەی خۆی بە خەڵك گەیاندووە! بەمە زەرەری وتاربێژەكە زۆر لە زەرەری لیبراڵییەكە زیاتر دەبێت بۆ سەر ئیسلام و موسڵمانان. چونكە وتاربێژەكە (توانایی) لە دەقی شەرعی وەرگرتووە بۆ ئینكار كردنی خراپە، بەڵام بەبێ (دانایی) ئەمە دەردێكی كوشندەیە كە باسكردنی لەم بنەمایەدا هەنگاوێكە بۆ چارەسەركردنی.

﴿ يُؤۡتِي ٱلۡحِكۡمَةَ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُؤۡتَ ٱلۡحِكۡمَةَ فَقَدۡ أُوتِيَ خَيۡرٗا كَثِيرٗاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٦٩ ﴾ (البقرة)

لە بنەمای دوازدەمدا ـ بە پشت بەستن بەخودا ـ باسی قوتابخانەیەكی فێربوونی دانایی دەكەین كە بریتییە لە خوێندنەوەی كاتی ڕابردوو بۆ هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆ و داهاتوو:

---

(١) قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (( إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيْسَ بِاللَّعَّانِ، وَلَا الطَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ)) رواه أحمد و غيره.

(٢) ينظر: ( كتاب العقلية الليبرالية في رصف العقل.. و وصف النقل... ) تأليف: عبدالعزيز الطريفي.

## بنەمای دوازدەم:

## خوێندنەوەی کاتی ڕابردوو مەرجە لە هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆ و داهاتوو

تەنها ئەو کەسەی بە جوانی مێژوو (کاتی ڕابردوو) دەخوێنێتەوە توانای هەیە بەجوانی ئەمڕۆ و کاتی داهاتوو هەڵسەنگێنێت، بۆ گەورەیی و گرنگی خوێندنەوەی مێژوو ئەوەندە بەسە کە بەشی هەرە زۆری لاپەڕەکانی قورئانی پیرۆز بە مێژووی پێغەمبەران و پیاوچاکان لەگەڵ قەومەکانیان ڕازاوەتەوە، چونکە بەسەرهاتە مێژوویەکانی کاتی ڕابردوو باشترین قوتابخانەی وەگەڕخستنی هزری مرۆڤن بۆ داهێنان لە ئەمڕۆ و کاتی داهاتوودا و باشترین قوتابخانەی هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکانن لە ئەمڕۆ و کاتی داهاتوودا.

هەر لەبەر ئەمەش مرۆڤی خوێنەر خاوەن درێژترین تەمەنە، چونکە لە ڕووی هزرییەوە لە پێشەخۆ ژیاوە و لە پاشەخۆش دەژیت! لە ئەمڕۆی ژیانیشیدا خاوەن بڕیاری دروستە، چونکە خوێندنەوەیەکی دروستی هەبوو بۆ ڕابردوو و هەڵسەنگاندنێکی دروستیشی هەیە بۆ داهاتوو. بۆ ئەوەی گرنگی ئەم بنەمایەمان بۆ دەرکەوێت لەسەر دوو کەسایەتی مێژوویی دەوەستین:

* یەکەمیان دامەزرێنەری دەوڵەتە (معاوية بن أبي سفيان ( رضي الله عنه) ـ مؤسس الدولة الأموية ـ).

* دووەمیان ڕۆخێنەری دەوڵەتە (المستعصم بالله (رحمه الله) ـ آخر خلفاء الدولة العباسية ـ)

## بەرنامەی ڕێکخستنی کاتی ڕۆژ و شەو لای معاویە (رضي الله عنه)

بەخوێندنەوەیەك لە ژیاننامەی ئەم سەرکردە لێهاتووە دەتوانین بەرنامەی ڕێکخستنی کاتی ڕۆژ و شەوی بە بیست خاڵ باس بکەین کە ئەمانەن(١) :

١ ـ نوێژی بەیانی لە مزگەوت.

٢ ـ گوێگرتن لە کەسێکی سەرهاتزان کە سەرهاتە مێژوویەکان دەگێڕێتەوە دوای نوێژی بەیانی لە مزگەوت، ئەم بەسەرهاتانە پەند و ئامۆژگاری زۆریان تیادابوو.

٣ ـ خوێندنەوەی یەك جوزئی قورئان.

٤ ـ گەڕانەوە بۆ ماڵەکەی و ئامۆژگاریکردنیان.

٥ ـ کۆتایی هێنانی مەجلیسی ئامۆژگاری ماڵەوە بە چوار ڕکاعەت نوێژ.

٦ ـ دەرچوون بۆ مەجلیسی بەڕێوەبردنی کارەکانی کە کەسە تایبەتەکان و ڕاوێژکار و وەزیرانی لەگەڵی کۆدەبوونەوە مشتومڕی کاری ڕۆژانەیان دەکرد پلانی کاری ڕۆژیان دادەڕشت تاوەکو شەو.

٧ ـ نان خواردن، قسەکردن بۆ کەسە تایبەتەکانی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

٨ ـ دەرچوون بۆ مزگەوت، کورسییان بۆ دادەنا پاسەوانان لەسەر سەری دەوەستان ئەویش دادەنیشت بۆ داواکاری خەڵك لە ئافرەت و بێکەس و هەژار و ستەملێکراو و لێقەوماو و هەر خاوەن پێداویستییەك ... گوێبیستی هەر هەمووان دەبوو بە ڕازیبوونەوە بەڕێیدەکردن .

٩ ـ پاشان لە کورسی مزگەوتەوە بۆ کورسی حوکم و لەگەڵ ئەشرافی خەڵك دادەنیشت و پاش باسی نیعمەتەکانی خودا، داوای لە کاربەدەستانی دەکرد کە ئاگاداری بکەنەوە لە

---

(١) بڕوانە: مروج الذهب للمسعودي (٣٩\٣ ـ ٤١ ط. دار الفكر) و كتاب: (إنتقاد كتاب تأريخ التمدن الإسلامي ص٣٨،٤١ ط. المنار ). تأليف: شبلي النعماني .

و لدرء الشبهات حول سيرة خال المؤمنين معاوية بن أبو سفيان ينظر: كتاب: (سل السنان في الذب عن معوية بن أبي سفيان ـ رضي الله عنه ـ ط. دار العاصمة) تأليف سعد بن ضيدان السبيعي.

سڵاودانەوەی ئەو کەسەی سڵاو دەکات، داوای لە ئەشرافی خەڵك دەکرد کە پێداویستییەکانی ئەو خەڵکانە پێی بگەیەنن کە دەستیان بەو ناگات، ئەوانیش فەرمانەکەیان بە جێدەگەیاند.

١٠ ـ دانانی سفرەی خواردن، لەسەر سفرەی خواردن دوو پاروی دەخوارد و گوێبیستی نووسەرەکەی دەبوو کە پێداویستییەکانی خەڵك بۆی بەرزدەکردنەوە، ئەویش گوێبیستی دەبوو و فەرمانەکانی دەردەکرد، جاری وا هەبوو لە سەر سفرەی نان خواردن زیاتر لە چل داواکاری خاوەن پێویستییەکان بۆی بەرزدەکرانەوە، لەپاشان سفرەیان هەڵدەگرت و ئەویش ڕوخسەتی لە خەڵك وەردەگرت و دەگەڕایەوە ماڵەوە.

١١ ـ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە کاتی پشوودانی تاوەکو نوێژی نیوەڕۆ.

١٢ ـ لەگەڵ بانگی نیوەڕۆ نوێژی لە مزگەوت دەکرد، دەگەڕاوە بۆ ماڵەوە چوار ڕکاعەت نوێژی دەکرد.

١٣ ـ پاش نیوەڕۆ لەگەڵ پلەتایبەتەکان لە وەزیران و ڕاوێژکاران و نزیکەکانی خۆی دادەنیشت بۆ جاری دووەم فەرمانەکانی دەردەکردن بۆ وەزیر و پلەبەرزەکانی بۆ ئەوەی لە هەمان ڕۆژدا جێبەجێ بکەن، مەجلیسی کۆبوونەوەکە تاوەکو نوێژی عەصر بەردەوام دەبوو، لە زستانان لەم مەجلیسە تایبەتەدا شیرینی دەخوارد لە هاوینانیشدا میوە.

١٤ ـ لە پاشان دەردەچوو بۆ نوێژی عەصر لە مزگەوت و لەوێشەوە بۆ ماڵەوە کاتی پشوودانی تاکو بەرەبەرەی مەغریب .

١٥ ـ لە بەرەبەرەی مەغریب دەردەچوو بۆ مەجلیسەکەی، نانی عیشای لەگەڵ ئەشرافی خەڵك دەخوارد و ڕێی نەدەدا پێداویستییەکان بۆی بەرزبکرێنەوە تا ڕۆژی پاشتر.

١٦ ـ لەگەڵ بانگی مەغریب لە مەجلیسەکەی هەڵدەستا بۆ نوێژی مەغریب لە پاش نوێژی مەغریبیش چوار ڕکاعەتی دەکرد لە هەر ڕکاعەتێکیشدا پەنجا ئایەتی دەخوێندەوە، هەندێك جار بەدەنگ وە هەندێك جار بێدەنگ، لە پاشان دەچووە ماڵەوە پشووی دەدا تاوەکو بانگی عیشا.

١٧ ـ لەگەڵ بانگی عیشا دەردەچوو بۆ نوێژ لە مزگەوت. لە پاش نوێژیش شەوەکەی دەکردە سێ بەش:

١٨ ـ بەشی یەکەمی شەو لەگەڵ ڕاوێژکار و وەزیرەکانی دادەنیشت بۆ جاری سێیەم باسی کاروباری بەڕێوەبردن و فەرماندان و بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی دەکرد. هەروەها باسی مێژووی عەرەب و عەجەم و مەلیکەکانیان دەکرد ئایا چۆن سیاسەتی خەڵکیان کردووە؟ کاروباری جەنگ و ئاشتییان لەگەڵ نەیارانیان بەڕێوەبردووە؟ لە پاشان بە خواردنی هەندێك شیرینەمەنی مەجلیسەکەیان کۆتایی دەهێنا.

١٩ ـ بەشی دووەمی شەو دەنووست. تەنها یەك ڕکاعەت ویتری دەکرد.

٢٠ ـ بەشی سێیەمی شەو هەڵدەستاوە لە خەو کاتی خوێندنەوەی مێژووبوو تاکو نوێژی بەیانی، خوێندنەوەکەش لە چەندین کتێبێك بوو کە کۆمەڵە گەنجێکی لێهاتوو و شارەزا دەیانخوێندەوە ئەویش گوێبیستی دەبوو، تاوەکو بانگی بەیانی.

(٢١=١) نوێژی بەیانی لە مزگەوت دەکرد (هەمان بەرنامە دووبارە دەبوویەوە).

ئەمە خشتەی کاری ڕۆژانەی سەرکردەیەکە کە دامەزرێنەری دەوڵەتێکە زیاتر لە سەدەیەکی زێڕین حوکمی لە هەموو ئوممەتی ئیسلام کردووە و چەند تێبینییەك لە بەرنامەی ڕۆژانەی ئەم سەرکردەیە دێنە بەرچاومان گرنگترینیان کە جێی شاهێدە بۆ ئەم بنەمایە(خوێندنەوەی کاتی ڕابردوو، مەرجە لە هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆ و داهاتوو) بریتییە لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و مێژوو و گوێبیستی بەسەرهاتەکانی کە بەشێکی زۆری ساتەکانی شەو و ڕۆژی ئەم سەرکردەیەی داپۆشیوە، هەر ئەمەش نهێنی لێهاتوویی ئەم سەرکردەیەیە، چونکە بەزۆری خوێندنەوە جوانی لە هەڵسوکەوت و دروستی لە بڕیاردان دەردەکەوێت.

## بێ بەرنامەیی ڕێکخستنی کاتی ڕۆژ و شەو
## لای مستعصم بالله العباسی(رحمه الله و غفرله)

ئەگەر شەو و ڕۆژی معاويه (رضي الله عنه) نمونەی بەرنامەیەکی چڕ و پوختی بەگەڕخستنی کات بێت: لە شەودا خوێندنەوەی مێژوو و ئالوگۆڕی هزر و بۆچوونەکانی بەڕێوەبردنی موڵك، لە ڕۆژیشدا وەگەڕخستنی ئەم پلان و بۆچوونانە بە مەشورەتی شارەزایان و گوێبیستنی ئەو بۆ خاوەن پێداویستییەکان، بێ ئەوەی کەمتەرخەمییەك بخاتە مافی خێزانەکەی وەکو پشوو و ئامۆژگاری یان مافی خوداپەرستییەکەی وەکو قورئان خوێندن و نوێژ، ئەوا بەداخەوە شەو و ڕۆژی (مستعصم بالله)[(١)] نمونەی لاوازی و بێبەرنامەیی بوو لە ڕێکخستنی کاتدا، ئەگەر لەسەر چەند لایەنێکی نەخوازراوی ژیانی ڕۆژانەی بوەستین بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە (مستعصم بالله) سەرەڕای ئەوەی کە ئەهلی سوننە و جەماعەت بوو[(٢)] لە فەرمودەزانیشدا دەستێکی هەبووە[(٣)] بەڵام ڕۆخێنەری دەوڵەتی عەباسییە بەهۆی خراپی بەڕێوەبردن و لاوازی کەسایەتییەکەی[(٤)]!

با لەسەر چەند ساتێکی شەو و ڕۆژی بوەستین:

---

(١) خەلیفەی(٣٧) سی و حەفتەمینی دەوڵەتی عەباسییە لە (٦٠٩ ك) لە دایکبووە، لە ساڵی(٦٤٠ ك) بەیعەتی خەلافەی وەرگرتووە، لەساڵی (٦٥٦ ك) بەدەستی مەغولەکان شەهیدکراوە کە بەشەهیدکردنی دەوڵەتی عەباسی پاش (٥٢٤) ساڵی تەمەنی کۆتایی هات. بڕوانە: فوات الوفيات لمحمد بن شاكر الكتبي(٢\٢٣٠ - ٢٣٤ ط.دارالثقافة ) و البداية و النهاية لإبن كثير (١٧\٣٦٦).

(٢) قال ابن كثير (البداية و النهاية ١٧\٣٦٦) واصفاً المستعصم بالله: (وَقَدْ كَانَ رَحِمَهُ اللَّهُ سُنِّيًّا عَلَى طَرِيقَةِ السَّلَفِ وَاعْتِقَادِ الْجَمَاعَةِ كَمَا كَانَ أَبُوهُ وَجَدُّهُ، وَلَكِنْ كَانَ فِيهِ لِينٌ وَعَدَمُ تَيَقُّظٍ وَمَحَبَّةٌ لِلْمَالِ وَجَمْعِهِ...) .

(٣) ذكره الحسيني في صلة التكملة. ينظر: الأعلام للزركلي (٤\١٤٠).

(٤)* قال ابن تغري بردي(النجوم الزاهرة ٧\٦٠ ط. دار الكتب العلمية) يصفه: (وكان قليل المعرفة بتدبير الملك، نازل الهمة، مهملاً للأمور المهمة، محباً لجمع المال ...) و قال في موضع آخر(٧\٤٣) : (وكان المستعصم خلياً عن الرأي...).

١ ــ بە ڕۆژ خەریکی کوتر بازی بوو[١] !

٢ ــ بەشەو گوێبیستی سەمای شۆخەکچێك بووە بەناوی عەرفە[٢] !

ئەم جۆرە بەفیڕۆدانەی کاتیش لێکەوتەی خراپی لێکەوتەوە لەسەر کەسایەتییەکەی لە چەندین ڕوویەوە لەوانە:

---

* قال ابن العبري(تأريخ مختصر الدول ص٤٤٥ ـ ٤٤٦): وكان(أي المستعصم) ضعيف الرأي قليل العزم كثير الغفلة عما يجب لتدبير الدول.... )

(١) قال ابن العبري(تأريخ مختصر الدول ص٤٤٥): وكان (أي المستعصم بالله) صاحب لهو وقصف شغف بلعب الطيور واستولت عليه النساء) و ينظر: أبيات لمجالدين النشابي الكاتب المولود في إربل سنة ٥٨٢ هـ في حال الخليفة و أعوانه في كتاب (الغزو المغولي أحداثٌ و اشعار ص٣٠ ـ ٣٢ ط.دار البشير\عمان) جمعه مأمون جرار.

(٢) * قال ابن كثير (البداية و النهاية ١٧\٣٥٦ ـ ٣٥٧ ت.تركي): ثُمَّ دَخَلَتْ سَنَةُ سِتٍ وَخَمْسِينَ وَسِتِّمِائَةٍ. الْأَحْدَاثُ الْوَاقِعَةُ فِيهَا: فِيهَا أَخَذَتِ التَّتَارُ بَغْدَادَ ... وَأَحَاطَ التَّتَارُ بِدَارِ الْخِلَافَةِ يَرْشُقُونَهَا بِالنُّشَّابِ مِنْ كُلِّ جَانِبٍ، حَتَّى أُصِيبَتْ جَارِيَةٌ كَانَتْ تَلْعَبُ بَيْنَ يَدَيِ الْخَلِيفَةِ وَتُضْحِكُهُ، وَكَانَتْ مِنْ جُمْلَةِ الْحَظَايَا، وَكَانَتْ مُوَلَّدَةً تُسَمَّى عَرَفَةَ، جَاءَهَا سَهْمٌ مِنْ بَعْضِ الشَّبَابِيكِ فَقَتَلَهَا وَهِيَ تَرْقُصُ بَيْنَ يَدَيِ الْخَلِيفَةِ، فَانْزَعَجَ الْخَلِيفَةُ مِنْ ذَلِكَ، وَفَزِعَ فَزَعًا شَدِيدًا، وَأَحْضَرَ السَّهْمَ الَّذِي أَصَابَهَا بَيْنَ يَدَيْهِ، فَإِذَا عَلَيْهِ مَكْتُوبٌ: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ إِنْفَاذَ قَضَائِهِ وَقَدَرِهِ سَلَبَ ذَوِي الْعُقُولِ عُقُولَهُمْ. فَأَمَرَ الْخَلِيفَةُ عِنْدَ ذَلِكَ بِزِيَادَةِ الِاحْتِرَازِ، وَكَثْرَةِ السَّتَائِرِ عَلَى دَارِ الْخِلَافَةِ!!

* قال ابن العبري (تأريخ مختصر الدول ص٤٧٥) يصف دخول هولاكو دار الخلافة ببغداد: ولما رأى الخليفة ان لا بد من الخروج أراد او لم يرد استأذن هولاكو بأن يحضر بين يديه فأذن له وخرج رابع صفر ومعه أولاده واهله. فتقدم هولاكو ان ينزلوه بباب كلواذ وشرع العساكر في نهب بغداد ودخل بنفسه الى بغداد ليشاهد دار الخليفة وتقدّم بإحضار الخليفة فاحضروه ومثل بين يديه وقدم جواهر نفيسة ولآلئ ودررا معبّاة في أطباق ففرّق هولاكو جميعها على الأمراء وعند المساء خرج الى منزله وامر الخليفة ان يفرز جميع النساء التي باشرهن هو وبنوه ويعزلهنّ عن غيرهنّ ففعل فكنّ سبعمائة امرأة فاخرجهن ومعهنّ ثلاثمائة خادم خصيّ.

* ( ومما اشتهر عنه ـ أي عن الستعصم ـ أنه كتب إلى بدر الدين لؤلؤ صاحب الموصل يطلب منه جماعة من ذوي الطرب وفي نفس الوقت وصل رسول هولاكو إلى صاحب الموصل نفسه يطلب منه منجنيقات، وآلات حصار، فقال بدر الدين: **انظروا إلى المطلوبَيْنِ، وأبكوا على الإسلام وأهله**) ينظر: الوافي بالوفيات (١\٢٤٦) المغول بين الإنتشار و الإنكسار ص٤٩ .

١ ـ ئارەزوومەندی بۆ کۆکردنەوەی ماڵی دونیا، وەکو پێویستییەکی کات بەسەربردن بە هەر شێوەیەك بێت لەوانە:

* هێزە سەربازییەکانی کەمکردەوە! تاوەکو پارەی خەرجکراو لە هێزی سەربازی بۆ خەزێنە تایبەتەکانی بگەڕێتەوە [١] .

* ماڵی خەڵکی بە ستەم وەردەگرت لە خەزێنە تایبەتەکانی (دار الخلافة) کۆی دەکردەوە[٢] !

٢ ـ لاوازبوون لە هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان و هەڵبژاردنی وەزیرەکان[٣] !

---

(١) قال ابن كثير في البداية والنهاية (٣٦٦\١٧ ت: التركي) واصفاً حال جيش الخلافة عندما أحاط بدارها التتار: (وَجُنُودُ بَغْدَادَ فِي غَايَةِ الْقِلَّةِ وَنِهَايَةِ الذِّلَّةِ، لَا يَبْلُغُونَ عَشَرَةَ آلَافِ فَارِسٍ، وَهُمْ فِي غَايَةِ الضَّعْفِ، وَبَقِيَّةُ الْجَيْشِ كُلُّهُمْ قَدْ صُرِفُوا عَنْ إِقْطَاعَاتِهِمْ حَتَّى اسْتَعْطَى كَثِيرٌ مِنْهُمْ فِي الْأَسْوَاقِ وَأَبْوَابِ الْمَسَاجِدِ، وَأَنْشَدَ فِيهِمُ الشُّعَرَاءُ الْقَصَائِدَ يَرْثُونَ لَهُمْ، وَيَحْزَنُونَ عَلَى الْإِسْلَامِ وَأَهْلِهِ، وَذَلِكَ كُلُّهُ عَنْ آرَاءِ الْوَزِيرِ ابْنِ الْعَلْقَمِيِّ الرَّافِضِيِّ ...) و ينظر: لطيفة في الموازنة بين الجند و المال في كتاب (سراج الملوك للطرطوشي ص٢٣٢)

(٢) قال ابن كثير في البداية والنهاية (٣٦٦\١٧ ت: التركي): (كَانَ فِيهِ لِينٌ وَعَدَمُ تَيَقُّظٍ وَمَحَبَّةٌ لِلْمَالِ وَجَمْعِهِ، وَمِنْ جُمْلَةِ ذَلِكَ أَنَّهُ غَلَّ الْوَدِيعَةَ الَّتِي اسْتَوْدَعَهُ إِيَّاهَا النَّاصِرُ دَاوُدُ بْنُ الْمُعَظَّمِ، وَكَانَتْ قِيمَتُهَا نَحْوًا مِنْ مِائَةِ أَلْفِ دِينَارٍ، فَاسْتُقْبِحَ هَذَا مِنْ مِثْلِ الْخَلِيفَةِ، وَهُوَ مُسْتَقْبَحٌ مِمَّنْ هُوَ دُونَهُ بِكَثِيرٍ، بَلْ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ مَنْ إِنْ تَأْمَنْهُ بِقِنْطَارٍ يُؤَدِّهِ إِلَيْكَ...).

(٣) قال ابن العبري(تأريخ مختصر الدول ص٤٤٥ ـ ٤٤٦): ( وكان ـ أي المستعصم ـ ضعيف الرأي قليل العزم كثير الغفلة عما يجب لتدبير الدول وكان إذا نبّه علي ما ينبغي ان يفعله في امر التاتار اما المداراة والدخول في طاعتهم وتوخي مرضاتهم او تَجْيِّش العساكر وملتقاهم بتخوم خراسان قبل تمكنهم واستيلائهم على العراق فكان يقول: انا بغداد تكفيني ولا يستكثرونها لي إذا نزلت لهم عن باقي البلاد ولا ايضا يهجمون عليّ وانا بها وهي بيتي ودار مقامي. فهذه الخيالات الفاسدة وأمثالها عدلت به عن الصواب فأصيب بمكاره لم تخطر بباله.)

بل أفسد من هذا ما ذكره الدكتور سيد الباز العربي في كتابه (المغول ص٢١٧): فمما ذكره من سفاهة الخليفة إنه شكل جيشاً من المرتزقة غير أنه لم يؤدي لهم أرزاقهم! و أسفه من هذا أنه صدق الفلكين السُّنين بأنه سوف يحدث معجزات وكرامات ما يهدد هولاكو ولن تشرق الشمس إن تجرأ هولاكو على غزو بغداد، بل سيحدث زلازل و يندلع وباء يفني الجيش المغولي!.

تاوەکو ڕۆژە ڕەشەکانی بەسەردا هات وەزیرە شیعیەکەی (ابن العلقمی)[١] بە خیانەت دەستی مەغولی گرت بۆ بەغدا و کارەساتی کاولکاری بەغدا ڕوویدا[٢].

(مستعصم بالله) بە سەرشۆڕییەوە خەزێنە تایبەتەکانی بە دیاری بۆ هولاکوی دوژمنی برد، تاوەکو لە کوشتن ڕزگاری بێت، بەڵام ماڵەکەی بەهانایەوە نەهات، پاش برسی کردنی، داوای هەندێك خواردنی لە هولاکو کرد، هولاکوش قاپێکی پڕ زێڕی لە پێش دانا و پێی گوت: بیخۆ! تۆ ئەم زێڕەت لە هێزەچەکدارەکانت خەرجکردبا تا ئەمەت بەسەر نەهاتبا[٣] !

لە پاشان فەرمانی کوشتنی دەرکرد و خەزێنە تایبەتەکانیشی بەسەر لەشکرە داگیرکەرەکەی دابەشکردن، کۆتایی بەدەوڵەتی عەباسی هێنا بەشێوەیەك کە تەنها دەتوانین بڵێین: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾[٤] .



---

(١) حول خيانة ابن العلقمي ينظر:

* شذرات الذهب في أخبار من ذهب لإبن العماد (٧\٤٦٧ ط.مؤسسة الرسالة).

* سير أعلام النبلاء لذهبي(٢٣\١٧٥).

* البداية و النهاية لإبن كثير (١٧\٣٥٦ ـ ٣٦١).

* النجوم الزاهرة لإبن تغري بردي (ط.دار الكتب العلمية ٧\٤٤ ـ حاشية المحقق و بحث غير محرر في تبرئة ابن العلقمي! ـ).

(٢) لە پێش عەلقەمیش مولحیدو ناپاکی گەورە (الخواجة نصيرالدين الطوسي) ڕێخۆشکەری ئەم خیانەتەبوو. بڕوانە: مجلة المؤرخ العربي (العدد٢٧ ص١٣١ ـ١٣٩).

(٣) ينظر: النجوم الزاهرة (٧\٦٠ ط. دار الكتب العلمية) و مجلة المورد ـ العراقية ـ (العدد٤ المجلد٨ سنة ١٩٧٩ ص٦٤).

(٤) البقرة: ١٥٦.

**با لە بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوە ئەمەی باسکرا نمونەی دوو سەرکردەیە:**

ـــ یەکەمیان مێژووناس و کاربەجێ و **خاوەن بەرنامە لە پاراستنی کات** بە خوێندنی ڕابردوو و هەڵسەنگاندنی داهاتوو و بڕیاردانی ئێستا.

ـــ دووەمیان **نرخی کاتی نەدەزانی** و بەڕابواردن تێدەگەیشت.

یەکەمیان دامەزرێنەری دەوڵەت بوو بۆ خۆی و نەوەکانی، کە سەربەرزی ئیسلام و موسڵمانانی تێدابوو، دووەمیان ڕۆخێنەری دەوڵەتەکەی بوو لە خۆی و نەوەکانی، کە زیلەتی موسڵمانان و بەرزبوونەوەی ئاڵای دوژمنانی ئیسلامی لێکەوتەوە!

تۆی خوێنەریش سەرکردەی، لە سنورە ئاساییەکانی ڕۆژ و شەوی ژیانت، لە یەکێك لەم دوو سەرکردەیە نزیکی، سەرکردەیەك پارێزگاری کات دەکات بۆ پێشخستنی دەوڵەتەکەی، ئەوەی دیکە پارێزگاری سامانەکەی دەکات بۆ زیاتر ڕابواردن لەسەر حیسابی دەوڵەتەکەی. ئەمەی باسکرا خاڵی گرنگی ژیانی هەموو تاکە کەسێکە.

پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لەباسی ئەم تاکە کەسەدا دەفەرمێت: ((كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ، فَالْأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ زَوْجِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ، وَالْعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ ))[(١)] و دەفەرمێت: (لَا تَزُولُ قَدْمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ: عَنْ شَبَابِهِ فِيمَا أَبْلَاهُ، وَعَنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ مَاذَا عَمِلَ فِيهِ ) [(٢)] هەروەها زانای پایەدار حەسەنی بەصری باسی ئەم خاڵە دەکات کە لە جیاوازی نێوان هەڤاڵانی پێغەمبەرمان

---

(١) متفقٌ عليه.

(٢) أخرجه البزار في مسنده(٢٦٦\٤ رقم:١٤٣٥) و اللفظ له، و الترمذي في جامعه (١٩٠\٤ط. بشار) وقال حسنٌ صحصح.

(صلى الله عليه وسلم) و خەڵکانی دیکەی پاش ئەوان دەفەرمێت: (خەڵکانێکم بینیون ـ مەبەست لە هەڤاڵانی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم) ـ، چۆن ئێوە پارە و پۆلتان دەپارێزن ئەوانە ئەوها کاتەکانیان دەپاراست ).

لە کۆتایی ئەم بنەمایەش ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین کە ئەمەی باسکرا لەم بنەمایەدا، خودای پەروەردگار لە دەیان ئایەتی قورئانی پیرۆز مرۆڤی موسڵمانی لێی ئاگادارکردووتەوە و هانی داوە بۆ ئیعتیبارکردن بە کردەوەی ئەوانەی پێشەخۆی لە پێناو هەڵسەنگاندنی ئەمڕۆ و دوارۆژدا، لەوانە ئایەتی:

﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ [١] و ئایەتی ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ [٢] و لە باسی غەرقکردنی قەومی نوح(علیه السلام)دا دەفەرمێت : ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ﴾[٣] و لە باس بەردبارانکردنی قەومی لوط(علیه السلام)دا دەفەرمێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ﴾[٤] و ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ [٥] و لە باسی ڕزگاربوونی یونس(علیه السلام) بە تەوحید دەفەرمێت: ﴿وَذَا النُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِي الظُّلُمَاتِ أَن لَّا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ﴾

---

(١) آل عمران: ١٣٧.

(٢) الحج : ٤٦.

(٣) الشعراء:١٢١.

(٤) الحجر: ٧٥.

(٥) الحجر: ٧٧.

لەپاشان دەفەرمێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٨٨﴾ [١] واتە ئەمە تایبەت نییە بە یونس(علیه السلام)، بەڵکو هەموو هەڵگرێکی پەیامی یونس(علیه السلام) کە پەیامی گشت پێغەمبەرانە(علیهم السلام): ﴿لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ بەر ئەم ڕزگاربوونە دەکەوێت، هەروەك ئایەتەکانی پێشتر ئاماژەن بۆ لەناوبردنی هەموو سەرپێچیکارێکی پەیامی پێغەمبەران (علیهم السلام) کە پەروردگار بە حیکمەتی خۆی دەزانێت کەی؟ و لە کوێ؟ و چۆن ؟ ئەم لەناوبردنە ڕوودەدات و ئەم ڕزگارکردنە دێتەجێ.

ئەمەش ئەوەدەگەیەنێت کە هەموو کات زانستی شەرعی لە دڵی موسڵماندا سەرکردایەتی هوشمەندی و هەڵسوکەوتی موسڵمانی ڕاستەقینە دەکات وەك لە بنەمای سێزدەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

(١) الأنبياء : ٨٧ ـ ٨٨.

## بنەمای سێزدەم:

## سەرکردایەتی گۆشەی سەرەوە لە هاوکێشەی لێکدانی نێوان سێگۆشەی وزە و سێگۆشەی مادده.

بۆ تێگەیشتنی ئەم بنەمایە گرنگە با یەکەم جار تەماشای تابلۆی هاوکێشەکە بکەین:




ئەمە تابلۆی هاوکێشەی ژیانە کە پێکەوە ئیش دەکات، مەرجی سەرکەوتنیشی لە کارەکانیدا ئەوەیە کە جلەوی سەرکردایەتی لە گۆشەی سەرەوەی سێگۆشەکانە کە بریتییە لە (دڵ، زانستی شەرعی) وەك لە هاوکێشەی یەکەمدا دەبینین:

{دڵ(قلب) × زانستی شەرعی (علم) =(دڵێکی ئاسوودەی ژیر، زانستێکی سوود بەخشی کارا)}ـــــــ(١)

پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: (ألاَ وإِنَّ في الجسدِ مُضْغَةً؛ إذا صلَحتْ صلَحَ الجسَدُ كلُّهُ، وإذا فَسَدَتْ فَسَدَ الجسَدُ كلُّهُ، ألاَ وهْيَ الْقَلْبُ)[١].

---

(١) متفقٌ عليه

واتە: (پارچە گوشتێك لە جەستەی مرۆڤدا هەیە هەركاتێك ئیصلاح بوو، ئەوا گشت ئەندامەكانی جەستە ئیصلاح دەبن، هەركاتێك گەندەڵ بوو، ئەوا گشت ئەندامەكانی جەستە گەندەڵ دەبن، پارچە گوشتەكەش دڵە).

لەباسی ئیصلاحبوونی دڵ زانایانمان دەڵێن: **دڵ چەند ساغلەم بێت ناتوانێت ڕاستییەكانی ژیان ببینێت، تاوەكو بە نوری وەحی ڕووناك نەكرێتەوە، وەكو چاو چەند ساغلەم بێت توانای بینینی نابێت، تاوەكو بە ڕووناكی چرایەك دەوروبەری ڕووناك نەكرێتەوە**.

كەواتە ئیصلاحبوونی دڵ بە تێگەیشتنی قورئان و فەرموودە و زانستی شەرعییە، گەندەڵبوونی دڵیش بە پشت تێكردنە لە قورئان و فەرموودە و زانستی شەرعی. لەوێشەوە صەلاحی جەستە و عەقل دەردەكەوێت بەكردەوەی چاك و بیركردنەوەی چاك، گەندەڵی جەستە و عەقلیش دەردەكەوێت بە كردەوەی خراپ و بیركردنەوەی خراپ. چونكە كاتێك دڵ و زانستی شەرعی بەیەك دەگەن، ئەوا عەقل هوشمەند و ژیر دەبێت لە بیركردنەوە و هەڵسەنگاندن، جەستەش كردەوەی چاكە ئەنجامدەدات. كاری جوان بیركردنەوەی عەقل و كاری چاكەكاری جەستەش مەرجن لە ئیمانی دڵ كە ئەم ئیمانە بریتییە لە نوری زانستی شەرعی و نوری فیترەت لە دڵدا، بۆیەش زیاتر لە پەنجا جار وشەی {(ئیمان) و (چاكەكاری) ﴿ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾} لە قورئانی پیرۆزدا پێكەوە هاتووە.

پرسیاری یەکەم لێرەدا ئەوەیە: ئەم هاوکێشەیەی باسکرا چ پەیوەندییەکی بە (کات)ەوە هەیە کە بابەتەکەمانە؟

وەڵام:

سەرکردایەتی (دڵی پڕ زانستی شەرعی) بەردەوامی ـ الإستقامة ـ دەداتە ژیان لەسەر ڕێگای ڕاست ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ جەستە فێری کردەوەی چاکە دەکات و عەقلیش فێری بیرکردنەوەی باش دەکات، هەرکاتێ جڵەوی سەرکردایەتی لەدەست (دڵی پڕ لە زانستی شەرعی) دەرچوو ئەوا:

* جەستە ناتوانێت کردەوەی پەسەند بدۆزێتەوە و نەخۆشییەکانی جەستە دەردەکەون وەکو **ناپەسەندی لە کردەوەدا** بە توندڕەوی و دەستدرێژی بۆ سەر سەر و ماڵی خەڵك، یان کەمتەرخەمی لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکان، ئەوکات هاوکێشەی دووەم بەم شێوەیە دەبینین:

{(جەستە) × (کردەوە) = ∞ (نادیار)}ـــــــــــــــــــــــــــ(٢)

* عەقل ناتوانێت بە پەسەندی بیربکاتەوە و نەخۆشییەکانی عەقل لە ئەنجامی **ناپەسەندی لە بیرکردنەوە** دەردەکەون، ئەوکات هاوکێشەی سێیەم بەم شێوەیە دەبینین:

{(عەقل) × (بیرکردنەوە) = ∞ (نادیا)}ـــــــــــــــــــــــــــ(٣)

نمونەی ناپەسەندی بیرکردنەوەی عەقلیش وەکو توندڕەوی لە بابەتە ڕێپێنەدراوەکاندا وەك:



* چۆنیەتی ناو و سیفەتەکانی خودا[١]،

* بابەتەکانی قەدەر[٢]،

کە دەرگای هەموو بیدعەیەك دەکەنەوە لە شەرعێکی کاملدا [٣]، کە تەواوی و کەمالەکەی لە عەقل و شەرعدا بیدعەو داهێنان قەبوول ناکات.

یان بە کەمتەرخەمی لە پێویستی بیرکردنەوە لە:

* ئەحکامە شەرعییەکان[٤]،

* دیاردە گەردوونیەکان[١]،

---

(١) قال شيخ الإسلام (درء تعارض العقل و النقل ١\٢٧٨): (إن الله تعالى أمر الرسول بالبلاغ المبين وهو أطوع الناس لربه فلا بد أن يكون قد بلغ البلاغ المبين ومع البلاغ المبين لا يكون بيانه ملتبسا مدلسا. والآيات التي ذكر الله فيها أنها متشابهات لا يعلم تأويلها إلا الله إنما نفى عن غيره علم تأويلها لا علم تفسيرها ومعناها كما أنه لما سئل مالك رضي الله تعالى عنه عن قوله تعالى ﴿الرحمن على العرش استوى﴾ (سورة طه:٥) كيف استوى؟ قال: **الإستواء معلوم والكيف مجهول والإيمان به واجب والسؤال عنه بدعة** وكذلك ربيعة قبله فبين مالك أن معنى الإستواء معلوم وأن كيفيته مجهولة فالكيف المجهول هو من التأويل الذي لا يعلمه إلا الله وأما ما يعلم من الإستواء وغيره فهو من التفسير الذي بينه الله ورسوله والله تعالى قد أمرنا أن نتدبر القرآن وأخبر أنه أنزله لنعقله ولا يكون التدبر و العقل إلا لكلام بين المتكلم مراده به...)

(٢) عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ قَالَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ذَاتَ يَوْمٍ وَالنَّاسُ يَتَكَلَّمُونَ فِي الْقَدَرِ قَالَ وَكَأَنَّمَا تَفَقَّأَ فِي وَجْهِهِ حَبُّ الرُّمَّانِ مِنْ الْغَضَبِ قَالَ فَقَالَ لَهُمْ مَا لَكُمْ تَضْرِبُونَ كِتَابَ اللَّهِ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ بِهَذَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ قَالَ فَمَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِمَجْلِسٍ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَمْ أَشْهَدْهُ بِمَا غَبَطْتُ نَفْسِي بِذَلِكَ الْمَجْلِسِ أَنِّي لَمْ أَشْهَدْهُ) أخرجه أحمد(٦٦٦٨) وغيره و صححه الشيخ شعيب الأرنؤوط.

(٣) ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَـٰمَ دِينًا﴾(المائدة: ٣).

(٤) تدبر قوله تعالى في الحث على تعقل الظواهر الكونية: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱلْفُلْكِ ٱلَّتِي تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن مَّآءٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَـٰحِ وَٱلسَّحَابِ ٱلْمُسَخَّرِ بَيْنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (البقرة: ١٦٤).

کە دەرگای هەموو بیدعەیەکی دونیا دادەخەن، لە کاتێکدا کە عەقل و شەرع هانی داهێنان و بیدعەکاری دەدەن لە هەموو کاروبارەکانی دونیادا[٢]، چونکە دونیا کەموکورتی تیادایە و پێویستە کامل بکرێت، وەکو ئەرکێکی خەلافەتی مرۆڤ لەسەر زەوی و دامەزراندنی شارستانیەت[٣].

شەرع کەمالی تیادایە پێویستە وەکو خۆی کاری پێبکرێت، وەکو ئەرکێکی خەلافەتی مرۆڤ لە سەر زەوی و دانی خۆڕەوشتی بەرز بە شارستانیەت.

پرسیاری دووەمیش لێرەدا ئەوەیە بۆچی دەرئەنجامی هاوکێشەی دووەم و سێیەم نادیارە (∞) ؟

وەڵامەکەش ئەوەیە کە بەبێ زانستی شەرعی کە سەرچاوەکەی قورئان و فەرموودەیە ناتوانین وەڵامی دوو هاوکێشەکە بدەینەوە، چونکە دوو هاوکێشەکە لە کاتێکدانە کە (دڵێکی پڕ زانستی شەرعی) لە سەرکردایەتی مرۆڤدا نییە، کەواتە چۆن وەڵام بدات؟! و ئەگەر(دڵێکی پڕ زانستی شەرعی) سەرکردایەتی مرۆڤی کردبا، ئەوا وەڵامەکە ئاسان دەبوو و بەم شێوەیە  دوو هاوکێشەکە ئەنجامی تەواویان دەبوو:

---

(١) تدبرقوله تعالى في الحث على تعقل الأحكام الشرعية: ﴿ قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُمْ مِنْ إِمْلَاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ (الأنعام:١٥١)

(٢) قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) : (إِنْ كَانَ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ دُنْيَاكُمْ فَشَأْنُكُمْ بِهِ، وَإِنْ كَانَ شَيْءٌ مِنْ أَمْرِ دِينِكُمْ فَإِلَيَّ ) (صحيح ابن خزيمة ١\٢٤٥).

(٣) ينظر: الآية رقم: (١٠٠) من سورة يوسف وفيها أن ترك البداوة و سكنى المدن من نعم الله . و أخرج أحمد في مسنده (٣٣٦٢) مرفوعا: (مَنْ سَكَنَ الْبَادِيَةَ، جَفَا) و هو حديثٌ حسنٌ لغيره.

{جەستە × كردەوە = ( جەستەیەكی ساغلەم، كردەوەیەكی چاك )} ـــــ(٤)

{عەقل × بیركردنەوە = ( عەقلێكی ساغلەم، بیركردنەوەیەكی چاك)}ــــ(٥)

ئەم مانایەش لە پێشینان ڕیوایەت كراوە كە دەیان فەرموو: (القلب ملك فإذا طاب الملك طابت جنوده و إذا فسد الملك فسدت جنوده)[1] واتە پادشای ئەندامەكانی مرۆڤ دڵە، ئەگەر خاوێن و باش بوو، ئەوا گشت ئەندامەكان خاوێن و باش دەبن، ئەگەر ناپاك و گەندەڵیش بوو، ئەوا گشت ئەندامەكان ناپاك و گەندەڵ دەبن.

پاكبوونی دڵیش تەنها بە پەیامێكە كە لە ئاسمان دابەزیوە كە قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەرە(صلى الله عليه وسلم)، تۆش لە هەر شوێنێك بیت و لە هەركاتێكدا بیت و هەركارێك ئەنجام بدەیت، تەرازووی دروستی و نادروستیت ئەم پەیامەیە، كە مرۆڤ هاندەدات بۆ زیاتر كار و زیاتر بیركردنەوە و زیاتر خزمەتكردن بە ماندوونەناسییەك كە وشەی (ناتوانم) ناناسێت وەك لە بنەمای چواردەمدا باسی دەكەین ـ إن شاء الله ـ :

---

(١) ينظر: الزهد لأبي داود (٣٨١\١) و نوادر الأصول للحكيم الترمذي(١٩٢\٢) و لا يصح رفعه .

## بنەمای چواردەم:

## زیاتر دەتوانم لەوەی کە دەتوانم

## (سێگۆشەی : مرۆڤ ، خاك ، کات)

خۆڕاهێنانی قوتابییەك کە تەنها لە توانایدایە شەش سەعات بخوێنێت، یان کرێکارێك کە تەنها لە توانایدایە هەشت سەعات کاربکات، یان خاوەن کۆمپانیایەك کە تەنها کاتی بەڕێوەبردنی یەك کۆمپانیای هەیە، یان دایکێك کە تەنها دەتوانێت دوو منداڵ پەروەردە بکات، یان باوکێك کە تەنها دەتوانێت یەك خێزان بەڕێوە ببات ... هتد.

لەوانەیە لە ڕاستی دووربێت نەك لە هزری کەسەکەدا، بەڵکو لە ڕاستی دوور بێت لە واقیعدا، چونکە **مرۆڤ** توانای زیاتری بەخشین و ئاوەدانکردنی **خاك** و وڵاتی هەیە لە دوو**کاتە**کەی شەو و ڕۆژدا، ئەمەش بۆی ساغ دەبێتەوە کاتێك بەخۆداچوونەوەیەك بکات، بەجوانی بیر لە ئایەتی ﴿لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ﴾[١] بکاتەوە و بیر لەوە بکاتەوە کە لای خودا ڕێزدار و خاوەن شکۆیە ﴿۞ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾[٢]، خودای پەروەردگار زۆر بەهرە و هەدیەی پێبەخشیوە، گەڕان بە دوای دوزینەوەیاندا فەرمانپێکراوە لە قورئانی پیرۆزدا: ﴿وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝٢١﴾[٣] واتە: ئینسان لە ناو ناختدا دەیان بەڵگەی گەورەی خۆت هەیە بۆچی نایان بینی ـ هەوڵدە بیان دووزەوە ـ تاوەکو لە دونیادا کاراتر بی و لە خالقەکەت نزیکتر بی.

---

(١) التين: ٤.

(٢) الإسراء: ٧٠.

(٣) الذاريات : ٢١ .



شاعیری گەورەی فارس حافزی شیرازی نزیك بەم مانایانە دەفەرمێت:

دیارییەکانی خودا بۆ مرۆڤ بە نەکراوەیی ماونەتەوە

خودا بەخشیوون، سەیرە مرۆڤ نایکاتەوە

خودا بەخشیوون لە ناخماندا هەن وەکو نەخشە

رێزدار بیان دووزەوە و بە خۆت و ئێمە بیان بەخشە

رێزدار ئەم دیاریانە لەگەڵتن لەوەتەی لەدایکبوون

دووزینەوەیان هاتنی دووەمە بۆ ناو گەردوون[١]

کەواتە مرۆڤ ـ بە جیاوازی ڕەنگ و زۆبان و نەتەوە و ئاینەکان، مەخلوقێکی کارایە و خالقەکەی توانای زۆری پێ بەخشیوە ـ دیاری زۆری پێ بەخشیوە ـ ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾ ڕێزێکی زۆری لێگرتووە بەم دیاریانە﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ﴾، ئەمەش ئاماژەیەکی قورئانییە بۆ گەورەیی مرۆڤ تەنها لەبەرئەوەی کە مرۆڤە و توانای هەڵبژاردنی پێی بەخشراوە لە نێوان چاکە و خراپە و چالاکی و تەمبەڵی کە ئەم توانایە یەکێکە لە گەورەترین دیارییەکانی خودا بۆ مرۆڤ ..

هەڤاڵی پایەبەرز (عمرو بن العاص ـ رضي الله عنه ـ ) لەباسی گەلانی ئەوروپادا دەفەرمێت: (**توانای زوو هەستانەوەیان هەیە پاش کەوتن**)[٢].

---

(١) بەدەستکارییەوە لە ل٧٤ی کیتابی (العادة الثامة) وەرگیراوە.

(٢) قَالَ الْمُسْتَوْرِدُ الْقُرَشِىُّ عِنْدَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ « تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ » . فَقَالَ لَهُ عَمْرٌو : (( أَبْصِرْ مَا تَقُولُ . قَالَ أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالاً أَرْبَعًا:

* إِنَّهُمْ لأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ
* وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ

بەم وشە زێڕینە ڕاستییەك باسدەكات كە مێژوو شاهێدی بوو دەدات، نهێنی ئەم ڕاستییەش كە زوو هەستانەوەیانە پاش كەوتن، دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتنی تاكەكەسی ئەوروپی لە توانای خۆی بۆ هەڵبژاردن و زیاتر كاركردن، ئەمەش مانای ئەو دوو ئایەتەیە كە باسمانكردن:

* ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾.

* ﴿۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ﴾.

كە بە تێگەیشتنی مانای شیانی كاركردن و توانای هەڵبژاردن: ڕێز بە خۆیان دەدەن بە چالاكی لە كاركردن و ڕێز لە تواناكانیان دەگرن و دەڵێن: (**زیاتر دەتوانین لەوەی كە دەتوانین**).

نمونەی ئەم سەدەیەش لەسەر ئەم ڕاستییە وڵاتی ئەلمانیایە كە پاش جەنگی جیهانی دووەم هیچی نەما بێجگە لە: (مرۆڤ ، خاك ، كات) تەنها بە كەمتر لە دە ساڵ پاش دارمانیان لە جەنگی جیهانی دووەم، توانییان پیشەسازییە زەبەلاحەكانیان بە ئەم سەر و ئەوسەری دونیا بگەیەنن، نهێنییەكەش ئەوەبوو كە حكومەتی ئەلمانی لە ساڵی(١٩٤٨ز) دا بڕیاریدا ئەلمانیەكان بە پیاو و ژن و منداڵەوە ڕۆژانە دوو سەعات كار زیاتر لەكاری ڕۆژانەی خۆیان بكەن، وەكو بەخشینێك بە بەرژەوەندی گشتی بەبێ بەرامبەر[1].

---

* وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ
* وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ
* وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ )). رواه مسلم (٢٨٩٨)

(١) ينظر: (شروط النهضة ص١٤٨ ط. دار الفكر) تأليف مالك بن نبي.

پەروەردگاریش دەفەرمێت : ﴿ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ ﴾ (١) ...

بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە ئەوان تەنها بە عەقل توانیان گڕ بەخۆیان بدەن و بە چڕ و پڕی و سوود وەرگرتن لە کات وڵاتەکەیان ئاوەدان بکەنەوە، ئەم ڕاستییەش بە عەقل و شەرع لەسەرمان واجبە کەچی لێی بێئاگاین، ئەم بنەمایەش زەنگێکی هەستانەوەیە لەم بێ ئاگاییەمان، تاوەکو زیاتر لە کاتەکانمان سوودمەندبین بەرەو وڵاتێکی ئاوەدان و ژیانێکی ئاسوودە.

چۆنیەتی ئەم سوودمەندییەش لەکات بە نمونەی باز و مێروولە لە بنەمای پازدەمدا باسی دەکەین ـ إن شاء الله ـ

(١) البقرة: ١٨٤

## بنەمای پازدەم:

### ( جیاوازی کاتی بیرکردنەوە و کاتی کارکردن یان نمونەی باز و مێرووله )

### ـ مرۆڤی سەرکەوتوو وەکو ( باز ) بەرزە فڕە لە کاتی بیرکردنەوە و وەکو ( مێرووله ) ماندوونەناسە لەکاتی کارکردن ـ

بێگومان هیچ هزرێك و کارێك نییە لەکات بەدەر بێت، چونکە هیچ توانایەکمان نییە هزرێك یان کارێك لە دەرەوەی کات ئەنجام بدەین، بۆیە کاتێك بۆمان ڕوون دەبێتەوە ناتوانین دەستی کات ببڕین وەکو ڕاستییەکی بەڵگە نەویست، ئەوا لە سەرمان پێویست دەبێت دەستی ماچکەین! تاوەکو لەگەڵ کات بژین بە ئاسوودەیی.

**پرسیارەکە** ئەوەیە چۆن دەستی کات ماچ بکەین، لە پێناو ژیانێکی ئاسوودە؟

**وەڵامەکە** بە دوو شێوە باسی دەکەین کە دەستپێکی باسی ئەم بنەمایەن:

یەکەمیان: بە بەرزی بیرکردنەوە(العلو في التفكير) لە خۆمان و دەوروبەرمان، تاوەکو بتوانین هەموو شتەکان ببینین، وەکو باز کاتێك لە بەرزایی سەدان مەترەوە نێچیرەکەی دەبینێت و دەستنیشاندەکات و ڕاوی دەکات.

دووەمیان: بە کارکردن لە نزیکەوە (الواجب القريب) تاوەکو هەموو ئەرکێکی نزیك بەجێ بگەیەنین وەکو مێرووله کە ئەوەی دەکەوێتە بەردەمی بۆ کونەکەی ڕادەکێشێت و پاشەکەوتی دەکات.

بەمە دەستی کات ماچدەکرێت و بەرامبەر ئەوەی کات لە ژیانمان دەبات ئێمەش ژیان لە کاتەکە وەردەگرین و لەگەڵی ئاسوودە دەبین!

با ئەم دوو شێوەیەی باسکران لە وەڵامی پرسیارەکە بە نمونە نزیکیان بکەینەوە:

یەکەم: توندڕەوی بەناوی ئاین وەکو نمونەی نزمی لە ئاستی بیرکردنەوە

کاتێك مرۆڤی موسڵمان لە دوورەوە تەماشای دونیا دەکات هەموو گۆی زەوی دەبینێت، دەزانێت تەنها یەك کێشە هەیە ئەویش کێشەی نێوان ڕاستی ئیمان و ناڕاستی کوفرە، بەمە نێچیرەکەی دەستنیشان دەکات (وەکو ئەو بازەی لە بەرزاییەوە تەماشای شتەکان دەکات نێچیرەکەی دەست نیشاندەکات کە هەرگیز ئەم نێچیرەی نەدەدیت ئەگەر بۆ ئەو بەرزاییە بەرز نەبباوە) هەمان شت مرۆڤی موسڵمان، ئەگەر تەنها نزیکەکانی خۆی ببینێت نێچیرەکەی دەست ناکەوێت و بە ناحەق دەکەوێتە گیانی براکەی بە غەیبەتکردن، ئەگەر توانیش بە شمشێر! وەك ئەو کەسەی پاش قورئانخوێندن جیرانەکەی بە شیرك تومەتبار دەکات و بە شمشیر دەداتە سەر ماڵی [١] !

بۆچی ئەم کەسە پاش خوێندنی قورئان تووشی توندڕەوی دەبێت؟ چونکە نەیتوانی دانا بێت و لە بەرزایی ئیمانەوە بیربکاتەوە، تاوەکو بە دروستی کوفر و ئیمان ببینێت و نێچیرەکەی ڕزگارکردنی کافرێك بێت لە کوفر: « فَوَاللَّهِ لأَنْ يُهْدَى بِكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ» [٢] واتە:(سوێند بەو خودایەی ڕۆحی منی بەدەستە ئەگەر مرۆڤ ببێتە هۆی موسڵمانبوونی یەك کەس، بۆی لە باشترین سەروەت و سامانی دونیا باشترە). نەك نێچیرەکەی تاوانبارکردنی موسڵمانێك بێت بە کوفر:« أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِأَخِيهِ يَا كَافِرُ فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا»[٣] . واتە:(هەرکەسێك براکەی بە کوفر تومەتبار بکات، ئەوا یەکێکیان هەڵگری تاوانی کوفرەکە دەبێت).

---

(١) رواه الطحاوي في مشكل الآثار (٣٢٤\٢) و ابن حبان في صحيحيه(٢٨٢\١) و حسنه الشيخ ناصر في الصحيحة(١٨\٤)(٣٢٠١).لە بنەمای (١١) دەقی فەرمودەکەمان باسکرد بە وەرگێڕانەوە.

(٢) رواه البخاري (٢٩٤٢).

(٣) رواه البخاري (١٦٠٤).

ئەمە تەنها وەكو نمونەیەك لەسەر ئەوەی كە ئێمە ئەمڕۆ دەبینین و لەناویدا دەژین لە دیاردەی توندڕەوی بەناوی ئیسلام و قورئان كە لە ئەنجامی نزمی ئاستی بیركردنەوە لە قورئان و ئیسلام دروست بووە و هۆكارەكەی كورت بینی كەسە توندڕەوەكەیە، نەك ئیسلام و قورئان، با زیاتر ڕوونی بكەینەوە لە نمونەیەكی دیكەدا لە ژێر ناونیشانی:

سوودەكانی بەرزفڕین لە بیركردنەوە و دیتنی گشت قوناغەكانی كار

بونمونە منداڵ لە تەمەنی هەشت مانگی لەسەر چوار دەست و پێیەكەی دەڕوات، و لە تەمەنی یەك ساڵی بە پێیان دەوەستێت و چەند هەنگاوێك دەنێت، لە تەمەنی دووساڵی بە ئاسایی غاردەدات ...

نەبوونی بەرزفڕی لە بیركردنەوە بریتییە لە تەماشاكردنی منداڵ لە تەمەنی هەشت مانگی و داوالێكردنی كە غار بدات!

بۆ جێبەجێكردنی ئەم نمونەیە با بگەڕێینەوە ژیاننامەی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم)، دەبینین كە ئایەتەكانی بیروباوەڕ لەباسی ناو و سیفەتەكانی خودا و بەهەشت و دۆزەخ ئایەتی مەككەیین لە قوناغە یەكەمەكانی بانگەوازدا پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) خەڵكی لە سەر پەروەردەكردووە، ئینسانی دروستكردووە، هەروەها دەبینین ئایەتەكانی ئەحكام لە حەلال و حەرام و كڕین و فرۆشتن و ئەحكامی دادگا و جیهاد و تەنانەت ڕێكخستنی زەكات و چۆنیەتی ڕۆژوو و وحەج...هتد ئایەتی مەدەنین لە نیوەی دووەم و قوناغە كۆتایەكانی بانگەوازدا دابەزیون[1] **حیكمەتەكە چییە**؟

حیكمەتەكە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە دروستكردنی مرۆڤ لەسەر بیروباوەڕ و فێركردنی بە ماناكانی ژیان قوناغەكەی لە پێش كاری بە كۆمەڵی مرۆڤەكانە، ئەم ڕاستییە تەنها لە كاتی بەرزفڕین لە بیركردنەوە بۆمان دەردەكەوێت كە هەموو ژیانی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێكەوە دەبینین.

(١) ينظر : صحيح البخاري (٤٩٩٣) و حيث عائشة أم المؤمنين ( رضي الله عنها) في ترتيب النزول.

لەو بەرزاییانەش نەزانین و ساویلکاتی ئەو چەکبەدەستانە[١] دەبینین کە داوای جێبەجێکردنی ئەحکامەکانی شەریعەت دەکەن پێش دروستکردنی ئەو مرۆڤەی کە شیاوی کاری بەکۆمەلە بەهۆی ئەو بیروباوەڕانەی کە هەڵی دەگرێت.

***

لێرەوەش پێویستە بزانین کە ئەم جۆرە نمونانەی باسکران نەك تەنها لە ڕوانگەی ئاینەوە هەیە، بەڵکو هەموو جۆرە خراپ بیرکردنەوەیەکی نادادپەر بۆ ئەم ئاستە نزمەی بیرکردنەوە دەگەڕێتەوە لە کاتی خوێندنەوەی دەوروبەرەکەی. کەواتە ئەگەر بمانەوێت سەرکەوتووبین و خاوەن ژیانێکی ئاسوودەبین پێویستە کاتی بیرکردنەوە بەرزفڕبین وەکو باز، تاوەکو بینینێکی بە هێزو فراوانمان هەبێت.

قورئانی پیرۆزیش کە هانی مرۆڤ دەدات بۆ بیرکردنەوە لە زۆر ئایەتدا باسی دیمەنەکانی گەردوون دەکات لەپاشان فەرمان بە بیرکردنەوە دەکات، تاوەکو بەرزفڕبین لە بیرکردنەوە: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٠﴾ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴿١٩١﴾﴾[٢]، ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ ۖ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ۖ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُم بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ

---

(١) لێرەوە بیر لە وەسفکردنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) بکە بۆ خەوارجی دوێنێ و داعشەکانی ئەمڕۆ کە دەفەرمێت (سفهاء الأحلام) واتە : عەقل سووکن! . متفقٌ عليه ( البخاري ٣٦١١ و مسلم ١٠٦٦).

(٢) آل عمران: ١٨٩ ـ ١٩١ .



وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا ۖ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ ۖ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ [١]

ئەم ئایەتە پیرۆزانە و دەیان ئایەتی دیکە باسی هاندان بۆ بیرکردنەوە دەکەن لە سیاقی باسی گەورەیی بۆنەوەر، کاتێك مرۆڤی موسڵمان بیرکردنەوەکەی لەم ئاستە بەرزەبێت، بێگومان دەبێتە هەڵگری خۆڕەوشتێك لە ئاستی بەرزی بیرکردنەوەکەی.

***

دووەم: گۆشەگیری بەناوی ئاین وەکو نمونەی ناکارایی هەڵسان بە ئەرکەکانی ڕۆژانە.

سەردانی نەخۆش ئەگەر نەخۆشەکە موسڵمان بێت یان موسڵمان نەبێت[٢] و سڵاوکردن لە هەموو کەس ئەگەر بیناسی یان نەی ناسی[٣] و سەرەخۆشی لە خاوەن ڕووداوێکی نەخوازراو ئەگەر منداڵیش بێت بووکە شووشەکەی شکابێ[٤]....هتد ڕەوشتی موسڵمانی ڕاستەقینەیە کە تێکەڵە بە خەڵك و هەموو چرکەیەکی ژیانی بریتییە لە کۆکردنەوەی چاکە و ناردنی بۆ دوارۆژ، وەکو مێروولە ماندوونەناسە دەگەڕێ و

---

(١) رعد: ٢ ـ ٣ .

(٢) عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ غُلاَمٌ يَهُودِيٌّ يَخْدُمُ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم فَمَرِضَ ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَعُودُهُ ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ لَهُ « أَسْلِمْ » . فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ وَهْوَ عِنْدَهُ فَقَالَ لَهُ أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ صلى الله عليه وسلم . فَأَسْلَمَ ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم وَهْوَ يَقُولُ « الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِى أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ » . رواه البخاري .

(٣) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم: أَيُّ الإِسْلاَمِ خَيْرٌ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ ، وَتَقْرَأُ السَّلاَمَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ » رواه البخاري.

(٤) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَدْخُلُ عَلَيْنَا وَلِى أَخٌ صَغِيرٌ يُكْنَى أَبَا عُمَيْرٍ وَكَانَ لَهُ نُغَرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ فَدَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم ذَاتَ يَوْمٍ فَرَآهُ حَزِينًا فَقَالَ « مَا شَأْنُهُ » . قَالُوا مَاتَ نُغَرُهُ فَقَالَ « يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ » . رواه ابوداود و أصله في الصحيحين.

دەسۆڕێت و ئەوەی بکەوێتە بەردەمی هەڵیدەگرێت لە کونەکەی حەشاردەدات بۆ زستانێکی سارد و سڕ!

پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەم موسڵمانە کە تێکەڵە بە خەڵك دەفەرمێت: « الْمُؤْمِنُ الَّذِى يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ أَعْظَمُ أَجْرًا ـ وفي رواية: خيرٌ ـ مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِى لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ »[(١)] واتە: (ئەو ئیماندارەی لەگەڵ خەڵك تێکەڵە و ئارامگرە بەرامبەر خراپەی خەڵك، باشترە و زیاتریش پاداشتی هەیە لەو ئیماندارەی کە تێکەڵ بە خەڵك نابێت و ئارامی لەسەر خراپەیان ناگرێت) .

هەروەها لەباسی لێپرسینەوەی خودای پەروەردگار بۆ کەسێك کە هیچ چاکەیەکی نەبووە تەنها ئەوە نەبێت کە **تێکەڵ بووە بە خەڵك** و کەسێکی دەوڵەمەند بووە و قەرزی بە خەڵك بەخشیوە، لەگەڵ ئەوەی کە توانای دانەوەی نەبێت لێبوردە بووە، پەروەردگار لە دەرحەقیدا فەرمویەتی: ئێمە لە ئەو لێبوردەترین با هیچ چاکەیەکی دیکەی نەبێت لێی خۆش دەبین:«حُوسِبَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مِنَ الْخَيْرِ شَىْءٌ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَكَانَ مُوسِرًا فَكَانَ يَأْمُرُ غِلْمَانَهُ أَنْ يَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُعْسِرِ قَالَ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ تَجَاوَزُوا عَنْهُ»[(٢)].

لە ڕوانگەی ئەم دوو فەرمودەیەوە و ئەوەی باسکرا لە ڕەوشت بەرزی موسڵمانی ڕاستەقینە، هەڵەی گۆشەگیران بەناوی ئاینەوە بۆمان دەردەکەوێت، چونکە گۆشەگیری و تێکەڵ نەبوونی موسڵمان بە خەڵك **جۆرێکە لە جۆرەکانی بەهەدەردانی کاتی ئیصلاح و چاکسازی.**

---

(١) أخرجه أحمد (٥٠٢٢)(٢٣٠٩٨) الترمذي(٢٥٠٧) و ابن ماجه(٤٠٣٢).

(٢) متفقٌ عليه (بخاري : ٢٣٩١ ، ٣٤٥٠)(مسلم ١٥٦٠).

باشترین خۆڕەوشتیش خۆڕەوشتی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بووە، کە تێکەڵ بووە لەگەڵ هەموو چینەکانی خەڵك، ئارامگربووە لەسەر ئازاریان، گەورەترین خوداپەرستیش لە ئیسلامدا نوێژە باشترین نوێژیش نوێژی جەماعەتە لە مزگەوت کە دەرگایەکی تێکەڵبوونە لەگەڵ خەڵك و پەیامێکی کۆمەڵایەتی ئیسلامە کە موسڵمان کەسێکی گۆشەگیر نییە، بەڵکو گۆشەگیری لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دیاردەیەکی نەخوازراوە، ئەم دیاردەیەش ترسناکتر دەبێت کاتێك خاوەنەکەی چەند فەرمودەیەکی نیشانەکانی قیامەت بکاتە بەڵگە بۆ خۆی و گۆشەگیریەکەی، سەبارەت بەم جۆرە کەسانە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمێت: (کەسی لە هەمووان تیاچووتر ئەو کەسەیە کە دەڵێت خەڵك تیاچوو) «إِذَا قَالَ الرَّجُلُ هَلَكَ النَّاسُ ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ»[١] پوختەی ئەمەش ئەوەیە کە بەشی زۆری گۆشەگیری لەسەر بیرۆکەی خەڵك تیاچوو(هلك الناس) بنیاتدەنرێت کە ناکارابیە لە هەڵسان بە ئەرکەکان و ڕاکردنە لە خۆ پەروەردەکردن بە خزمەتکردنی دەوروبەر و وەستاندنی کاروانی ئیصلاح و چاکسازییە.

لە پێناو ئەوەی ئەم کاروانە نەوەستێت با لەسەر مانا قوولەکانی سورەتی (العصر) بوەستین لە بنەمای شازدەمدا کە بە (شافعی نامە) بەناومانکردووە:

---

(١) رواه مسلم(٢٦٢٣).

## بنەمای شازدەم:

## شافعی نامە

زانای پایەبەر شافعی (رحمه الله) ناسراوە لای موسڵمانان پێویست ناکرێت بناسێنرێت (غنيٌ عن التعريف)، ئەوەندە بەسە دامەزرێنەری زانستی (أصول الفقه)ە لە ئیسلامدا و سەرداری یەکێك لە چوارگەورەترین قوتابخانەکانی فیقهی ئیسلامییە. لەم بنەمایەدا لەسەر سێ گوتنی ئەم زانایە پایەدارە دەوەستین سەبارەت بە **کات** کە مانای هەموو بنەماکانی دیکەش کۆدەکاتەوە:

**گوتنی یەکەم[1]:**

قال الشَّافِعِيُ رحمه الله: « لو ما أنزل اللهُ حُجةً على خَلْقِهِ إلا هذه السورة ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾ لَكَفَّتْهُم ».

قال الشَّافِعِيُ رحمه اللَّه: الناس في غفلة عن هذه السورة: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ ... ﴾.

واتە: (ئەگەر خودای پەروەردگار تەنها ئەم سورەتەی دابەزاندبا ـ سورة العصرـ کیفایەت بوو کە ببێتە حوججە لەسەر هەمووان) و فەرمووی: (خەڵك بێئاگان لە مانابەرزەکانی ئەم سورەتە).

بە هزراندنێك لەم سورەتە پیرۆزە مانا گشتگرەکانی ژیانی سەرکەوتوومان بۆ ڕووندەبێتەوە:

(١) مقدمة المجموع لنووي ص١٢ و تفسير الشافعي (١٤٦١\٣).

١ ــ ﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾ پەروەردگار بە کات سوێند دەخوات، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ پیرۆزی کات (شەو و ڕۆژ)، کە زەرفی کردەوەکانی مرۆڤە.

٢ ــ ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ﴾مرۆڤ لە خەسارەتمەندی دایە لە هەموو وەستانێکی یان لە هەموو کارێکی کە بۆ چاکە نەبێت.

٣ ــ ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ تەنها یەك مرۆڤ خەسارەتمەند نییە کە کارەکانی بۆ ڕازیبوونی خودایە:

* **دڵ:** بە ئیمان بەرزبوونەوەی بەردەوام.

* **جەستە:** بەکردەوەی چاکە.

* **زۆبان:** بە وەسیەتکردنی ئەو کۆمەڵەی لەناویدا دەژیت بە پایە بەرزەکانی ڕاستی و ئارامگرتن لە سەر ڕاستی.

ئەم مرۆڤە چاکسازە(مصلح) ـ کە هەڵگری مانابەرزەکانی ئەم سورەتەیە ـ تاکە ڕزگابووی ئەم ژیانەیە لە خەسارەتمەندی و خالّی پاراستنی کۆمەڵگایەکەیەتی لە سزای پەروەردگار: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا مُصۡلِحُونَ﴾[1] واتە: (ئەگەر خەڵکی شاران چاکەکار و چاکساز بن (مصلحون)، ئەوا خودای پەروەردگار بە ستەم لە ناویان نابات).

پێویستە بشزانین کە (مصلح) جیاوازە لە (صالح) تەنها کەسی (مصلح) کە فەرمان بە چاکە دەکات و نەهی لە خراپە دەکات بەوپەڕی دانایی و زاناییەوە وەسیەتی کۆمەڵگاکەی دەکات بە بەها پایەبەرزەکان ـ ﴿وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ ـ،

(١) هود: ١١٧.

دەبێتە ئەمان بۆ کۆمەڵگاکەی نەك کەسی (صالح) کە تەنها بۆ خۆی تەقوادارە، بەڵگەی ئەمەش فەرمودەی (زینب بنت جحش)ی دایکی موسڵمانانە(رضي الله عنها) کە لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەپرسێت: (يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ قَالَ واتە خودا وەکو سزایەك لەناوماندەبا لە کاتێکدا کە کەسی (صالح)یشمان لە ناومان بێت؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: « نَعَمْ ، إِذَا كَثُرَ الْخُبْثُ » بەڵێ: کاتێك خراپە زۆر دەبێت [١] .

واتە کاتێك خراپە زۆر دەبێت(صالح)ەکە نابێتە ڕێگر لە هاتنی سزا، چونکە کەسێکە وەسیەتی کۆمەڵگاکەی نەکردووە بەچاکە هەرچەندە بەخۆی چاکە، بە پێچەوانەی (مصلح) کە وەسیەتی کۆمەڵگاکەی دەکات بە چاکە و دەبێتە ئەمان بۆ کۆمەڵگاکەی لە سزای خودای پەروەردگار.

ماناکانی ئەم سورەتەش زیاتر لەبەرچاومان ڕوون دەبنەوە لە دوو گوتنی زێڕینی دیکەی ئیمامی شافعی کە گوتنی دووەم و سێیەمی بابەتەکەمانن:

(١) عَنْ زَيْنَبَ ابْنَةِ جَحْشٍ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم دَخَلَ عَلَيْهَا فَزِعًا يَقُولُ « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ » . وَحَلَّقَ بِإِصْبَعِهِ الإِبْهَامِ وَالَّتِى تَلِيهَا . قَالَتْ زَيْنَبُ ابْنَةُ جَحْشٍ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ قَالَ « نَعَمْ ، إِذَا كَثُرَ الْخُبْثُ ». متفقٌ عليه.



**گوتنی دووەم و سێیەم [١] :**

قال الشَّافِعِي رحمه الله: صَحِبْتُ الصُّوفِيَّةَ، فَمَا انْتَفَعْتُ مِنْهُمْ إِلَّا بِكَلِمَتَيْنِ، سَمِعْتُهُمْ يَقُولُونَ: الْوَقْتُ سَيْفٌ، فَإِنْ قَطَعْتَهُ وَإِلَّا قَطَعَكَ. وَنَفْسُكَ إِنْ لَمْ تَشْغَلْهَا بِالْحَقِّ، وَإِلَّا شَغَلَتْكَ بِالْبَاطِلِ. واتە: (هەڤاڵەتی سوفیگەرانم کرد، سوودم لێیان وەرنەگرت تەنها دوو وشە نەبێت: **یەکەمیان:** گوێم لێبوو دەیان گوت: کات شمشێرە نەی بڕی دەتبڕێت. **دووەمیان:** ئەگەر نەفسی خۆت بەحەقەوە مەشغول نەکەی، ئەوا نەفسەکەت بە باطــلەوە مەشغولت دەکات).

(ابن قيم) لە مەدح و سەنای ئەم گوتنەی کە شافعی لە سوفیگەران دەگێڕێتەوە دەفەرمێت: (يَا لَهُمَا مِنْ كَلِمَتَيْنِ، مَا أَنْفَعَهُمَا وَأَجْمَعَهُمَا، وَأَدَلَّهُمَا عَلَى عُلُوِّ هِمَّةِ قَائِلِهِمَا، وَيَقَظَتِهِ، وَيَكْفِي فِي هَذَا ثَنَاءُ الشَّافِعِيِّ عَلَى طَائِفَةٍ هَذَا قَدْرَ كَلِمَاتِهِمْ.) واتە: (ئەمانە دەبێ چ دوو گوتنێکی نازداربن، چەند لە مانادا گشتگیرن، لە کارپێکردندا بەسوودن، لەسەر ژیری و هیمەت بەرزی خاوەنەکەیان بەڵگەن، بەڵکو بۆ سوفیگەران ئەمە کیفایەتە کە شافعی بەم دوو گوتنە ڕێزدارە مەدحیان بکات).

ئەم دوو گوتنەی شافعی (رحمه الله) لەگەڵ گوتنەکەی سەبارەت بە سورەتی (العصر) پێویستیان بە ڕاڤەی زیاتر نییە، بەڵکو تەنها پێویستیان بەوە هەیە کە بکرێنە چاوێلکەیەکی سپی و بە شەو و ڕۆژ لە چاو بکرێن و بەناویاندا تەماشای ورد و درشتی ژیانمان بکەینەوە و ماناکانیان بکەینە هۆنراوەیەك بەناوی **شافعی نامە** شەو و ڕۆژ دووبارەی بکەینەوە:

---

(١) مدارج السالكين لإبن القيم (٣\١٥٥ ط. الرشد) و الجواب الكافي ـ الداء و الدواء ـ (٣٥٨ ط. المجمع).

خەڵکینە شافعی سێ قسەی هەیە، وەریگرن

وەك ئەم سێ قسەیە نابیننەوە، گەر بفڕن

یەك: ﴿العصر﴾ هزراندنی کیفایەتە

سورەتێکە خەڵك لێی لە غەفلەتە

دوو: کات شمشێرە نەی بڕی دەدکاتە لەت

سێ: نەفسی خۆت بۆ چاکە نەبەی دەتبا بۆ زیللەت

ئەم دووەی  وەریگرتووە لە سوفیگەران

پاش هەڤاڵەتیان بە سوڕان و گەڕان

(ابن قَیِّم) فەرمووی ئەم مەدحە بۆیان بەسە

کەس تەنها ئەو کەسەیە هەڵگری ئەم سێ قسە

❊❊❊

بەڵێ بەڕاستی (کەس تەنها ئەو کەسەیە هەڵگری ئەم سێ قەسە) چونکە هەڵگری ئەم سێ قسە زێڕینە کەسێکی هوشمەند و ژیرە، با لە بنەمای حەڤدەمدا ـ بە پشت بەستن بە خودا ـ لە سەر ڕێسایەکی هوشمەندی بوەستین، کە بریتییە لە (ساردکردنەوەی کاتە گەرم و هەستیارەکان پێش بڕیاردان)، بنەماکەش بە (یعقوبیە) ناومانناوە وەکو نسبەتێك بۆ پێغەمبەر یعقوب (علیه السلام).

## بنەمای حەڤدەم:

## ساردکردنەوەی کاتە گەرم و هەستیارەکان پێش بڕیاردان

## ( یەعقوبییە )

بۆچی ناوی ئەم بنەمایەمان کردە (یەعقوبیە)؟ ئەمە لە کۆتایی بنەماکە دێتە بەرچاومان ـ إن شاء الله ـ.

ئێستا باسی ئەم بنەمایە بە بەسەرهاتی زانایەك دەست پێدەکەین کە زیاتر لە (١٢٠٠) هەزار و دووسەد ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕیوە، ئەویش (عليٌّ بن عُبَيدةَ الريحاني) کە لە باسی یەکێك لە تاقیکردنەوەکانی ژیانیدا دەفەرمێت:

(لە بەرایی گەنجییەتیم و دەستپێکی خۆ فێرکردنمدا لەگەڵ هاوتەمەنەکانم لە خوێن گەرم و شمشێر بەدەستان، کێشەیەکم هەبوو ئەویش گەرماتی تولّەسەندنەوەی کاتی تۆڕەبوون و خۆ بە زل زانین بەرامبەر کەسی ڕەخنەگر و تانهاوێژ، ئەم خەسڵەتە لەگەڵم بەردەوام بوو تاوەکو لە خوێندنەوەی کتێبێکدا چەند بەیتە شیعرێکم کەوتنە بەرچاو کە ئەمانە بوون:

ئەگەر لە تۆڕەبوون ئەوەی ناو دڵتە دەرهات
ئەوا دەنگی تۆڕەکارانت کردە هەزار دەنگ
ئەگەر ڕەوشتت فراوان نەبێت بە قەد وڵات
ئەوا فراوانی وڵات دەبێتە دووبەرەکی و تەنگ
ئەگەر ئەم ڕاستییەت لەگەڵ نەبێ هەموو کات
ئەوا بۆ جوانی ڕاستییەکان نابینی ڕەنگ

ئەم چەند بەیتە دەستیانی گرتم و دڵیانی خۆشکردم، هەر ئەوکات لەبەرمکردن و بەردەوام بەشە و ڕۆژ لەکاتی کار و بەتاڵی دووبارەم دەکردنەوە وکاتی تۆڕەیی و

تولّەسەندنەوە دەهاتنەوە بیرم و ئاوێکی ساردیان بە ئاگری تۆڕەییمدا دەکردن، فێری لێبوردەییان کردم، سوودی زۆریانم لیّ وەرگرتن)[١] .

بەسەرهاتی ئەم زانایە بنەمایەکی گرنگە لە بنەماکانی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کات، کە بریتییە لە دروستکردنی بۆشاییەکی فراوان لە نێوان ئەو هۆکارانەی هەستەکانت دەبزوێنن و کاردانەوەکەت بەرامبەریان. کە ئەم بۆشاییە چەند فراوانبێت ـ کاتێکی زۆر بخایەنێت ـ ئەوا زیاتر لە ڕاست و دروستی بڕیارەکانت نزیك دەکاتەوە و نایەڵێت بڕیارێکی هەڵە بدەیت لە ئەنجامی کاردانەوەیەکی گەرم و خێرا.

بۆ ئەوەی ئیسلامەتی ئەم مانا قووڵانەی سێ بەیتە شیعرەکە بێتە بەرچاومان لە سەر چەند ئایەت و فەرموودەیەك دەوەستین لەوانە:

* پەروەردگار لەمەدحی ڕەوشتی ئیمانداراندا دەفەرمێت: ﴿وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ﴾[٢] واتە: ئەوانەی تۆڕەیی ڕق و کینەی خۆیان قوت دەدەن لە پاشان لێبوردەیی دەنوێنن بەرامبەر خەڵك.

* پەروەردگار بەرامبەر ئەو کەسەی دژایەتیت دەکات یان کاری نابەجێ بەرامبەرت ئەنجامدەدات دەفەرمێت: ﴿وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٦﴾﴾[٣]

---

(١) ينظر: جواهر الكلم و فرائد الحِكم المنسوب لعلي بن عبيدة الريحاني (ت نحو ٢١٩ هـ) ص٣٨ ط. جامعة الملك سعود تحقيق : أ.د عبدالله الرُّشَيْد.

(٢) آل عمران : ١٣٤.

(٣) فصلت: ٣٤ ـ ٣٦ .

واتە: (چاکە و خراپە وەکو یەك نین، ئەی ئیماندار بە چاکە وەڵامی خراپە بدەرەوە، ئەو کات دەبینیت کە وەڵامە چاکەکەت دوژمنایەتی نێوان تۆ و خراپەکاری گۆڕیووە و خراپەکارەکەی کردووە بە دۆستێکی دڵسوز، ئەم ڕەوشت بەرزییەی وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە پلەیەکە تەنها ئەوانە پێدەگەن کە ئارامگر و خاوەن بەهرەیەکی گەورەن و لە تەنگانەدا زەفەر بە شەیتان دەبەن بە پشت بەستن و خۆ پاراستن بە خودا).

جێی شاهێد لە ئایەتەکەدا هەبوونی ئارامگری و پشتبەستنە بەخودا، کە بەهرەیەکی گەورەیە و مەرجی توانای مرۆڤە بۆ وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە، چونکە ئەم ئارامگرتنە (= درێژکردنی کاتی نێوان کاری خراپی دەوروبەر و کاردانەوەی مرۆڤ) گەرماتی تۆڕەیی و تۆڵە سەندنەوە سارددەکاتەوە وادەکات بڕیاری وەڵامدانەوە زۆر ژیرانە بێت.

هەروەها پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) بە گوفتار و ڕەفتار هەڤاڵانی (رضي الله عنهم) فێرە ئەم ڕەوشت بەرزییەی کردوون لە فەرمودەکانی سەبارەت بەم بابەتەوە:

* قَالَ عُقْبَةُ بن عامر(رضي الله عنه): لَقِيتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَابْتَدَأْتُهُ فَأَخَذْتُ بِيَدِهِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي بِفَوَاضِلِ الْأَعْمَالِ. فَقَالَ: ((يَا عُقْبَةُ، صِلْ مَنْ قَطَعَكَ، وَأَعْطِ مَنْ حَرَمَكَ، وَأَعْرِضْ عَمَّنْ ظَلَمَكَ))[1] واتە: عوقبەی کوڕی عامر کە یەکێکە لە هەڤاڵان(رضي الله عنهم) دەستی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەگرێت و داوای زانینی باشترینی خۆڕەوشت لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەکات، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا دەفەرمێت:

(١) أخرجه أحمد في المسند (١٧٣٣٤).

(عوقبە گیان: سەردانی ئەو کەسە بکە کە پشتی لە سەردانی تۆی کردووە، یارمەتی بەو کەسە ببەخشە کە یارمەتیت نادات و نەکەی وەلامی ستەمی کەسێك بدەیەوە کە ستەمی لە تۆ کردووە).

* عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ(رضى الله عنه) أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِلنَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم أَوْصِنِى . قَالَ « لاَ تَغْضَبْ » . فَرَدَّدَ مِرَارًا ، قَالَ « لاَ تَغْضَبْ »[١] .

پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) کاتێك هەڤاڵێکی داوای ئامۆژگاری لێدەکات پێی دەفەرمێت: (تۆڕە مەبە) چەند جار ئەم داواکارییە لێی دووبارەدەکاتەوە هەمان وەلام دەبیستێت (تۆڕە مەبە).

* عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ( رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ( بَالَ أَعْرَابِيٌّ فِي الْمَسْجِدِ , فَقَالَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَهْ مَهْ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَا تُزْرِمُوهُ قَالَ: فَلَمَّا فَرَغَ , دَعَاهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ , فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُتَّخَذْ لِهَذَا الْقَذَرِ وَالْبَوْلِ وَالْخَلَاءِ إِنَّمَا تُتَّخَذُ لِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ , وَلِذِكْرِ اللهِ ، ثُمَّ أَمَرَ بَعْضَ أَصْحَابِهِ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ , فَصَبَّهُ عَلَيْهِ )[٢] وفي روايةٍ[٣] أن الأعرابي قال: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا، وَلا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: لَقَدْ تَحجَّرْتَ وَاسِعًا ).

پوختەی ماناکەی: دەشتەکییەك لەناو مزگەوت میز دەکات و هەڤاڵان (رضي الله عنهم) زوو ئینکاری دەکەن و لێی تۆڕەدەبن و پێی دەڵێن: نەکەی نەکەی... بەلام پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) پێیان دەفەرمێت : لێی گەڕێن با میزەکەی بکات لە پاشان ئامۆژگاری دەکات کە مزگەوت جێی زیکر و نوێژە و جێی میزکردن نییە،

---

(١) رواه البخاري.

(٢) أخرجه البيهقي في السنن الكبرى (٢٠٢٩٠)(٢٠\٢٩٦) أصله في الصحيحين.

(٣) ينظر: مسند الشافعي(ص١٥٧).

فەرمان بە هەڤاڵانی دەکات (رضي الله عنهم) کە شوێنی میزەکەی خاوێن بکەنەوە. لە ڕیوایەتێکدا هاتووە کە دەشتەکییەکە گوتویەتی: خودایە تەنها ڕەحم بە من و محمد بکەی بێجگە لە من و محمد ڕەحم بەکەس نەکەی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە وەڵامیدا فەرمویەتی: (شتێکی فراوانت تەنگ کرد!).

❊❊❊

ئایەت و فەرموودە بەم مانایانە زۆرن بەم خشتەیە بنەماکە زیاتر دێتە بەر چاومان:

| کاری خراپی دەوروبەر | بۆشایی نێوان کار وکاردانەوە | کاردانەوەی دژی کارە خراپەکە بە بڕیارێکی دروست |
| --- | --- | --- |
| کەسێك وادەکات تووشی ڕق و کینە بێت. | ﴿وَٱلۡكَـٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾ | ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ |
| کەسێك خراپەی بۆ تۆ هەیە. | ﴿وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ﴾ | ﴿وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ﴾ |
| کەسێك وادەکات تووشی تۆڕەیی ببێت یان خراپەی بۆ تۆ هەیە. | «لاَ تَغْضَبْ»«لاَ تَغْضَبْ» «لاَ تَغْضَبْ»... | «صِلْ مَنْ قَطَعَكَ، وَأَعْطِ مَنْ حَرَمَكَ، وَأَعْرِضْ عَمَّنْ ظَلَمَكَ» |
| کەسێك لە مزگەوتدا میز دەکات. | « لَا تُزْرِمُوهُ» | «إِنَّ هَذِهِ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُتَّخَذْ لِهَذَا الْقَذَرِ وَالْبَوْلِ وَالْخَلَاءِ إِنَّمَا تُتَّخَذُ لِقِرَاءَةِ الْقُرْآنِ، وَلِذِكْرِ اللهِ ، ثُمَّ أَمَرَ بَعْضَ أَصْحَابِهِ بِدَلْوٍ مِنْ مَاءٍ، فَصَبَّهُ عَلَيْهِ» |

پاش ئەوەی بەم خشتەیەی سەرەوە بنەماکەمان بۆ ڕوون بوویەوە، ئەوا پێویستە بزانین کە بنەمایەکی زۆر فراوانە تەنانەت حیکمەتی زۆرێك لە ئەحکامەکانی شەرعی بۆمان دیار دەخات لەوانە:

* حوکمی عیددەی تەڵاقدان[١] : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا۟ ٱلْعِدَّةَ ۖ﴾[٢] کە بۆ ئافرەتی خاوەن سوڕی مانگانە دەوروبەری سێ مانگ دەبێت (٣پاکژی یان ٣حەیز): ﴿وَٱلْمُطَلَّقَـٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَـٰثَةَ قُرُوٓءٍ ۚ﴾[٣] بۆ هەر تەڵاقێك: ﴿ٱلطَّلَـٰقُ مَرَّتَانِ ۖ فَإِمْسَاكٌۢ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌۢ بِإِحْسَـٰنٍ ۗ﴾[٤]. بۆ ئەوانی دیکەش دانانی حەمل یان سێ مانگ ﴿وَٱلَّـٰٓـِٔى يَئِسْنَ مِنَ ٱلْمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمْ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَـٰثَةُ أَشْهُرٍ وَٱلَّـٰٓـِٔى لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُو۟لَـٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مِنْ أَمْرِهِۦ يُسْرًا ﴿٤﴾﴾[٥].

لە حیکمەتەکانی ئەم عیددەیە دروستکردنی بۆشایی ـ کاتێکی زۆر ـ لە نێوان هۆکارەکانی تەڵاقدان و بڕیاری تەڵاقدانە.

* حوکمی بەجێهێشتنی ماڵەوە لەجیاتی وەڵامدانەوەی کارە نەخوازراوەکانی خێزانەکان (الإيلاء)[٦] {عَنْ أَنَسٍ(رضی الله عنه) قَالَ: آلَى رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم مِنْ

---

(١) ينظر: منحة العلام شرح بلوغ المرام (٨\ ٥٤ ـ ١٠٤ ).

(٢) الطلاق : ١.

(٣) البقرة: ٢٢٨ .

(٤) البقرة : ٢٢٩ .

(٥) الطلاق: ٤ .

(٦) ئيلاء دوو جۆری هەیە یەکەمیان ئەوەی لە ئایەتی (٢٢٦)ی سورەتی (البقرة) دا هاتووە ﴿لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ۖ فَإِن فَآءُو فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾﴾، دووەمیان ئەوەی لەفەرموودەکەدا هاتووە کە جۆرێکە

نِسَائِهِ شَهْرًا وَقَعَدَ فِى مَشْرُبَةٍ لَهُ فَنَزَلَ لِتِسْعٍ وَعِشْرِينَ فَقِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ آلَيْتَ عَلَى شَهْرٍ، قَالَ «إِنَّ الشَّهْرَ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ» }[١]. واتە: (پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) سوێندی خوارد کە مانگێك لە ماڵەکەی دەربچێت و نزیك هاوسەرەکانی نەکەویتەوە، پاش بیست و نۆ ڕۆژ گەڕاوە ماڵەکەی، چونکە مانگ بیست و نۆ ڕۆژ بوو).

ئەمەش دروستکردنی بۆشاییەکە لە کاتێکی زۆر لە نێوان کاری نەخوازراوی خێزانەکان و کاردانەوەی خاوەن ماڵ (پیاوەکەیان).

کاتێك لەم بنەمایە تێگەیشتین و زانیمان چەند فراوانە، ئەوا پێویستە بزانین کە جێبەجێکردنی ئەم بنەمایە پەیوەندی بە کەسایەتی مرۆڤەوە هەیە، کە چۆن دەتوانێت ئەم بۆشاییەی کات لە نێوان کار و کاردانەوە فراوان بکات (سەعاتێك، ڕۆژێك، مانگێك، ساڵێك ....هتد) تا دەگاتە ڕادەی ساردبوونەوە پاشان بڕیاردان، ـ جاری واش هەیە وەڵامنەدانەوەی کاری نەخوازراو خۆی لە خۆیدا وەڵامێکی پەروەردەییە بۆ دەوروبەرەکەی ـ .

بۆ وردەکاری ئەم مانایەش تێبینی بکە لە نێوان کەسایەتی یعقوب(عليه السلام) ـ باوکێکی پیرەمێرد ـ بەرامبەر خراپەی کوڕەکانی و کەسایەتی یوسف (عليه السلام) ـ کوڕێکی گەنج ـ بەرامبەر خراپەی براکانی لەم خشتەیەدا:

---

لە شێوازەکانی پەروەردەکردنی خێزانی نێوان پیاو و هاوسەرەکانی. ينظر: منحة العلام شرح بلوغ المرام (٦\٨ ـ ١٣).

(١) رواه البخاري.

| یعقوب(علیه السلام) | یوسف (علیه السلام) |
| --- | --- |
| مەوقفی یعقوب(علیه السلام) پاش دان پێدانانی کوڕەکانی بە هەڵەکانیان و داواکاری ئیستیغفار بۆ کردن. (کەسایەتی پیرەمێرد) | مەوقفی یوسف (علیه السلام) پاش دان پێدانانی براکانی بە هەڵەکانیان و داواکاری ئیستیغفار بۆ کردن (کەسایەتی گەنج) |
| ﴿قَالَ سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾﴾ | ﴿قَالَ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَۖ يَغْفِرُ ٱللَّهُ لَكُمْۖ وَهُوَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾﴾ |
| کەسایەتی یعقوب (علیه السلام) بەتواناتر بوو، چونکە توانی بۆشایی نێوان کار و کاردانەوە دروست بکات و ئیستیغفارکردنی بۆیان دواخست. | کەسایەتی یوسف(علیه السلام) نەی توانی بۆشایی نێوان کار و کاردانەوە دروست بکات و یەکسەر ئیستیغفاری بۆ کردن. |
| کەواتە کەسایەتی یعقوب (علیه السلام) زیاتر جێی سەرنجە لە بەسەرهاتەکەدا نەك کەسایەتی یوسف (علیه السلام) کە لە زۆربەی ڕووداوەکانی بەسەرهاتەکەدا دیارە. | |

بیر لەم خشتەیەی سەرەوە بکەرەوە هەتا بزانی بۆچی ناوی ئەم بنەمایەمان کردە (یەعقوبییە)؟ و بۆچی پێویستە مرۆڤ یەعقوبی بێت لە بڕیاردان؟ و بۆچی خەڵك زیاتر بە کەسایەتی یوسف سەرسامە نەك حیکمەتی یعقوب؟.



حیکمەتی یعقوبیش (علیه السلام) بریتییە لە بەخشینی کات بەخۆی پێش بڕیاردان، تاوەکو بڕیارەکە هاوسەنگ و بەجێ بێت، ئەمەش ئەدەبی پێغەمبەرانە(علیهم السلام)، هەروەها لە ئەدەبی پێغەمبەران کات بەخشینە بە بەرامبەر کە لوتکەی ئەدەبە وەك لە بنەمای هەژدەمدا دێتە بەرچاومان ـ إن شاء الله ـ:

## بنەمای هەژدەم:

## بەخشینی کات! ـ (( أفرغت یا أبا الولید؟ )) ـ

لە پێشینانەوە هاتووە کە ڕێژەی قسەکردن بۆ بیستن، دوو بۆ یەکە، چونکە مرۆڤ یەك دەم و دوو گوێی هەیە، هەروەها دەتوانین بڵێین کە قسەکردن و بیستن دوو میراتگری کاتن، بیستن وەکو کوڕ دوو بەش دەبات، چونکە پێویستە خزمەت بکات و قسەکردن وەکو کچ یەك بەش دەبات، چونکە پێویستە خزمەت بکرێت، خزمەتکردنی بیستنیش بۆ قسەکردن زۆر لایەنی هەیە گەورەترینیان هەڵسەنگاندنی ئەوەی دەبیسترێت بۆ ئامادەکردنی ئەوەی دەگوترێت، چۆن دەگوترێت؟ کەی دەگوترێت؟ بۆ کێ دەگوترێت؟ ئەم هەڵسەنگاندنەش پەیوەندی بە ژیری و هوشمەندی کەسەکەوەیە، کە ئەدەبێکی بەرزی لێدەکەوێتەوە ئەویش درێژکردنی کاتی بێدەنگی و بیستن و بەخشینی کات بۆ بەرامبەر تاوەکو قسەبکات ئەوەی ناو دڵەکەیەتی هەمووی بڵێت و کەسە هوشمەندەکەش زۆر بە سینگێکی فراوانەوە گوێبیستی بێت، هەرچەندە بیستراوەکە لای زانراو بێت لە لایەك و لە لایەکی دیکەوە ناڕەوا و ناڕەوانیش بێت. ئەم کات بەخشینەش بۆ بەرامبەر لەگەڵ گوێ بیستنی، خۆی لە خۆیدا ئامادەکردنی بەرامبەرە بۆ وەرگرتنی پەیامەکەت، ئەمەش ئەنجامێکە ناتوانی بە قسەکردن بە دەست بێنی، بەڵکو بە گوێبیستن بەدەست دێت و گەورەترین خزمەتی بیستنە بۆ قسەکردن. هەروەها ئەم کات بەخشینە بە بەرامبەر کە قسەبکات گەیشتنە بە پلەکانی ئەدەب و لوتکەکانی ئەدەب و ڕەوشت بەرزی[1] کە لەوێ کەسایەتی پێغەمبەرمان(صلی الله

---

[1] ابن خەلدون دەفەرمێت: (لوتکەی ئەدەب ئەوەیە گوێبیستی بەرامبەرت بی کە باسی مەسەلەیەکت بۆ دەکات تۆ لە ئەو باشتر لێی دەزانی).

علیه وسلم) دەبینرێت. با لەم بارەیەوە لە سەر ڕووداوێکی ژیانی ئەم پێغەمبەرەمان(صلی الله علیه وسلم) بوەستین، لە کات بەخشیندا بۆ بەرامبەرەکەی، کە ناونیشانی بنەمایەکەمان لێی وەرگرتووە ((**أفرغت يا أبا الوليد؟**)) دەقەکەشی لە پەراویزدا دەبینی[١] و ئەمەش پوختەی ماناکەیەتی:

---

(١) قال محمد بن إسحاق في كتابه السيرة (١\٣٠٥): حَدَّثَنِي يَزِيدُ بْنِ زِيَادٍ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِي قَالَ: حُدِّثْتُ أَنْ عُتْبَةَ بْنَ رَبِيعَةَ - وَكَانَ سَيِّدًا - قَالَ يَوْمًا وَهُوَ جَالِسٌ فِي نَادِي قُرَيْشٍ، وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَحْدَهُ: يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ أَلَا أَقُومُ إِلَى مُحَمَّدٍ فَأُكَلِّمَهُ وَأَعْرِضَ عَلَيْهِ أُمُورًا لَعَلَّهُ يَقْبَلُ بَعْضَهَا، فَنُعْطِيَهُ أَيَّها شَاءَ وَيَكُفَّ عَنَّا؟ وَذَلِكَ حِينَ أَسْلَمَ حَمْزَةُ، وَرَأَوْا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَزِيدُونَ وَيَكْثُرُونَ، فَقَالُوا: بَلَى يَا أَبَا الْوَلِيدِ، فَقُمْ إِلَيْهِ فَكَلِّمْهُ. فَقَامَ إِلَيْهِ عُتْبَةُ حَتَّى جَلَسَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، إِنَّكَ مِنَّا حَيْثُ قَدْ عَلِمْتَ مِنَ السِّطَةِ فِي الْعَشِيرَةِ، وَالْمَكَانِ فِي النَّسَبِ، وَإِنَّكَ قَدْ أَتَيْتَ قَوْمَكَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، فَرَّقْتَ بِهِ جَمَاعَتَهُمْ، وَسَفَّهْتَ بِهِ أَحْلَامَهُمْ، وَعِبْتَ بِهِ آلِهَتَهُمْ وَدِينَهُمْ، وَكَفَّرْتَ بِهِ مَنْ مَضَى مِنْ آبَائِهِمْ، فَاسْمَعْ مِنِّي أَعْرِضْ عَلَيْكَ أُمُورًا تَنْظُرُ فِيهَا لَعَلَّكَ تَقْبَلُ مِنَّا بَعْضَهَا. قَالَ: فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: ((قُلْ يَا أَبَا الْوَلِيدِ، أَسْمَعْ)). قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، إِنْ كُنْتَ إِنَّمَا تريدُ بِمَا جِئتَ بِهِ مِنْ هَذَا الْأَمْرِ مَالًا جَمَعْنَا لَكَ مِنْ أَمْوَالِنَا حَتَّى تَكُونَ مِنْ أَكْثَرِنَا أَمْوَالًا. وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ بِهِ شَرَفًا سَوَّدْنَاكَ عَلَيْنَا، حَتَّى لَا نَقْطَعَ أَمْرًا دُونَكَ. وَإِنْ كُنْتَ تُرِيدُ بِهِ مُلْكًا مَلَّكْنَاكَ عَلَيْنَا. وَإِنْ كَانَ هَذَا الَّذِي يَأْتِيكَ رَئِيًّا تَرَاهُ لَا تَسْتَطِيعُ رَدَّهُ عَنْ نَفْسِكَ، طَلَبْنَا لَكَ الطِّبَّ، وَبَذَلْنَا فِيهِ أَمْوَالَنَا حَتَّى نُبَرِّئَكَ مِنْهُ، فَإِنَّهُ رُبَّمَا غَلَبَ التَّابِعُ عَلَى الرَّجُلِ حَتَّى يُدَاوَى مِنْهُ -أَوْ كَمَا قَالَ لَهُ-حَتَّى إِذَا فَرَغَ عُتْبَةُ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْتَمِعُ مِنْهُ قَالَ: ((أَفَرَغْتَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ؟)) قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: ((فَاسْتَمِعْ مِنِّي)) قَالَ: أَفْعَلُ. قَالَ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم. حم. تَنزِيلٌ مِنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ. بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ﴾ ثُمَّ مَضَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيهَا يَقْرَؤُهَا عَلَيْهِ. فَلَمَّا سَمِعَ عُتْبَةُ أَنْصَتَ لَهَا وَأَلْقَى يَدَيْهِ خَلْفَ ظَهْرِهِ مُعْتَمِدًا عَلَيْهِمَا يَسْمَعُ مِنْهُ، ثُمَّ انْتَهَى رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى السَّجْدَةِ مِنْهَا، فَسَجَدَ ثُمَّ قَالَ: (( قَدْ سَمِعْتَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ مَا سَمِعْتَ، فَأَنْتَ وَذَاكَ )) فَقَامَ عُتْبَةُ إِلَى أَصْحَابِهِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: أُقْسِمُ - يَحْلِفُ بِاللَّهِ- لَقَدْ جَاءَكُمْ أَبُو الْوَلِيدِ بِغَيْرِ الْوَجْهِ الَّذِي ذَهَبَ بِهِ. فَلَمَّا جَلَسَ إِلَيْهِمْ قَالُوا: مَا وَرَاءَكَ يَا أَبَا الْوَلِيدِ؟ قَالَ: وَرَائِي أَنِّي قَدْ سَمِعْتُ قَوْلًا وَاللَّهِ مَا سَمِعْتُ مِثْلَهُ قَطُّ، وَاللَّهِ مَا هُوَ بِالسِّحْرِ وَلَا بِالشِّعْرِ وَلَا بِالْكِهَانَةِ. يَا مَعْشَرَ قُرَيْشٍ، أَطِيعُونِي وَاجْعَلُوهَا لِي، خَلُّوا بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ مَا هُوَ فِيهِ فَاعْتَزِلُوهُ، فَوَاللَّهِ ليكونَنَّ لِقَوْلِهِ الَّذِي سَمِعْتُ نَبَأٌ، فَإِنْ تُصِبْهُ الْعَرَبُ فَقَدْ كُفِيتُمُوهُ بِغَيْرِكُمْ، وَإِنْ يَظْهَرْ عَلَى الْعَرَبِ فَمُلْكُهُ مُلْكُكُمْ، وَعِزُّهُ عِزُّكُمْ، وَكُنْتُمْ أَسْعَدَ النَّاسِ بِهِ. قَالُوا: سَحَرَكَ وَاللَّهِ يَا أَبَا

(یەکێك لە سەیدەکانی قورەیش کە (عوتبەی کوڕی ڕەبیعە)یە ناسراو بە (أبو الولید) پێشنیازی قسەکردن دەکات لەگەڵ محمد(صلى الله علیه وسلم) پاش ئەوەی (حەمزە ـ رضي الله عنه ـ )موسڵمان دەبێت و ترسی بانگەوازی ئیسلام لەسەریان مەترسیدارتر دەبێت، سەیدەکانی مەککە ئەم پێشنیازە قەبوول دەکەن و (عوتبە) هەڵدەستێت بە کارەکەی کە وەکو مفاوزاتێکی ئەم سەردەمەیە و دوو قولی لەگەڵ **محمد**(صلى الله علیه وسلم) دادەنیشێت و پێی دەڵێت: برازاکەم جێی تۆ لەناو ئێمەی قورەیشدا دیارە نەسەبێکی بەرز و خانەوادەیەکی بەڕێز، بەڵام تۆ بەڕاستی بە شتێکی ناموو هاتووی بۆ قەومەکەت، کە بۆتە هۆی دووبەرەکی تەباییان و ناشرینکردنی بۆچوونەکانیان و لەکەدارکردنی خوداکانیان و بەکافردانانی باپیرانیان، گوێم لێبگرە با هەندێك پێشنیارت بۆ بکەم. پێغەمبەریش(صلى الله علیه وسلم) پێی دەفەرمێت: **(أبو الولید، فەرموو بڵێ)**، ئەویش گوتی: برازاکەم ئەگەر مەبەستت لەو پەیامەی کە تۆ بانگەوازی بۆ دەکەی ماڵی دونیابێت، بۆت کۆدەکەینەوە تاوەکو لە هەمووومان دەوڵەمەندتربی و ئەگەر مەبەستت دەسەڵاتداری و مولك بێت بەسەر ئێمەدا، شەرت بێت بێی تۆ هەنگاو نەنێین و مەلیکمان بە و مولکەکەش بۆ تو، ئەگەر ئەوەی بۆت دێت نەخۆشییەکە ناتوانی ڕەتی بکەیەوە با هەموو دکتور و دەرمانزانت بۆ کۆکەینەوە و چارەسەرت بکەین ....هتد. بەم شێوەیە چەندین پێشنیازی خستەڕوو، پێغەمبەرمان(صلى الله علیه وسلم) بەوپەری بێدەنگی گوێبیستی بوو تاوەکو قسەکانی تەواوکردن پێی فەرموو: **(أبو الولید هەمووت گوت و هیچت لەناو دڵدا نەهێشت)** گوتی: بەڵێ هەمووم گوت.

---

الْوَلِيدِ بِلِسَانِهِ! قَالَ: هَذَا رَأْيِي فِيهِ، فَاصْنَعُوا مَا بَدَا لَكُمْ )) وينظر: تفسير ابن كثير(١٢\٢١٧ ـ ٢١٨) و روايات القصة.

فەرمووی: (ئیتر گوێبیستم دەبی؟)) گوتی: بەڵێ. فەرمووی: ﴿حمٓ ۝ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ۝ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ۝ .... ﴾ ئایەتەکانی سورەتی (فصلت)ی بۆ خوێندنەوە، کە کاریگەریان بەسەر (عوتبە)دا گەلێك زۆر بوو، بە دەمووچاوێکی دیکەوە بۆ ناو سەیدەکانی مەککە گەڕایەوە و پێشنیازی ئەوەیان بۆ کردن کە واز لە (محمد) ـ (صلی الله علیه وسلم) ـ بێنن، چونکە ئەوەی بیستویەتی شتێکی گەورەیە و سیحر و شیعر نییە، پەخشان و گۆمانیش نییە، ئەگەر سەرکەوت لە خۆمانە و ئەگەریش لەناوچوو ئەوا بە دڵی خۆمانە با بەدەستی خۆمان نەبێت، بەڵام سەیدەکانی قورەیش پێشنیازەکەیان قەبوول نەکرد و تومەتباریانکرد بەوەی کە (محمد) ـ (صلی الله علیه وسلم) ـ سحری لێکردووە.

جێی شاهێد گوێبیستنی پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) بۆ قسە پوچەلەکانی (عتبة بن ربيعة)، وانەیەکە لە وانەکانی کات بەخشین، کە وای لە (عتبة ـ أبا الوليد ـ) کرد زۆر بەجوانی گوێبیستی پەیامەکەی پێغەمبەرمان بێت (صلی الله علیه وسلم) ئامۆژگاری قەومەکەشی بکات بەوەی کە باسکرا. ئەمەش ـ کات بەخشین ـ بنەمایەکی گرنگی هەڵسوکەوتکردنە لەگەڵ کات، کە بە هۆیەوە لە بەرزایەکانی چیای ئەدەبەوە ئاوی ئومێدەواری بۆ ناو دڵە ڕەقەکان شۆڕدەبێتەوە، دەنگی ئومێدەواری دەگاتە قوولایەکانی دەریای نائومێدی بۆ ڕزگارکردنی خنکاوەکان. کەواتە کات ببەخشە و گوێبیستی بەرامبەرت بە بائەوەی ناو دڵی بلێت، تاوەکو بگەیتە ناو دڵی، لەوێ بمێنی و لەوێ ئومێدەواری بچێنی.لە بنەمای نوزدەمیشدا ـ بە پشت بەستن بە خودا ـ پێکەوە دەڵێین: (نا بۆ نائومێدی):

## بنەمای نوزدەم:

## (نا بۆ نائومێدی)

ئەگەر مرۆڤ لەسەر ئەم بنەمایانەی پێشو هەڵسوکەوتی کرد و کاتی بە فیڕۆنەدا ئەوا لە سەرکەوتندا دەژیت و با چاوەڕوانی هێشتان سەرکەوتن بکات لەخوداوە و نائومێد و بێزارنەبێت لە هەندێك دەرئەنجامی نەخوازراو کە بەشێکن لە تاقیکردنەوەی ژیان، بەڵکو هەرکات هەستی بە ناچالاکی یان نائومێدی کرد لەبەر دواکەوتنی شتە خوازراوەکان با بزانێت دواکەوتن لە هاتنی شتێکی خوازراو مانای نەهاتنی نییە، بەڵکو بە دەقی قورئانی پیرۆز مانای هاتن یان نزیکبوونی هاتنیەتی:

* لە ژیاننامەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) سورەتی: ﴿وَٱلضُّحَىٰ ۝ وَٱلَّيۡلِ إِذَا سَجَىٰ ۝ مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ﴾[1] دابەزی پاش ئەوەی پێغەمبەرمان زۆر نیگەران بوو لە وەستانی (وەحی) کافرەکان پێی دڵخۆش بوون و دەیانگوت: (إن رب محمدٍ ودعه و قلاه)[2]

* لە باسی کاتی هاتنی سەرکەوتنی پێغەمبەران(عليهم السلام) پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾[3] واتە: پاش نائومێدی پێغەمبەران (عليهم السلام) لە هاتنی سەرکەوتن و ئیمان هێنانی خەڵك و گومانبردنیان بەوەی کە بەدرۆخرانەوە،

---

(١) الضحى: ١ ـ ٣.

(٢) ينظر: الإستعاب في بيان الأسباب (٣\ ٥٢٠ ـ ٥٢٦).

(٣) يوسف: ١١٠.

خودا سەرکەوتنی بانگەوازەکەیان پێدەبەخشێت، تاوەکو بزانن سەرکەوتن لە خوداوەیە و خودا ماندوبوونیان بە هەدەر نادات لە دونیا و قیامەتدا.

* لە ژیانی ڕۆژانەی جوتیاران و کاسبکاران: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ مِنۢ بَعْدِ مَا قَنَطُوا۟ وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُۥ ۚ وَهُوَ ٱلْوَلِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾[1] واتە: پاش نائومێدبوونی جوتیاران لە باران بارین، خودا بارانیان بۆ دەبارێنێت، تاوەکو زەویەکان بژێنێتەوە بە ئاوی باران و دڵەکان بژێنێتەوە بەڕەحمەتی خۆی.

* لە هەموو لایەکی ژیان : ﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِى ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِىَ ٱلصَّٰلِحُونَ﴾[2] و دەقەکەی زەبوور: ﴿وَالصِّدِيقُون يَرِثُونَ الأَرْضَ وَ يَسْكُنُونَهَا الأَبد﴾ [3] واتە: هەرکاتێك چاکسازی لە کردار و گوفتاری خەڵکدا دروست بوو، ئەوا میراتی زەوی لەستەمکاران دەسێنرێت و دەدرێتە دەست ئیمانداران.

کەواتە پێویستە یەقینمان هەبێت ستەم لێکراو مافەکانی وەردەگرێت لە ستەمکار، خێر و ڕاستی بەسەر شەڕ و گەندەلیدا سەردەکەون، تەنها بەیەك مەرج ئەویش گرتنەبەری هۆکارە شەرعییەکانی سەرکەوتنە، بە شوێنکەوتنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم)، کە لەم زەمانەدا و لە هەموو زەمانێك ئەم شوێنکەوتنە برتییە لە دروستکردنی کەشتی نوح(عليه السلام) کە مرۆڤایەتی رزگار دەکات.

---

(١) الشورى: ٢٨ .

(٢) الأنبياء: ١٠٥.

(٣) {العهد العتيق\ سِفر المزامير \ المزمور السابع و الثلاثون \الآية:٣٠ } من الكتاب المقدس(٢\٧٣ ط. مطبعة المرسلين اليوسعين١٨٨٥م)

سەرکردەی ناودار (نورالدین زەنکی)[١] ئەم ڕاستییەی دەزانی بۆیە کاتی پلاندانانی بۆ فەتحکردنی (بیت المقدس) بە شەو پلانی دادەڕێشت لەگەڵ سەرکردەکانی جەنگ و بە ڕۆژیش دارتاش و ئەندازیاری کۆدەکردنەوە بۆ دروستکردنی مینبەرێك بۆ ئەوەی پاش فەتحکردن لە مزگەوتی (أقصى) وتاری لەسەربدات، کاتی دروستکردنی مینبەرەکە خەڵکانێك بەلایاندا تێدەپەڕین، بە پێکەنینێکی سەراوبن گاڵتەی پێدەکردن، نورالدینیش ئایەتی: ﴿وَيَصۡنَعُ ٱلۡفُلۡكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيۡهِ مَلَأٞ مِّن قَوۡمِهِۦ سَخِرُواْ مِنۡهُۚ قَالَ إِن تَسۡخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسۡخَرُ مِنكُمۡ كَمَا تَسۡخَرُونَ﴾[٢] دەخوێندنەوە چاوەڕوانی سەرکەوتن بوو وەکو نوح(عليه السلام)[٣]، دەیزانی دروستکردنی مینبەر دروستکردنی ئومێدە لە سینەی هەموو گەنجێك، دەربڕینە لە ئیمانێکی پڕ یەقین کە خودا پەیمانی سەرکەوتنی بە ئیمانداران و چاکەکاران داوە و دەیهێنێتە جێ[٤] : ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗا﴾[٥] واتە: (خودا بەڵێنی بە ئیمانداران و چاکەکارانی داوە لە ئێوە کە خەلافەتی زەوییان

---

(١) ينظر: سيرته العطرة في (سير أعلام النبلاء ٢٠\٥٣١ ـ ٥٣٩ ط. المؤسسة)

(٢) هود: ٣٨.

(٣) وروي عن النبي (صلى الله عليه وسلم) أنه قال: (إِنَّ أَفْضَلَ الْعِبَادَةِ انْتِظَارُ الْفَرَجِ مِنَ اللَّهِ) رواه الترمذي في جامعه(٣٥٧١) و البزار في مسنده (٦٢٩٧) و اللفظ له .

(٤) ينظر: قصص النوازل للجيزاني ص١٠١. و المنبر أدخلها صلاح الدين المسجدَ عند الفتح و بقى فيه يعرف بالمنبر الصلاحي إلى أن أحرقها الصهاينة ٢١\٨\١٩٦٩م لما أحرقوا الأقصى و ينظر: صورة المنبر في كتاب (كنوز القدس ص٧٩)

(٥) النور:٥٥.

پێدەبەخشێت، هەروەك بە ئیماندار و چاكەكارانی پێشتری بەخشیوە، ئەو ئاینەی كە خودا پێی خۆشە كە ئیسلامە بۆیان دەچەسپێنێت ، ترسیان بۆ دەگۆڕێتەوە بە ئارامی و ئاسایش، تاوەكو لەوپەڕی ئارامیدا خوداپەرستی بكەن و شیرك بۆ خودا ئەنجام نەدەن...).

گرنگیش لای ئەم چاكەكارانە ئەوە نییە ئەم پەیمان و بەڵێنە خوداییە لە دونیادا ببینین ـ هەرچەندە دەیبینن هەركاتێك مەرجەكانی بەدیهاتن ـ بەڵام گرنگ لایان ئەوەیە كە بەپێی ڕێنمایەكانی ئەم پەیمانە خوداییە هەڵسوكەوت بكەن (سەفینەی نوح دروست بكەن) و تا دوا هەناسە لە چاوەڕوانی سەركەوتندان، ئەم چاوەڕوانییەش گەورەترین عیبادەتە و لە كتێبەكانی فەرموودەدا هاتووە كە باشترینی عیبادەت چاوەڕوانی هاتنی سەركەوتنی خودایە بۆ ئیماندار لە تەنگانەدا: ((إِنَّ أَفْضَلَ الْعِبَادَةِ انْتِظَارُ الْفَرَجِ مِنَ اللَّهِ))[١] .

یەكێك لە گەورە زانایانی ئەم سەردەمە ئەم مانایانەی بەردەوامی لەسەر ڕێگای ڕاست بە وشەیەكی زێڕین دەردەبڕێت و دەفەرمێت: (**ڕێگامان بۆ خودا درێژە ئێمەش وەكو كیسەڵ بەسەریدا دەڕۆین، ئامانجەكەش ئەوە نییە بگەیتە كۆتایی ڕێگاكە، بەڵام ئامانجەكە ئەوەیە كاتی مردن لەسەر ڕێگاكەبین**).

**قل الشيخ محمد ناصرالدين الألباني (رحمه الله):**

**الطريق الى الله طويل ونحن نمضي فيه كالسلحفاة، وليست الغاية أن نصل لنهاية الطريق، ولكن الغاية أن نموت ونحن على الطريق.**

---

(١) رواه الترمذي في جامعه(٣٥٧١) و البزار في مسنده (٦٢٩٧) و اللفظ له .

ڕاڤەی ئەم وتە زێڕینەش کۆتایی بابەتەکەمانە بە سێ پرسیار:

پرسیاری یەکەم: بۆچی فەرمووی: (**ڕێگامان بۆ خودا درێژە**)کەچی مرۆڤ ئەوەندە تەمەن درێژ نییە؟

وەڵام: جۆراوجۆری ئەرکەکانی بەندایەتی بۆ خودا و خزمەتکردن بۆ خەڵك تەمەن درێژی بە ئیماندار دەبەخشن، بەمەش ڕێگاکە درێژ دەبێتەوە.

پرسیاری دووەم: بۆچی فەرمووی: (**ئێمەش وەکو کیسەڵ بەسەریدا دەڕۆین**) کەچی پێویست ئەوەیە کە پەلە بکرێت لەکارەکانی بەندایەتی بۆ خودا و خزمەتکردن بۆ خەڵك؟

وەڵام: شیاوی و گەورەیی خودا بە ڕادەیەکە کە بە هەر خێراییەك ئەرکەکانی بەندایەتی بە جێبگەیەنی ناگەیتە ڕادەی پێویست.

پرسیاری سێیەم: بۆچی فەرمووی: (**ئامانجەکەش ئەوەنییە بگەیتە کۆتایی ڕێگاکە، بەڵام ئامانجەکە ئەوەیە کاتی مردن لەسەر ڕێگاکە بین**).

وەڵام: چونکە لانەدان و بەردەوامی لەسەر ڕێگاکە ژیانی ڕاستەقینەی ئیمانداره لە دونیادا کە خۆی لە خۆیدا ئامانجی ژیانە و خۆ ئامادەکردنە بۆ ئاواتی راستەقینەی ژیان کە بەهەشتە و لە دەرەوەی ئەم ژیانەیە پاش مردن ئیماندار پێیدەگات وەك لە بنەمای یەکەمدا باسکرا.





# پـــرســـیـــار و وەڵامــی A و B

## بەشـــ(١)ـــی یەکـــەم: پرسیار و وەڵام لە ئەحکامی فیقهیدا

### بابەتی شەشەم: هۆکارەکانی بێ دەستنوێژ بوون

پرسیاری یەکەم:

ئەو هۆکارانە چین کە موسڵمان بەهۆیانەوە بێ دەست نوێژ دەبێت؟

وەڵام:

ئەو هۆکارانەی موسڵمان بە هۆیانەوە تووشی بێدەست نوێژی دەبێت، دەتوانین بە چوار بەش پۆلێنیان بکەین:

یەکەم: نەمانی هۆش و عەقل

ئەمەش لە نزیکترین قسەی زانایان بۆ بەڵگەی شەرعی دوو حاڵەتی هەیە:

١ ـ نووستنێکی قووڵ چ بە دانیشتن بێت یان ڕاکشان و پاڵدانەوە [(١)] .

٢ ـ بۆرانەوە ولەخۆچوون بەهەر هۆکارێك [(٢)] .

---

(١) جمعاً بين الأدلة:

* عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ قَالَ : (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَأْمُرُنَا أَنْ لاَ نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ مِنْ جَنَابَةٍ لَكِنْ مِنْ غَائِطٍ وَبَوْلٍ وَنَوْمٍ).رواه: أحمد(٤\٢٣٩) نسائي(١\٩٨،٨٣) ترمذي (١\١٥٩) ابن ماجه(١\٧١).

* عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَنْتَظِرُونَ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ حَتَّى تَخْفِقَ رُءُوسُهُمْ ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلاَ يَتَوَضَّئُونَ . رواه أبوداود (١\٥١) و عند مسلم (١\٢٨٤) بلفظ: (كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَنَامُونَ ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلاَ يَتَوَضَّئُونَ ).

* عَنْ عبدالله بنِ عمرو مرفوعاً: (من نام وهو جالس فلا وضوء عليه فإذا وضع جنبه فعليه الوضوء) رواه الطبراني في الأوسط (٦\١٥٢) بسندٍ ضعيف ينظر: فتح الغفار الجامع لأحكام سنة نبينا المختار (١\١٢٣ ـ ١٢٤) و فتاوى الشيخ محمد صالح العثيمين (١١\١٩٥).

(٢) قياساً على النوم. ينظر: فتاوى الشيخ محمد صالح العثيمين (١١\٢٠٠ ـ ٢٠١).

دووەم: چەند خواردنێکی تایبەت

ئەمەش لە نزیکترین قسەی زانایان بۆ بەڵگە تەنها گوشتی حوشتر دەگرێتەوە.

١ ـ خواردنی گوشتی حوشتر[١].

٠ ـ خواردنی هەر گوشتێکی دیکە دەستنوێژ ناشکێنێت [٢] .

٠ ـ خواردنی هەر خواردنێکی بە ئاگر گەیشتوو دەستنوێژ ناشکێنێت [٣] .

سێیەم: هاتنە دەرەوەی پاشماوەکان لە بەشی خوارەوەی مرۆڤەوە.

ئەمەش چوار شت دەگرێتەوە:

١ ـ هەوا[١] کاتێ دەنگ یان بۆن یان یەقین هەبێت، دەرهاتنی لە خوارەوە لە جێی پیسایی بۆ پیاو و ژن نەك لە ڕەحمی ئافرەت[٢] . بەڵام ئەگەر یەقین نەبێت لە دەرهاتنی

---

(١)(٣) عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ قَالَ «إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضَّأْ». قَالَ أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ قَالَ «نَعَمْ فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ» رواه مسلم (١\٢٧٥). وفي لفظ : « تَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ وَلاَ تَوَضَّئُوا مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ » رواه أبوداود (١\٤٧) و الترمذي (١\١٢٣) و ابن ماجه(١\١٦٦) و صححه ابن خزيمة و قال: لم أرَ خلافاً بين علماء الحديث أن هذا الخبر صحيح. ينظر: فتح الغفار(١\١٢٨). و كتاب (النظر فيما علق الشافعي القول به على صحة الخبر ص٩٩ ـ ١٠٦) تأليف سعيد باشنفر.

(٣) ذهب بعض أهل العلم أن الأمر بالوضوء مما مست النار منسوخ:
قَالَ ابْنُ شِهَابٍ أَخْبَرَنِى عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ إِبْرَاهِيمَ بْنِ قَارِظٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ وَجَدَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ عَلَى الْمَسْجِدِ فَقَالَ إِنَّمَا أَتَوَضَّأُ مِنْ أَثْوَارِ أَقِطٍ أَكَلْتُهَا لأَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ «تَوَضَّئُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ» . رواه مسلم (٨١٥ مكنز). و عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِىِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ فَأَكَلَ مِنْهَا فَدُعِىَ إِلَى الصَّلاَةِ فَقَامَ وَطَرَحَ السِّكِّينَ وَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ . رواه مسلم (٨٢٠ مكنز). و عن جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: ( كَانَ آخِرَ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم تَرْكُ الْوُضُوءِ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ). رواه النسائي(١\١٠٨) و الترمذي(٨) و أبوداود(١٩٢). ينظر: الأحكام الفقهية التي قيل فيها بالنسخ و أثر ذلك في إختلاف الفقهاء جمعاً و دراسة (١\٤١٩ ـ ٤٤٦) تأليف: د. محمدإبراهيم سركند. و يأتي مزيد قولٍ في ذلك في جواب السؤآل الثاني ـ إن شاء الله ـ.

هەوا لە جێی پیسایی و تەنها گومان هەبێت، ئەوا ئەحکام لەسەر گومان دانامەزرێن و ئەو کات مەرجی هەبوونی دەنگ یان بۆن پێویستە[٣] .

٢ ـ هەردوو پیسایی[٤].

٣ ـ مذي و وەدی[٥]، بەڵام (مەنی) غوسلی لێدەکەوێتەوە.

٤ ـ خوێنی ئیستیحازە[٦] ـ ئەو خوێنەیە کە ئافرەت بەردەوام دەبینێت جیاوازە لە خوێنی حەیز و نیفاس ـ ، خوێنی حەیز و نیفاس غوسلی لێدەکەوێتەوە.

• ـ حیجامە[٧].(دەستنوێژ ناشکێنێت).

• ـ ڕشانەوە[١] . (دەستنوێژ ناشکێنێت).

---

(١) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ » . قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ مَا الْحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ . رواه البخاري (١٣٥).

(٢) قال الشيخ العثيمين رحمه الله (الفتاوى: ١١\١٩٧) : خروج الهواء من فرج المرأة لا ينقض الوضوء ، لإنه لا يخرج من محل نجس كالريح التي تخرج من الدبر.

(٣) عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم الرَّجُلُ الَّذِى يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّىْءَ فِى الصَّلاَةِ . فَقَالَ « لاَ يَنْفَتِلْ - أَوْ لاَ يَنْصَرِفْ - حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا » .

(٤) عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَسَّالٍ قَالَ : (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَأْمُرُنَا أَنْ لاَ نَنْزِعَ خِفَافَنَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ إِلاَّ مِنْ جَنَابَةٍ لَكِنْ مِنْ غَائِطٍ وَبَوْلٍ وَنَوْمٍ).رواه: أحمد(٤\٢٣٩) نسائي(١\٩٨،٨٣) ترمذي (١\١٥٩) ابن ماجه(١\٧١).

(٥) عَنِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ عَنْ عَلِيٍّ قَالَ كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً وَكُنْتُ أَسْتَحْيِى أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم لِمَكَانِ ابْنَتِهِ فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ فَقَالَ « يَغْسِلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوَضَّأُ » . و الإجماع منعقد على نقض الوضوء بخروج الودي و المذي ينظر: الإقناع في مسائل الإجماع للفاسي (١\١٤٠ رقم : ٢٣٩).

(٦) عن هِشَامِ بْنُ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ جَاءَتْ فَاطِمَةُ ابْنَةُ أَبِى حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: « لاَ، إِنَّمَا ذَلِكِ عِرْقٌ ، وَلَيْسَ بِحَيْضٍ ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِى الصَّلاَةَ ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِى عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّى». قَالَ وَقَالَ أَبِى: « ثُمَّ تَوَضَّئِى لِكُلِّ صَلاَةٍ ، حَتَّى يَجِىءَ ذَلِكَ الْوَقْتُ». رواه البخاري (٢٢٨). والإشراف: دم الإستحاضة ينقض الطهارة، و يوجب الوضوء بالإجماع إلا في قول ربعة ينظر: الإقناع في مسائل الإجماع (١\١٤٦) .

(٧) عن أنسٍ ( رضي الله عنه) قال: (احتجم النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ ولم يتوضأ، ولم يزد على غسل محاجمه) رواه الدارقطني (١\١٥١) و البيهقي (١\١٤١) بإسنادٍ ضعيف. ينظر: فتح الغفار(١\١٢١ ـ ١٢٢).

• ـ خوێن بەربوون لە لووت[٢]. (دەستنوێژ ناشکێنێت).

• ـ خوێن بەربوون بەهۆی هەر برینداریی‌ەك [٣] (دەستنوێژ ناشکێنێت).

چوارەم: دەست بەرکەوتن.

ئەمەش لە نزیکترین قسەی زانایان بۆ بەڵگە تەنها یەك حاڵەتی هەیە:

١ـ دەست بەرکەوتنی زەکەر بە شەهوەت[٤].

• ـ دەست بەرکەوتن بە ئافرەتی نامەحرەم [٥]. (دەستنوێژ ناشکێنێت لە نزیکترینی قسەی زانایان بۆ بەڵگە).

---

(١)(٥) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « مَنْ أَصَابَهُ قَىْءٌ أَوْ رُعَافٌ أَوْ قَلَسٌ أَوْ مَذْىٌ فَلْيَنْصَرِفْ فَلْيَتَوَضَّأْ ثُمَّ لْيَبْنِ عَلَى صَلاَتِهِ وَهُوَ فِى ذَلِكَ لاَ يَتَكَلَّمُ » رواه ابن ماجه (١٢٢١) وهو حيثٌ ضعيف، ضعَّفه أحمد وابن معين. ينظر: الإقناع في مسائل الإجماع (١\١٥٥ ـ ١٥٦ الحاشية).

(٣) قال الحسن: ((مازال المسلمون يصلون في جراحاتهم)) أخرجه البخاري تعليقاً و وصله ابن أبي شيبة كما في الفتح(١\٢٨٠).

(٤) جمعاً بين الأدلة:

* عَنْ عُرْوَةَ قالَ دَخَلْتُ عَلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ فَذَكَرْنَا مَا يَكُونُ مِنْهُ الْوُضُوءُ. فَقَالَ مَرْوَانُ وَمِنْ مَسِّ الذَّكَرِ. فَقَالَ عُرْوَةُ مَا عَلِمْتُ ذَلِكَ. فَقَالَ مَرْوَانُ أَخْبَرَتْنِى بُسْرَةُ بِنْتُ صَفْوَانَ أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: « مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ » رواه أحمد (٦\٤٠٦) و أبوداود (١٨١) و الترمذي (٨٢) و صححه. و عند أحمد في المسند(٢\٢٢٣) زيادة: (( و أَيُّمَا امرأَةٍ مَسَّتْ فَرْجَهَا فَلْتَتَوَضَأ)) من حديث عائشة ( رضي الله عنها) مرفوعاً و صوب الحاكم في المستدرك(١\١٣٨) وقفه.

* عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ خَرَجْنَا وَفْدًا حَتَّى قَدِمْنَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَبَايَعْنَاهُ وَصَلَّيْنَا مَعَهُ فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ جَاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِىٌّ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَرَى فِى رَجُلٍ مَسَّ ذَكَرَهُ فِى الصَّلاَةِ قَالَ «وَهَلْ هُوَ إِلاَّ مُضْغَةٌ مِنْكَ أَوْ بَضْعَةٌ مِنْكَ». رواه أحمد (٤\٢٣) و أبو داود (١٨٢ ، ١٨٣) و النسائي (١\١٠١) و صححه ابن حبان (١١١٩). قال البخاري حيث بسرةَ أصح مافي الباب، و قال شيخه ابن المدني حديث طلق بن علي أحسن من حديث بسرة. ينظر: بلوغ المرام (٦٨ ، ٦٧) .

(٥) الأرجح عدم نقض الوضوء بمس المرأة لأمور:

* تفسير ابن عباس ( رضي الله عنهما) لقوله تعالى ﴿أَوۡ لَـٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ بالجماع قال ( رضي الله عنهما) : (المسُّ و اللَّمس و المباشرة الجماع ولكن الله يكني ما شاء بما شاء). أخرجه الطبري (٩٥٨١) و ابن أبي شيبة (١\١٦٦). و تفسير ابن عباس ( رضي الله عنه) مؤيد بأمور:

١ ـ الطهارة هي الأصل فلا ينقل عنه إلا بدليلٍ صريح لا يتطرق إليه الإحتمال، و قول ابن عباس ( رضي الله عنهما) مؤيد لهذا الأصل.

٢ ـ قول ابن عباس ( رضي الله عنهما) مقدمٌ في التفسير على غيره من الصحابة لإن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) دعا له: (اللهم فقه في الدين علمه التأويل) أخرجه أحمد (٢٣٩٧) و أصله في الصحيحن.

٣ ـ قوله ( رضي الله عنه) هو مؤيد بالسياق البلاغي للآية قال بعض أهل العلم: (أنَّ في الآية دليلاً على ذلك حيث قُسِّمت الطَّهارةُ إلى أصليَّة وبدل، وصُغرى وكُبرى، وبُيِّنَت أسباب كلّ من الصُّغرى والكُبرى في حالتي الأصل والبدل، وبيان ذلك أن الله تعالى قال: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾، فهذه طهارة بالماء أصليَّة صُغرى. ثم قال: ﴿وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾، وهذه طهارة بالماء أصليَّة كُبرى. ثم قال: ﴿ وَإِنْ كُنْتُمْ مَرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا﴾، فقوله: ﴿ فتيمَّمُوا﴾ هذا البدل، وقوله: ﴿أَوْ جَاءَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ﴾ هذا بيانُ سبب الصُّغرى، وقوله: ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ هذا بيان سبب الكُبرى. ولو حملناه على المسِّ الذي هو الجسُّ باليد، لكانت الآية الكريمة ذكر الله فيها سببين للطهارة الصُّغرى، وسكت الله عن سبب الطَّهارة الكُبرى مع أنَّه قال: ﴿ وَإِنْ كُنْتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾، وهذا خلاف البلاغة القرآنية .....وعليه فتكون الآية دالة على أن المُراد بقوله: ﴿أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاءَ﴾ أي: «جامعتم»، ليكون الله تعالى ذكر السَّببين الموجبين للطَّهارة، السَّببَ الأكبر، والسَّبب الأصغَر، والطَّهارتين الصُّغرى في الأعضاء الأربعة، والكُبرى في جميع البدن، والبدَل الذي هو طهارةُ التيمُّم في عضوين فقط لأنَّه يتساوى فيها الطَّهارة الكُبرى والصغرى.) ينظر : الشرح الممتع (١\٢٩٠ ـ ١٩١) و الأوسط (١\١٢٨)

٤ ـ قول ابن عباس ( رضي الله عنهما) مؤيدٌ بالمعقول إذ لا يمكن نوم الزوجين معاً على طهارة إن كان المراد بالمس مجرد اللمس، و النوم على الطهارة سنة فلا يتصور عقلاً أن يكون ثمة سنةٍ تعجزية.

* و رغم أن مسألة نقض الوضوء بمس المرأة مما تعم به البلوى، لم يثبت في السنة قط الوضوء من مس المرأة بل ثبت العكس:

١ ـ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم لَيْلَةً مِنَ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ **فَوَقَعَتْ يَدِى عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ** وَهُوَ فِى الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ « اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِى ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ » رواه مسلم (٢٢٢).



پرسیاری دووەم:

ئەو هۆکارانە چین کە باشتر وایە موسڵمان دەست نوێژیان بۆ بگرێتەوە؟

وەڵام:

بە دەستنوێژبوون سیفەتی ئیمانداره(١) و ئەو هۆکارانەی کە وادەکەن پارێزگاری لە بەدەستنوێژبوون زیاتربێت دەتوانین بۆ دوو بەش پۆلێنیان بکەین:

یەکەم: پێش چەند کارێکی تایبەت.

١ ـ دەستنوێژ نوێکردنەوە **پێش** هەموو نوێژێك(٢).

٢ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** خوێندنەوەی قورئان(٣).

٣ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** هەموو زیکرکردنێك(٤).

٤ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** دەستگەیاندن بە قورئان(المصحف)(٥).

---

٢ ـ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم أَنَّهَا قَالَتْ: ( كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَىْ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَرِجْلاَىَ فِى قِبْلَتِهِ ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِى ، فَقَبَضْتُ رِجْلَىَّ ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا). قَالَتْ: وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ .(متفقٌ عليه) وفي لفظٍ للنسائي في سننه(١\١٠١): (حتى إذا أرادَ أن يوترَ مسَّني برجْلِه).

٣ ـ عَنْ عَائِشَةَ: (أَنَّ النَّبِىَّ صلى الله عليه وسلم كَانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ ثُمَّ يُصَلِّى وَلاَ يَتَوَضَّأُ) رواه النسائي(١\١٠٤) و أبو داود (١٧٨). و للمزيد ينظر: كتاب (النظر فيما علق الشافعي القول به على صحة الخبر ص٨٥ ـ ٩٨ ط. دار ابن حزم) تأليف: سعيد باشنفر

(١) عَنْ ثَوْبَانَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم « اسْتَقِيمُوا وَلَنْ تُحْصُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ خَيْرَ أَعْمَالِكُمُ الصَّلاَةُ وَلاَ يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ إِلاَّ مُؤْمِنٌ » رواه مالك(١\١١ مكنز) و ابن ماجة (١\٤٥ مكنز).

(٢) عَنْ أبي هُريرةَ (رضي الله عنه) قالَ: قالَ رسولُ اللهِ(صلى الله عليه وسلم): ((لولا أن أشُقَّ على أمتي، لأمرتُهم عِندَ كُلِ صَلاةٍ بوضُوء، ومَعَ كُلِ وُضُوءٍ بِسواك)) رواه أحمد وينظر: صحيح الترغيب و الترهيب (١٩٣)

(٣)(٤) عَنِ الْمُهَاجِرِ بْنِ قُنْفُذٍ أَنَّهُ أَتَى النَّبِىَّ صلى الله عليه وسلم وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ حَتَّى تَوَضَّأَ ثُمَّ اعْتَذَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ «إِنِّى كَرِهْتُ أَنْ أَذْكُرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ عَلَى طُهْرٍ ».أَوْ قَالَ «عَلَى طَهَارَةٍ». رواه أبو داود(١٧) و ينظر: السلسلة الصحيحة (٨٣٤).

(٥) قال الشوكاني في نيل الأوطار(١\٢٦٠): ((قد وقع الإجماع على أنه لا يجوز للمحدث حدثاً أكبر أن يمسَّ المصحف، و خالف في ذلك داود )) و في الحدث الأصغر خلافٌ الراجح إستحباب الطهارة من باب تعظيم شعائر

٥ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** نووستن[١]. بە تایبەت ئەگەر بە جەنابەت بێت[٢].

٦ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** خواردن، ئەگەر بە جەنابەت بێت[٣].

٧ ـ دەستنوێژگرتن **پێش** غوسل دەرکردن[٤].

دووەم: پاش چەند کارێکی تایبەت.

١ ـ دەستنوێژگرتن **پاش** هەموو بێدەستنوێژ بوونێك[٥].

٢ ـ دەستنوێژگرتن **پاش** هەڵگرتنی مردوو بۆ قەبرستان[٦].

٣ ـ دەستنوێژگرتن **پاش** ڕشانەوە[١].

---

الله و ينظر: بسط الكلام في أدلة المسألة في الموسوعة الفقهية الميسرة في فقه الكتاب و السنة المطهرة (١١١\١ ـ ١١٧) تأليف: حسين العوايشة و منحة العلام شرح بلوغ المرام (٣٣١\١ ـ ٣٤٠). و ذكر شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله أن تحريم مس المصحف للمحدث ثابت عن بعض الصحابة ولا يعلم لهم مخالف. ينظر: مجموعة الفتاوى(٢٦٦\٢١، ٢٧٠ ، ٢٨٨ ).

(١) عَنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ ، ثُمَّ قُلِ اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِى إِلَيْكَ ....)). متفقٌ عليه .

(٢) عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهْوَ جُنُبٌ قَالَ « نَعَمْ إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ وَهُوَ جُنُبٌ » . متفقٌ عليه.

(٣) حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِى شَيْبَةَ حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ وَوَكِيعٌ وَغُنْدَرٌ عَنْ شُعْبَةَ عَنِ الْحَكَمِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنِ الأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا كَانَ جُنُبًا فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ. رواه مسلم (٣٠٥).

(٤) عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: ((كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ ...)) متفقٌ عليه.

(٥) عن أَبِى بُرَيْدَةَ قَالَ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَدَعَا بِلاَلاً فَقَالَ « يَا بِلاَلُ بِمَ سَبَقْتَنِى إِلَى الْجَنَّةِ مَا دَخَلْتُ الْجَنَّةَ قَطُّ إِلاَّ سَمِعْتُ خَشْخَشَتَكَ أَمَامِى ... » . فَقَالَ بِلاَلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَذَّنْتُ قَطُّ إِلاَّ صَلَّيْتُ رَكْعَتَيْنِ وَمَا أَصَابَنِى حَدَثٌ قَطُّ إِلاَّ تَوَضَّأْتُ عِنْدَهَا وَرَأَيْتُ أَنَّ لِلَّهِ عَلَىَّ رَكْعَتَيْنِ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «بِهِمَا» . رواه الترمذي (٤٠٥٣) و ينظر: تمام المنة(ص١١١).

(٦) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ «مَنْ غَسَّلَ الْمَيِّتَ فَلْيَغْتَسِلْ وَمَنْ حَمَلَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ». رواه أبو داود (٣١٦١) و الترمذي (٩٩٣).

٤ ـ دەستنوێژگرتن **پاش** هەموو خواردنێك بە ئاگر ئامادەكرابێ [٢].

٥ ـ دەستنوێژگرتن **پاش** جیماع، ئەگەر غوسلی دەرنەكردبێ ویستی بۆ جیماعكردن بگەڕێتەوە [٣].

**قال يونس بن عبد الأعلى:**

**(ما رأيت أعقل من الشافعي اختلفنا أنا وهو في مسألة، فلقيني بعد مدة فأخذ بيدي، فقال لي: إذا كنا قد اختلفنا في مسألة ألا يسعنا أن نبقى أخوين متحابين).**

---

(١) عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِى طَلْحَةَ عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَاءَ فَأَفْطَرَ فَتَوَضَّأَ. فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ فِى مَسْجِدِ دِمَشْقَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ صَدَقَ أَنَا صَبَبْتُ لَهُ وَضُوءَهُ. رواه أحمد(٢١٧٠١) والترمذي (٧٦) وأبوداود(٢٣٨١).

(٢) قَالَ ابْنُ شِهَابٍ أَخْبَرَنِى عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ إِبْرَاهِيمَ بْنِ قَارِظٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ وَجَدَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَتَوَضَّأُ عَلَى الْمَسْجِدِ فَقَالَ إِنَّمَا أَتَوَضَّأُ مِنْ أَثْوَارِ أَقِطٍ أَكَلْتُهَا لأَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: «تَوَضَّئُوا مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ» رواه مسلم(٣٥٢). وفي صحيح مسلم (٣٥٥)من حديث عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ: أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ: أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ ، فَدُعِىَ إِلَى الصَّلاَةِ فَأَلْقَى السِّكِّينَ فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. وحمل البعض أدلة الأمر بالوضوء مما مست النار على الإستحباب جمعاً بين الأدلة لا النسخ ينظر: مجموعة الفتاوى لشيخ الإسلام (٢٥\٢٣٩).

(٣) عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ» رواه مسلم (٣٠٨).

## پرسیاری سێیەم:

ئەو عیبادەتانە چین کە دەستنوێژ مەرجە لە کردنیان و بە بێ دەستنوێژ بەتاڵ دەبن؟

وەڵام:

تەنها دوو عیبادەت دەستنوێژگرتن مەرجە لە ئەنجامدانیاندا:

١ ـ نوێژ[(١)]. بە یەکڕایی زانایان نوێژی فەرز و سوننەت بە بێ دەستنوێژ ئەنجام نادرێن.

٢ ـ طەواف[(٢)].

## پرسیاری چوارەم:

ئایا دەستنوێژگرتن (وضوء) لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ئوممەتەیە؟

وەڵام:

نەخێر لە ئوممەتەکانی پێش ئیسلامیش دەستنوێژگرتن هەبووە وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە لە بەسەرهاتی (جریج)ی ڕاهبدا[(٣)] .

---

(١) آية مائدة: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ .... ﴾ . و قوله (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ وَلاَ صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ » رواه مسلم(٥٥٧).

(٢) لحديث ابن عباسٍ (رضي الله عنه) مرفوعاً ـ وقيل موقوفاً ـ: «الطَّوَافُ بِالْبَيْتِ صَلاَةٌ إلا أنّ اللهَ أباحَ فيهِ الكلام» أخرجه أحمد (١٥٤٢٣) و الترمذي(٩٦٠) و النسائي(٢٩٢٢). ينظر: الإرواء للألباني(١\١٥٦) و مجموعة الفتاوى لشيخ الإسلام (٢٦\١٩٨) و المحلى لإبن حزم (٧\١٧٩).

(٣) عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِىِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ «لَمْ يَتَكَلَّمْ فِى الْمَهْدِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ عِيسَى ، وَكَانَ فِى بَنِى إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ ، كَانَ يُصَلِّى ، فَجَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ ، فَقَالَ أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّى. فَقَالَتِ اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ. وَكَانَ جُرَيْجٌ فِى صَوْمَعَتِهِ ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِيًا، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَتْ مِنْ جُرَيْجٍ . فَأَتَوْهُ فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأَنْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى ثُمَّ أَتَى

پرسیاری پێنجەم:

حیکمەت چییە باسی شێوازی دەستنوێژگرتن لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بەڵام باسی شێوازی ئەنجامدانی نوێژ باسنەکراوە؟

وەڵام:

ئەم جۆرە باسانە لە سەر تەسلیم بوون بۆ فەرمانەکانی خودای پەروەردگار بینادەکرێن، کە تەنها خۆی هەموو حیکمەتەکان دەزانێت، بەڵام لە هەمانکاتدا تەسلیمبوون بۆ دەقی شەرعی مانای پشتکردن نییە لە حیکمەتەکانی دەقەکە، دەتوانین لە حیکمەتەکانی باس نەکردنی چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژ ـ بەڵکو زەکات و ڕۆژوو و حەجیش ـ لە قورئانی پیرۆزدا و تەنها باسکردنیان لە سوننەتدا (فەرمودە) بۆ چەند خاڵێك بگەڕێنینەوە لەوانە:

١ ـ ڕێزلێنان بۆ پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) و سوننەتەکەی کە خۆی موسڵمانان فێری چۆنیەتی ئەنجامدانیان دەکات. وەك لە ئایەتی ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ﴾ [1] داهاتووە واتە:(ئێمە قورئانمان بۆ تۆ دابەزاندووە، بۆ ئەوەی بۆ خەڵك ڕاڤەی بکەی و فێریان بکەی چۆن جێبەجێی بکەن).

٢ ـ سەلماندنی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)، چونکە ئەگەر خۆی قورئانی داهێنابێت یان کەسێك فێریکردبێت ـ وەکو کافرەکان دەڵێن ـ ئەوا باسی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەرکانەکانی دەکرد بە تایبەتی نوێژ، کە خاڵی جیابوونەوەی کوفر

---

الْغُلاَمَ فَقَالَ مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ قَالَ الرَّاعِي. قَالُوا نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ . قَالَ لاَ إِلاَّ مِنْ طِينٍ ...» رواه البخاري(٣٤٧٤مكنز).

(١) النحل: ٤٤.

و ئیمانە: «الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ »[١] چونکە کارەکانی مرۆڤ بەگرنگترین دەست پێدەکەن، نەك گرنگەکە بەجێدەهێڵێت.

٣ ـ ئاماژەکردنە بۆ پارێزگاری خودا بۆ سوننەتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) کە بەیانی ماناکانی قورئانی پیرۆزە، چونکە ناکرێت بگوترێت خودای پەروەردگار پیتەکانی قورئانی پاراستووە ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ۝٩﴾[٢] بەڵام ماناکەی نەپارێزراوە! لە کاتێکدا گرنگییەکە لە ماناکەیدایە، هەبوونی دەقی بێ مانای ڕاست و دروست وەکو نەبوون دەژمێرێت.

٤ ـ تاقیکردنەوەیەکی خودایە بۆ ئەوانەی بەناوی قورئانەوە ئینکاری سوننەت دەکەن، ﴿لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۗ﴾[٣] کە لە بەشی دووەمی پرسیار و وەڵامدا پوختە وەڵامدانەوەیەکیان دەبینرێت ـ إن شاء الله ـ .

**قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:**

**((ـ أَلاَ إِنِّى أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ ـ لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الأَمْرُ مِنْ أَمْرِى مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ فَيَقُولُ: لاَ نَدْرِى مَا وَجَدْنَا فِى كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ))**

رواه أحمد(٢٣٨٦١) (٢٢٨٧٦) و الترمذي (٢٦٦٣) و أبو داود (٤٦٠٥) و ابن ماجة(١٣)

**پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی:**

**((باش بزانن قورئانم پێبەخشراوە و فەرمودەش وەکو قورئانە لە ئەحکامەکانیدا، کەستان نەبینم لەسەر قەنەفەیەك پاڵی داوەتەوە، باسی ئەمر و فەرمانی منی بۆ دەکرێت، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: نازانم، تەنها ئەوەی لە قورئاندا بێت بڕوام پێی هەیە)).**

---

(١) رواه أحمد (٢٢٩٣٧) الترمذي (٢٦٢١) و النسائي (٤٦٣).

(٢) الحجر: ٩.

(٣) الأنفال: ٤٢.

# بەشـــ( ٢ )ـــــی دووەم: پرسیار و وەڵامی گشتی

## پرسیاری یەکەم:

**وەڵامدانەوەیەك بۆ ناحەزانی فـەرمودەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) بە شێـوەی پرسیـار و وەڵام ( گوتـراوە لە ڕۆژی جەژن ١٤٣٩ هـ =١٥\٦\٢٠١٨ لەسەر مینبەری مزگەوتی صلاح الدين الأيوبي\ بحركە )**

ئەی زانایانی سوننە و جەماعەت

پرسیارێك هەیە مەیکەن قیامەت

وەڵامان دەوێت لە بۆ ئەم خەڵکە

زانستییـــانە پڕ بێت لە بەڵگـــە

شـــەش بەرەباب پاشی پێغەمبەر

هەمـــــووی بەزرە نیانە خەبـــەر

پاشـــــی ئەمانە سوننە نووسراوە

چـــــۆن بڕوا بکەم ئەمە تەواوە؟

بە شەش بەرەباب سەدو هەشتا ساڵ

دەچێتـــە ناویەك سەدان قیل و قال

بە ســــــەد بوخاری ناکرێت بژارە

وەڵامــــــــم بدەن ئەمە پرسیارە

وەڵامــــــــم بدەن بڕوام پیٚ بیٚنن

مـــــەلێن کافرە دەی بیتوپیێنن

## وەڵام:

کەسی پرسیاربێژ پرسیارت بەخێر

ئێمە ڕێز دەگرین لە پرسیاری بوێر

گەر زانستی بێت دوور بێت لە هەڵە

نەك لە ئاوی لێل بكرێتن مەلـــــە

خاوێنیش بێتن دوور بێت لە پیسی

نەك تەنها عیناد وەكو ئیبلیسی

پـــــــرسیارەكەی تۆ پڕ چەواشەیە

پرسیاری كەسێكی دوور لە وشەیە

لـــــە سەر خەیاڵێك بونیات نراوە

كــــــە پاش پێغەمبەر زانا نەماوە

لـــــە كاتی ئەویش هیچ نەنووسراوە

هـــــــــــەتا بوخاری تاریكستانە

نووسینی ئەویش شەك و گــــــومانە

ئەم جەنگە كۆنە دژی رەســــــــولە

بەڵام پرسیارە بۆیە قـــــــــــەبوولە

پرسیارەكەی تۆ سەر سەروچـــــــاوە

گـــــەر پێمان بڵێیت كوا سەرچاوە؟

لە كوێ خوێندووتە ئەم مەعلوماتە؟

لـــــــە كێ بیستووتە ئەم تۆڕەهاتە؟

گەر بڵێی لە فلان سونەن و صەحیح

وەڵامی خۆت دا بەقەولی فەصیح

**یەكەم وەڵامە** لە بۆ ئەم خەڵكە

بڕوات پێ نییە و دەیكەیتە بەڵگە!

تـــــــــاكو بزانی خاوەن ستەمی

نەخوێندەوار و دوور لە قەلەمی

❊❊❊

**وەڵامی دووەم** بۆ کەسی پرسیار بێژ
گەر ئیمانی هەبێ بە ڕۆژوو و نوێــژ
چۆنیەتی نوێژ و هەر هەموو ئەرکان
چۆن بیانزانین تەنها لە قـــــورئان
هیچیان لە قورئان لێنەکراوە باس
تەنها سوننەتە بەیانــــە بۆ ناس
هەردووکیشیان پارێزراون بەحەق
سوننە بە ماناو قورئانیش بە دەق
گەر سوننە نەبێ، قورئان بێ سودە
بەیانی قورئانە تەنها فەرمـــودە
جەنگی دژ سوننە مەبەست قورئانە
جەنگی دژ قورئان دژ بە ئینسانە

❊❊❊

**وەڵامی سێیەم** پاراستن بە نووسین
سوننەت نووسراوە لە چاخی زێڕین
بە دەست هەڤاڵان پاشان تابعین
نووسین و حیفز وەك خوشك و برا
لە زانا بۆ زانا چرا بۆ چـــــرا
بەرەو پێش هاتن بە پارێزگاری
تا چاخی پۆلێن سەدەی بوخاری
بەنەقل و بیستن نووسی صەحیحە
بە دوو شاهێدی حیفز و صەحیفە

هەروەکو ئەویش گشت هاوڕێکانی

لە قوتابیانی و لە شێخەکانی

زانستیان نووشی لە سەروکانی

زانستیان نووسی زۆر بە ڕەوانی

گشتیان دەناسین بە پیرو بە کال

لە کویێ ژیاون کام ڕۆژ و کام ساڵ

یان چ کەسێك بوون بە هزر و بە حاڵ

گشتی تۆمارە لە کتوبی ریـــــجال

ئەمڕۆکەش پڕن گشت موزەخانە

لە مەخطوطاتی ئەم نووسراوانە

لە شەرق و لە غەرب شاهێدی بۆ یەك

هەزاران نوسەخ هەموو وەکو یەك

وەعدی خودایە ئەم پاراستنە

قورئان دەمێنیێ و دەمێنیێ سوونە

❋ ❋ ❋

**وەڵامی چوارەم** نیقاش و جەدەل

جەدەل بە بەڵگە یان عەقل بەدەل

**جەدەلی یەکەم** بۆ کەسی غەریق

شەیدای فەلسەفەی ڕۆمان و ئیغریق

کوا نووسراوەی ئەرسطو و ئەفلاطون

تۆ حوکم بدە بە هەمان قانون

دوور لە نووسین بوون ئەم دوو زانایە

گریمان سەردەمی زێڕینمان وایە

بۆچی دەمێنیٚ زانستی ئەوان؟

بەڵام جێی گومانە سوننەت و قورئان؟

کورد بەمە دەڵێن دوو هەواو بانێك

ئەمە ڕەوشتی ئەمڕۆی کەسانێك!

دەی خودایەگیان دەستییان بۆ بگرە

دەریان بهێنە لە زوڵکاوی ئەم فیکرە

❊❊❊

**جەدەلی دووەم** بۆ شوێنکەوتووی مەسیح

گەر بڵێت نییە سوننەتی صەحیح

با بەراوردکا لەنێوان بەیبلٚ

چۆن دژیەکاتی دەکەوتە سەردڵ

لە نێوان نوسەخ لە نێوان مانا

ئەمەندە بەسە بۆ کەسی زانا

بەڵام لە سوننە ئەمە نابینرێت

دژایەتی مانا هەرگیز ناچینرێت

نوسخە بۆ نوسخە وەکو ئاوێنە

شاهێدی دەدەن بۆ هەمان وێنە

کورد بەمە دەڵێن کەسی ماڵ شووشە

بەرد مەهاوێژە و شەڕ مەفرۆشە

❊❊❊

**جەدەلی سێیەم** بۆ شیعەی عەلی

یانیش مەزهەبی ئیثناعەشەری

کە دەڵێن سوننە: سوننەتی شەڕە

سەرچاوەی سوننە بێ سەروبەرە

عەجەم نووسیتی بڕوای پێناکەین

بوخاری کێیە لێی قەبوول ناکەین

ئیسنادەکانی لە بۆ هەڤاڵان

کە هەڵگەڕاوەن لە ئیمانداران

بۆ برای شیعە تەنها سێ پرسیار:

**یەك:** مەدحی قورئان بۆ مهاجر و ئەنصار

لە سورەتی تەوبە لە ئایەتی سەد

یان سورەتی فەتح هەزار و پێنج سەد

کە بەیعەتیاندا لە بۆ پێغەمبەر

لە ئایەتی هەژدە دەبینی خەبەر

دوو: دایە عائیشە لە سورەتی نوور

بەرائەتی ئەو، مەریەمی بەتول

خەبەری قورئان، شەرەفی ڕەسول

وەکو جولولەکە مەبێژن بوهتان

بوهتان بە دایکمان بوهتانە بە قورئان

**سێ:** قەولی عەلی لە سەنای عومەر

عومەری زاوای خەلیفەی ڕابەر

بۆ ئەم سێ پرسیارە وەڵامتان چییە؟

بە ڕاشکاوی و بەبێ توقییە

زۆر ئاشکرایە نیانە وەڵام

نەژات پەرستن بەناوی ئیسلام

بۆیە ناحەزن لە بۆ فەرموودە

لەگەڵ دەمارگیر قسە بێ سوودە
کورد فەرموویەتی ئەگەر کەس کەسە
لە بۆ ڕووناکی یەك قسە بەسە

❊❊❊

**جەدەلی پێنجەم** بۆ کەسی موسڵمان
پارێزگاری خودا بۆ سوننە و قورئان
بە تەلەقی یە و بە تەلەقی بوو
ئەگەر نا (الم) ئەلەم حەقی بوو
جیاوازی بکە لە (شرح) و (لقمان)
هەمان نووسینن سێ پیتی قورئان
تەنها بە بیستن بۆ ئەم ئاوازە
ئێمە دەزانین خوێندن جیاوازە
کەواتە نووسین تەنها هۆکارە
بە بێ تەلەقی نووسین بێ چارە
بە تەلەقی مانا و بە تەلەقی دەق
بۆ هەتا هەتا پارێزراوە حەق
یەك لە سینەدا و دوو لە لاپەڕە
بەردەوام دەبێت ئەم سەروبەرە
بەم دوو شێوازە ئەم پاراستنە
پێی پارێزراون قورئان و سوننە
ئەم خیطابەمان بۆ کەسی عاقل
بۆ کەسی ئیماندار تەحصیلی حاصل
خاوەن یەقینە دوور لە وەسوەسە

تەنها وەعدی خوا لە بۆ ئەو بەسە

دوا قسەشم بیست هەر لەو کەسە

گوتی: ئەمەی ناوێ یان ئەمە نابێ

صاحێب خودابێ و وەعدیشی دابێ

کام کەس پیاوە فوی لە چرابێ؟!

کەسی قەدرزان ماڵی ئاوابێ

کەسی بێ قەدر خوایە فەنابێ

بۆ هەموو کارێك پەنا خودا بێ

پرسیاری دووەم: زۆر دەبیستین کە پێغەمبەرمان(صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی(حب الوطن من الإيمان) ئایا ڕاستە ئەمە فەرمودەیە؟ ئەگەر فەرمودە نەبێت ئایا ماناکەی دروستە؟

وەڵام:

وەکو پێشەکییەك لە پێش وەڵامی پرسیارەکە پێویستە لە خاڵێکی گرنگ ئاگاداربین ئەویش ئەوەیە کە زانستەکانی ئیسلام بۆ دوو بەش پۆلێن دەکرێن:

یەکەمیان: ئەو زانستانەی پەیوەندیدارن بە دروستی و نادروستی گواستنەوەی دەقی شەرعی[١] لە فەرموودەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و وتەی هەڤاڵانی (رضي الله عنهم) وتەی زانایان و دانایانی ئەم ئوممەتە. ئایا ئەم گواستراوانە بە صەحیحی لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانی ئیسلامدا[٢] گواستراونەتەوە یان نا؟

دووەمیان: ئەو زانستانەی پەیوەندیدارن بە دروست تێگەیشتنی دەقە شەرعییەکە[٣]، کە ئەم تێگەیشتنە سەرپێچی نەبێت بۆ بنەما گشتییەکانی ئیسلام کە ئەهلی چاخە زێڕینەکانی ئیسلام[٤] لەسەری یەکڕابوون.

---

(١) وەکو زانستی : (علم الرجال) (علم المصطلح) (علم التخريج )...الخ کە بە زانستەکانی (مصطلح الحديث) دەناسرێن.

(٢) سەرچاوە بڕواپێکراوەکانی ئیسلام وەکو: (صەحیحی بوخاری و صەحیحی موسلیم و چوار سونەنەکە و موسنەدی ئیمام أحمد ...هتد) کە ئەم سەرچاوانە پاش قورئانی پیرۆز لای گشت زانایانی ئیسلام ـ بە بۆچوونە جیاوازەکانیانەوە ـ بەها گران و جێی ڕێزن؟

(٣) وەکو زانستەکانی دوو ئەصلەکە : (أصول الفقه) (أصول الدين).

(٤) قالَ رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَليه وسلم: « خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ، ثُمَّ يَجِيءُ أَقْوَامٌ تَسْبِقُ شَهَادَةُ أَحَدِهِمْ يَمِينَهُ ، وَيَمِينُهُ شَهَادَتَهُ » . متفقٌ عليه

شێخ الإسلام سەبارەت بەم پۆلێنە دەفەرمێت: (**إِنَّ الْعِلْمَ لَا بُدَّ فِيهِ مِنْ نَقْلٍ مُصَدَّقٍ وَنَظَرٍ مُحَقَّقٍ**)[١].

بۆیە هەر گوفتار و ڕەفتارێك بدرێتە پاڵ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) بەڵكو بدرێتە پاڵ هەر زانایەكی ئەم ئوممەتە پێویستە لەم دوو ڕوانگەیەوە تەماشایان بكەین و بەناو ئەم دوو فلتەرەدا تێپەڕێت:

١ ـ صەحیحە یان نا؟

٢ ـ چۆن دروست لێی تێبگەین؟

ئەمەش بۆ ئەوەی ڕێگری بكرێت لە كردنەوەی دەرگای داهێنراوەكان لە ئایندا و پارێزگاری بكرێت لە ڕەوشتی نابەجێ بەناوی ئاین، كە ئەمڕۆ ئوممەتی ئیسلام بەدەستیانەوە دەناڵێنێت.



(حب الوطن من الإيمان ـ خۆشەویستی وەتەن لە ئیمانەوەیە ـ) ئایا فەرمودەیە یان نا؟ و چۆن بە دروستی لە ماناكەی تێبگەین؟ لەم دوو ڕوانگەیەوە تەماشای دەكەین ـ إن شاء الله ـ وەكو وەڵامێكی تێر و تەسەل بۆ پرسیارەكە:

---

(١) مجموعة الفتاوى(١٢\٦٣) (١٣\٣٤٤) (١\٢٤٦) و الرد على البكري(٢\٧٢٩).

## ڕوانگەی یەکەم:

## ئایا (حب الوطن من الإيمان) فەرموودەی پێغەمبەرمانە (صلى الله عليه وسلم)؟

بێگومان نەخێر. فەرموودەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نییە و لە هیچ سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوی ئیسلامدا نەهاتووە، تەنانەت دەرکەوتنی ئەم وشەیە (حب الوطن من الإيمان) پاش تێپەڕبوونی زیاتر لە هەشت سەدە لە تەمەنی ئیسلام لە هەندێك کتێبی تایبەت بە فەرموودە داهێنراوەکان و وشە سەرزارەکیەکاندا هاتووە[١] بە بێ سەنەد[٢] و ئەو زانایانەی کە لە کتێبەکانیاندا هێناویانەتەوە گشتیان یان لە پاڵی دەنووسن: (**لم أقف عليه**)[٣] واتە: نەم بینیوە لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکاندا یان لە پاڵی دەنووسن: (موضوع)[٤] واتە : داهێنراوە و قسەی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) نییە.

---

(١) بۆ نمونە بڕوانە :

* (المقاصد الحسنة في بيان كثير من الأحاديث المشتهرة على الإلسنة. تأليف شمس الدين السخاوي المتوفى ٩٠٢ هـ) (رقم:٣٩٤)(١\٤٠٤ ط.دار الميمنة). وعنه حرفياً محمد بن طولون الصالحي المتوفى٩٥٣هـ في كتابه:(الشذرة في الأحاديث المشتهرة. (رقم:٣٤٣)(١\٢٤٦ ط. دار الكتب العلمية).

* (الأسرار المرفوعة من الأخبار الموضوعة تأليف ملا علي القاري المتوفى ١٠١٤ هـ)(رقم: ٤١٣)(ص١٠٩ ط. دار الكتب العلمية).

* (أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب. تأليف محمد بن درويش الحوت البيروتي المتوفى ١٢٠٩ هـ) ...

(٢) لە تایبەتمەندیەکانی ئەم ئومەتە هەبوونی سەنەدە کە دروستی ئەم سەنەدە مەرجی وەرگرتنی هەموو خەبەرێکە بە پێی ئەو یاسا و ڕێسایانەی لە کتێبەکانی (مصطلح الحديث) دا باسکراون. بڕوانە: (الإسناد من الدين ص١١ ـ ٩٢) تأليف عبد الفتاح أبو غدة

(٣) من قال لم أقف عليه : السخاوي في المقاصد الحسنة (١\٤٠٤) و قبله الزركشي (بواسطة: الأسرار المرفوعة للقاري ص١٠٩).

(٤) من حكم عليه بالوضع : الصغاني في الموضوعات (رقم:٨١) و البيروتي في أسنى المطالب (رقم: ٥٥٢).

پوختەی ئەم ڕوانگەیەش ئەوەیە کە بڵێین (حب الوطن من الإيمان) فەرمودە نییە، تەنانەت سەنەدێکی لاوازیشی نییە، تاوەکو بڵێین فەرمودەیەکی لاوازە(ضعيف)ە، بەڵکو داهێنراوە و بە ناحەق خەڵکێك بەنەزانینەوە دەداتە پاڵ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) و لە ڕوانگەی دووەمیشەوە زیاتر بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵبەستراو و داهێنراوە، چونکە ماناکەشی تەواو نییە:

**قال شيخ الإسلام ابن تيمية ( رحمه الله ):**

«وَالْعِلْمُ يَحْتَاجُ إلَى نَقْلٍ مُصَدَّقٍ وَنَظَرٍ مُحَقَّقٍ، وَالْمَنْقُولُ عَنْ السَّلَفِ وَالْعُلَمَاءِ يَحْتَاجُ إلَى مَعْرِفَةٍ بِثُبُوتِ لَفْظِهِ وَمَعْرِفَةِ دَلَالَتِهِ كَمَا يَحْتَاجُ إلَى ذَلِكَ الْمَنْقُولِ عَنْ اللَّهِ وَرَسُولِهِ»

مجموعة الفتاوى(١\٢٤٦)

## ڕوانگەی دووەم:

## ئایا مانای (حب الوطن من الإيمان) لە ڕووی شەرعەوە دروستە؟

بێگومان خۆشەویستی وەتەن شتێکی غەریزییە، وەکو خۆشەویستی مرۆڤ بۆ ماڵی دونیا ئەم جۆرە خۆشەویستیانەش ئەوکات حوکمی شەرعییان دێتە سەر کە مانا ئاینییەکە وەردەگرن بۆ نمونە: **هەندێك جار** خۆشەویستی وەتەن دەبێتە هۆکاری کوفر، کاتێك دەسەڵاتێکی ستەمکار ڕێگری لە موسڵماندەکات کە ئاینەکەی خۆی بەڕێوەببات، موسڵمانەکەش لە پێناو ئەوەی وەتەنەکەی بەجێ نەهێڵێت پشت لە ئاینەکەی دەکات! پەروەردگار لەباسی ئەمانەدا دەفەرمێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا ۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾﴾[1] ، **هەندێك جاریش** خۆشەویستی وەتەن دەبێتە هۆکاری ئیمان، وەکو هەمان نمونەی پێشو، بەڵام ئەم جارە موسڵمانەکە وەتەنەکەی بە جێدەهێڵێت و کۆچ دەکات، تاوەکو دینەکەی پارێزراوبێت. باشترین نمونەی ئەمەش کۆچکردنی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) و هەڤاڵانی(رضي الله عنهم) لە مەککەوە بۆ مەدینە سەرەڕای خۆشەویستییان بۆ مەککە کە وڵاتی خۆیان بوو. پەروەردگار لەباسی ئەمانەدا دەفەرمێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٧٤﴾﴾[2] .

کەواتە نمونەی خۆشەویستی وەتەن وەکو هەرخۆشەویستییەکی دیکەی غەریزییە، پێویستە لە ڕێگای خودا دا بێت، تاوەکو ماناکانی ئیمانداری وەربگرێت وەك ئەم دوو

---

(١) النساء : ٩٧.

(٢) الأنفال: ٧٤.

نمونەیەی باسکران. ئەوکەسەی لە بارە سەختەکانی ستەمی داگیرکەران و ڕێگرانی دینداری دەست بە وڵاتەکەی دەگرێت و بەجێناهێلێت و لە پێناویدا پشت لە دینەکەی دەکات، ئەم کەسە وەکو ئەو کەسە وایە کە دەست لە پارەکەی بەرنادات هەرچەندە زەکات لەسەری واجب بێت، هەردووکیان تاوانبارن، ئەمە لەکاتێکدا خۆشەویستی وەتەن و خۆشەویستی ماڵی دونیا شتێکی ڕاست و ڕەوانە، بەڵکو پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بۆ خۆشەویستی مرۆڤ بۆ وەتەنەکەی دەکات بە جۆرەها شێوە لەوانە[1] :

یەکەم: قورئانی پیرۆز نەخۆشی و ئازاری بە جێهێشتنی وەتەن یەکساندەکات بەنەخۆشی و ئازاری خۆکوژی: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾﴾[2].

دووەم: قورئانی پیرۆز نەخۆشی و ئازاری دەربەدەری لە وەتەن یەکساندەکات بە نەخۆشی و ئازاری کوشتنی کوڕ و منداڵ بەدەست دوژمنان: ﴿قَالُوا وَمَا لَنَا أَلَّا نُقَاتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَقَدْ أُخْرِجْنَا مِن دِيَارِنَا وَأَبْنَائِنَا﴾[3] .

سێیەم: قورئانی پیرۆز ئیقراری خۆشەویستی پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) دەکات بۆ مەککە: ﴿إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ۚ﴾[4] ابن عباس(رضي

---

(١) ينظر: رسالة الحنين إلى الأوطان للجاحظ (ص٢٤٥ ط. المهنا) و حاشية المحقق حسام حمدان على المقاصد الحسنة للسخاوي (١\٤٠٤ ـ ٤٠٧)

(٢) النساء: ٦٦.

(٣)البقرة: ٢٤٦.

(٤) القصص: ٨٥.

الله عنه) دەفەرمێت: مەبەست لە ﴿مَعَادٍ﴾ مەککە یە[١] . هەر لە بەر ئەمەش پاداشتی هیجرەتکردن لە پێناو پاراستنی ئاین، یان وەتەن بەجێهێلان لە پێناو بڵاوکردنی ئاین و فێربوونی ئاین پاداشتەکەی لای پەروەردگار زۆر گەورەیە: ﴿۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً ۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾﴾[٢] .

**لێرەشەوە پێویستە ئاگامان لە دوو خاڵ بێت کە کۆتایی ئەم وەڵامەن:**

یەکەمیان: ئەوانەی کە دەڵێن: مانای(حب الوطن من الإيمان) دروستە، چونکە پێغەمبەرمان(صلى الله عليه وسلم) مەککەی خۆش ویستووە! وەڵامەکە ئەوەیە کە (حب الوطن من الإيمان) ماناکەی دروستە، چونکە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) مەککەی بەجێهێشتووە لە پێناو جێگایەکی خۆشتر کە بەهەشتی پان و بەرینە، بۆیەش زۆر لە زانایان بۆ ئەوە دەچن کە(حب الوطن من الإيمان) مانا دروستەکەی ئەوەیە کە مەبەست لە وەتەن ئەو بەهەشتە بێت کە پەروەردگار بەڵێنی موسڵمانانی پێداوە وەکو پاداشتی پابەندبوونیان بە قورئان و فەرموودە[٣]، ئەگەر نا موسڵمان و کافر هاوبەشن لە غەریزەی خۆشەویستی وەتەن[٤]، بەڵکو ئەگەر سەیری ئەدەب و مێژووی ئوممەتە موشریکەکان بکەین دەبینین (حب الوطن من الإيمان) پشکی شێری

---

(١) ينظر: صحيح البخاري (٤٧٧٣).

(٢) النساء : ١٠٠.

(٣) ينظر: الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة للعلامة علي القاري ص١٠٩ ـ ١١٠.

(٤) ينظر: السلسلة الضعيفة(١\١١٠).

هەیە[١] بەڵام کام ئیمان؟! ئیمانێك نە لە ئاگر دووردەکاتەوە و نە لە بەهەشت نزیك دەکات: ﴿قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَـٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾[٢].

دووەم: ئێمەی کورد کە وڵاتێکی جوان و خۆشەویستمان هەیە (کوردستان) دەتوانین خۆشەویستی ئەم وڵاتە بکەینە ئیمان کاتێك ئەم خۆشەویستییە لە ڕێگای خودا دا بێت و لە پێناو خودادا لەم وڵاتەدا بژین بە فەرمانکردن بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە و لە پێناو ئەم خودایەدا ئەم وڵاتە خۆشەویستە بەجێبهێڵین، کاتێك بێدەسەڵات بین و ستەم باڵی بەسەردا بکێشێت و ڕێگری لە دینداری بکرێت، ـ سوپاس بۆ خودا تا ئەمرۆمانیش موسڵمانان ئازادی خۆیان هەیە لە بەجێگەیاندنی ئەرکە ئاینیەکانیان، ئەمە سەرەڕای هەموو کەم وکورتییەك کە شاراوە نییە لای هەموو کەس ـ . بەم شێوەیە مانای دروستی (حب الوطن من الإيمان) دەیچێژین کاتێك وەتەنی دونیا لە ڕێگای خودا دا بێت، تاوەکو بگەینە وەتەنی ڕاستەقینە لە دوا ڕۆژدا کە بەهەشتی پان و بەرینە، ئەمە مانای دروستی (حب الوطن من الإيمان)ە سەرەڕای ئەوەی کە فەرموودە نییە.

**قال ابن الزبير :**

**(لو قَنَعَ النَّاسُ بِأَرْزاقِهم قَناعَتَهُمْ بِأَوْطَانِهْم، مَا اشْتَكَى عَبدٌ الرِّزْق)**

(ئەگەر وەکو چۆن خەڵك بە وەتەنەکانیان ڕازین بە ڕزقەکەشیان ڕازیبان، ئەوا کەس گلەیی نەبوونی نەدەکرد)

الحنين إلى الأوطان للجاحظ (ص٢٤٤ الرسائل ) ونحوه في كتاب البلدان للجاحظ(ص٤٣٦ نشرة صالح العلي)

---

(١) ينظر: (قصة الحضارة ٢\١٩٩) وأسطورة حدائق بابل المعلقة و سرُ بنائها الذي يعود إلى حنين الأميرة الميديية (الكردية) زوجة نبوخد نصر لموطنها (كردستان) حيث الأنهار و الأشجار و الجبال الشاهقات.

(٢) البقرة: ٩٣ .

پرسیاری سێیەم:

زۆر جار دەبینین گەورە زانایانی تەفسیر لە تەفسیری وشەیەك یان ئایەتێکی قورئانی پیرۆز زیاتر لە مانایەك باس دەکەن بۆ نمونە تەفسیری ﴿ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ـ هەواڵە گەورەکە ـ هەیانە بۆ ئەوە دەچن کە مەبەست: قورئانە و هەیانە بۆ ئەوە دەچن کە مەبەست: قیامەتە[1] و لە تەفسیری ﴿قُرُوٓءٖ﴾ هەیانە بو ئەوە دەچن کە پاکژی ئافرەتە و هەیانە بۆ ئەوە دەچن کە سوڕی مانگانەیەتی[2] ئایا ئەم جیاوازییە لە لێکدانەوەدا دروستە یان دروست نییە و مەوقفی موسڵمان بەرامبەر بەم جۆرە جیاوازییانە چییە کاتی خوێندنەوەی تەفسیرەکان؟ و چ جۆرە ئیختیلافێکە کە لە زانستی تەفسیردا قەبوول نییە لای گشت کۆمەڵانی ئەهلی قیبلە؟

وەڵام:

لە تەفسیرە بڕواپێکراوەکانی ئەهلی ئیسلام دوو جۆرە ئیختیلاف دەبینرێن :

یەکەمیان: ئیختیلافی دژبەیەك (التضاد) ـ ئەمە بەڕاستی ئیختیلافە و پێویست دەکات تەنها یەکێك لە ماناکان ڕاست بێت ـ

دووەمیان: ئیختیلافی جۆراوجۆری (التنوع) ـ ئەمە **ئیختیلاف نییە** وەکو ناوەڕۆك ـ کەواتە لە تەفسیرەکاندا جۆراوجۆری و ئیختیلاف دەبینرێن تەنها ئیختیلاف لە خودی قورئاندا نییە، پەروەردگار دەفەرمێت: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ

(١) ينظر: تفسير الطبري (٥\٢٤ ـ ٧).

(٢) ينظر: الخلاف في ذلك في تفسير ابن كثير.

﴿لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخْتِلَـٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾﴾[١] واتە: (با بیر لەم قورئانە بکەنەوە و تەدەبور لە ئایەتەکانیدا بکەن، کە ئەگەر لە لای کەسێکی دیکەوە با بێجگە لە خودا، ئەوا دژیەکاتییەکی زۆری تیادا دەبینرا).

بەڵام ئەوەی پێویستە لێرەدا موسڵمان لێی بە ئاگا بێت ئەوەیە کە بینینی ئەم جۆراوجۆری و ئیختیلافە لە تەفسیرەکاندا ڕەحمەتێکی ڕێزگرتنی خودایە لە عەقلی خوێنەری قورئانی پیرۆز و موفەسیرەکانی نەك کەم و کورتییە لە ڕێزداری موفەسیرکان.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا بە پشت بەستن بە خودا ئەم ڕاستییە بە نمونەی تەطبیقي لە سەر چەند ئایەتێك نزیك دەکەینەوە و لە پاشان مرۆڤی موسڵمان لە جۆری سێیەمی تەفسیری ناحەزان و گومڕاوانی ئاگادار دەکەینەوە .

## یەکەم: دژیەکاتی لە تەفسیردا ـ التضاد ـ

وەکو باسکرا قورئانی پیرۆز دژیەکاتی (التضاد) تیادا نییە، کەواتە هەرکاتێك دژیەکاتی لە تەفسیری قورئاندا بینرا ئەمە پێویست دەکات یەکێك لە ماناذژبەیەکەکان هەڵە بێت، وەکو هەر مەسەلەیەکی ئیجتیهاد لە حەلال و حەرام بۆ نمونە: مانای ﴿قُرُوٓءٍ﴾ لە ئایەتی ﴿وَٱلْمُطَلَّقَـٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَـٰثَةَ قُرُوٓءٍ﴾[٢] بە بەمانای سوڕی مانگانەی ئافرەت تەفسیرکراوە و بەمانای کاتی پاکژی ئافرەتیش تەفسیرکراوە، بەڵام بابەتەکە

(١) النساء : ٨٢

(٢) البقرة: ٢٢٨.

جێی ئیجتهاده[١] چونکە دەقە پیرۆزەکە هەردوو مانایەکە هەڵدەگرێت، کە یەکێکیان ڕاستە[٢].

لەم جۆرە بابەتانە ئەگەر خوێنەرەکە توانای بەدواداچوونی بەڵگەکانی هەبێت بۆی هەیە کام لای نزیکتری بەڵگەیە هەڵبژێرێت ئەوەی دیکە بە هەڵە بزانێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە خوێنەرەکە موجتەهیدە، چونکە چینی ڕۆشنبیری موسڵمانان ڕاستە موجتەهید نین، بەڵام لاساییکەرەوەش نین[٣]، بێجگە لە بیستنی فەتوا خوازیاری بیستنی بەڵگەن لە قورئان و فەرموودەدا، ئەگەر ئەم برا ڕۆشنبیرە موسڵمانە توانا و هیمەتی ئەمەی نەبێت، دەتوانێت وەکو هەرکەسێکی لاسایی کەرەوە پرسیار لە شارەزایەکی تەقوادار بکات ئایا کام تەفسیر دروستە بۆ وشەی ﴿قُرُوٓءٍ﴾ لە ئایەتەکەی ﴿وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖۚ﴾ و ئەمەش لە ماناکانی فەرمانکردنی قورئانی پیرۆزە بە پرسیارکردن لە شارەزایان: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾[٤] (لەوەی

---

(١) ثبت في الصحيح : «إِذَا حَكَمَ الْحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَصَابَ فَلَهُ أَجْرَانِ ، وَإِذَا حَكَمَ فَاجْتَهَدَ ثُمَّ أَخْطَأَ فَلَهُ أَجْرٌ » أخرجه البخاري( ٧٤٣٨).

(٢) حول مسألة (هل كل مجتهد مصيب) ينظر: البحر المحيط لزركشي(٦\٢٣٦ ـ ٢٤١ ط.الكويت) تقويم أصول الفقه لدبوسي(٣\٤٣٧ ط. مكتبة الرشد) و فتح الولي الناصر بشرح روضة الناظر تأليف: أ.د علي بن سعد الضويحي (٦\٢٨٧ ط. دار ابن الجوزي) و المعتمد في أصول الفقه لأبي الحسن البصري المعتزلي(٢\٩٤٨ ـ ٩٨٢ ط. المعهد الفرنسي).

(٣) قال ابن القيم رحمه الله (أعلام الموقعين ٥\٥٥٨ ط. مشهور حسن): (أَنَّ الِاتِّبَاعَ لَا يَسْتَلْزِمُ الِاجْتِهَادَ لِوُجُوهٍ...) ثم ذكرها.

(٤) النحل: ٤٣ ، الأنبياء: ٧ .

کە نایزانن پرسیاری شارەزایانی بکەن) کە گشت بابەتەکانی تەفسیر و حەلال و حەرام و سونەت و بیدعە و تەنانەت بیرو باوەڕیش دەگرێتەوە[(١)] .

ئەم جۆرە ئیختیلافەش (کە ﴿قُرُوٓءٍ﴾ وەکو نمونەباسکرا) لای پێشینانی ئەم ئوممەتە کەم بووە، بە کەمیش لە تەفسیرەکاندا دەبینرێت[(٢)] ، ئەوەی بە زۆری و بەڕوونی لە کتێبەکانی تەفسیردا دەبینرێت جۆراوجۆری تەفسیرە.

---

(١) حول مسالة التمذهب و التقليد و أن العامي ليس له مذهب ينظر: المستدرك على مجموعة الفتاوى لشيخ الإسلام (٢\٢٥٠ ـ ٢٥٣) و الفتاوى الكبرى له (٤\٥٣٦ ط. دار المعرفة) و معالم المذهب الحنبلي للغامدي (ص٧٨ ـ ٨٠ ، ٩٠ ـ ٩٦ ط. الأوراق الثقافية) . وقال ابن القيم في أعلام الموقعين(٤\٢٠١ ـ ٢٠٢): (وَهَلْ يَلْزَمُ الْعَامِّيَّ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِبَعْضِ الْمَذَاهِبِ الْمَعْرُوفَةِ أَمْ لَا؟ فِيهِ مَذْهَبَانِ: (هَلْ عَلَى الْعَامِّيِّ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِمَذْهَبٍ وَاحِدٍ مِنْ الْأَرْبَعَةِ أَوْ غَيْرِهِمْ؟) أَحَدُهُمَا: لَا يَلْزَمُهُ، وَهُوَ الصَّوَابُ الْمَقْطُوعُ بِهِ" إذْ لَا وَاجِبَ إلَّا مَا أَوْجَبَهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، وَلَمْ يُوجِبْ اللَّهُ وَلَا رَسُولُهُ عَلَى أَحَدٍ مِنْ النَّاسِ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِمَذْهَبِ رَجُلٍ مِنْ الْأُمَّةِ فَيُقَلِّدَهُ دِينَهُ دُونَ غَيْرِهِ، وَقَدْ انْطَوَتْ الْقُرُونُ الْفَاضِلَةُ مُبَرَّأَةً مُبَرَّأً أَهْلُهَا مِنْ هَذِهِ النِّسْبَةِ، بَلْ لَا يَصِحُّ لِلْعَامِّيِّ مَذْهَبٌ وَلَوْ تَمَذْهَبَ بِهِ فَالْعَامِّيُّ لَا مَذْهَبَ لَهُ لِأَنَّ الْمَذْهَبَ إنَّمَا يَكُونُ لِمَنْ لَهُ نَوْعُ نَظَرٍ وَاسْتِدْلَالٍ، وَيَكُونُ بَصِيرًا بِالْمَذَاهِبِ عَلَى حَسْبِهِ، أَوْ لِمَنْ قَرَأَ كِتَابًا فِي فُرُوعِ ذَلِكَ الْمَذْهَبِ وَعَرَفَ فَتَاوَى إمَامِهِ وَأَقْوَالَهُ، وَأَمَّا مَنْ لَمْ يَتَأَهَّلْ لِذَلِكَ أَلْبَتَّةَ بَلْ قَالَ: أَنَا شَافِعِيٌّ، أَوْ حَنْبَلِيٌّ، أَوْ غَيْرُ ذَلِكَ لَمْ يَصِرْ كَذَلِكَ بِمُجَرَّدِ الْقَوْلِ، كَمَا لَوْ قَالَ: أَنَا فَقِيهٌ، أَوْ نَحْوِيٌّ، أَوْ كَاتِبٌ، لَمْ يَصِرْ كَذَلِكَ بِمُجَرَّدِ قَوْلِهِ. يُوَضِّحُهُ أَنَّ الْقَائِلَ إنَّهُ شَافِعِيٌّ أَوْ مَالِكِيٌّ أَوْ حَنَفِيٌّ يَزْعُمُ أَنَّهُ مُتَّبِعٌ لِذَلِكَ الْإِمَامِ، سَالِكٌ طَرِيقَهُ، وَهَذَا إنَّمَا يَصِحُّ لَهُ إذَا سَلَكَ سَبِيلَهُ فِي الْعِلْمِ وَالْمَعْرِفَةِ وَالِاسْتِدْلَالِ، فَأَمَّا مَعَ جَهْلِهِ وَبُعْدِهِ جِدًّا عَنْ سِيرَةِ الْإِمَامِ وَعِلْمِهِ وَطَرِيقِهِ فَكَيْفَ يَصِحُّ لَهُ الِانْتِسَابُ إلَيْهِ إلَّا بِالدَّعْوَى الْمُجَرَّدَةِ وَالْقَوْلِ الْفَارِغِ مِنْ كُلِّ مَعْنًى؟ وَالْعَامِّيُّ لَا يُتَصَوَّرُ أَنْ يَصِحَّ لَهُ مَذْهَبٌ، وَلَوْ تَصَوَّرَ ذَلِكَ لَمْ يَلْزَمْهُ وَلَا لِغَيْرِهِ، وَلَا يَلْزَمُ أَحَدًا قَطُّ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِمَذْهَبِ رَجُلٍ مِنْ الْأُمَّةِ بِحَيْثُ يَأْخُذُ أَقْوَالَهُ كُلَّهَا وَيَدْعُ أَقْوَالَ غَيْرِهِ. وَهَذِهِ بِدْعَةٌ قَبِيحَةٌ حَدَثَتْ فِي الْأُمَّةِ، لَمْ يَقُلْ بِهَا أَحَدٌ مِنْ أَئِمَّةِ الْإِسْلَامِ، وَهُمْ أَعْلَى رُتْبَةً وَأَجَلُّ قَدْرًا وَأَعْلَمُ بِاَللَّهِ وَرَسُولِهِ مِنْ أَنْ يُلْزِمُوا النَّاسَ بِذَلِكَ، وَأَبْعَدُ مِنْهُ قَوْلُ مَنْ قَالَ: يَلْزَمُهُ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِمَذْهَبِ عَالِمٍ مِنْ الْعُلَمَاءِ، وَأَبْعَدُ مِنْهُ قَوْلُ مَنْ قَالَ: يَلْزَمُهُ أَنْ يَتَمَذْهَبَ بِأَحَدِ الْمَذَاهِبِ الْأَرْبَعَةِ ...) أ هـ.

وقال الهروي (مذهب أصحابنا أن العامي لا مذهب له) (حاشية إعانة الطالبين للسيد لبكري ٤\٢١٧ ط.مصطفى البابي الحلبي ١٩٣٨). و بڕوانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە (١) لاپەڕە(٩١ ـ ١٠١).

(٢) في **مسألة إختلاف التضاد يقول شيخ الإسلام** (مجموعة الفتاوى٥\١٦٢): (وَأَمَّا مَا صَحَّ عَنْ السَّلَفِ أَنَّهُمْ: اخْتَلَفُوا فِيهِ " اخْتِلَافَ تَنَاقُضٍ " فَهَذَا قَلِيلٌ بِالنِّسْبَةِ إلَى مَا لَمْ يَخْتَلِفُوا فِيهِ كَمَا أَنَّ تَنَازُعَهُمْ فِي بَعْضِ مَسَائِلِ

## دووەم : جۆراو جۆری لە تەفسیر (التنوع)

ئەم جۆراوجۆریەش وەکو باسکرا ئیختیلاف نییە لە ناوەڕۆکدا، بەڵکو لە خودی دەقە پیرۆزەکانیشدا هەیە کە زۆر جار دەبینین هەمان بەسەرهات بە جۆرەها شێوە باس کراوە کە لە هەر سورەتێکدا بە پێی مەبەستەکانی مانا دەبەخشێت، بۆیەش لە تەفسیری قورئانیشدا جۆراوجۆری هەیە و شتێکی ڕەوایە ئەم جۆراوجۆریەش لە تەفسیردا نیشانەی فراوانی ماناکانی دەقە پیرۆزەکانە کە هیچ مانایەك لەم مانایانە هەڵە نییە و دژیش نییە بۆ ماناکەی دیکە[1]، وەك نمونەی پرسیارەکە: ﴿عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ۝١ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ ۝٢ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ مُخۡتَلِفُونَ ۝٣﴾[2] (ئەوانە باسی چی دەکەن؟ * باسی **هەواڵە**

---

السُّنَّة - كَبَعْضِ مَسَائِلِ الصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَالصِّيَامِ وَالْحَجِّ وَالْفَرَائِضِ وَالطَّلَاقِ وَنَحْوِ ذَلِكَ - لَا يَمْنَعُ أَنْ يَكُونَ أَصْلُ هَذِهِ السُّنَنِ مَأْخُوذًا عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَجُمَلُهَا مَنْقُولَةٌ عَنْهُ بِالتَّوَاتُرِ).

(١) في مسألة **تفسير التنوع يقول شيخ الإسلام** (مجموعة الفاوى ١٣\٣٨١ـ ٣٨٢): ( يَنْبَغِي أَنْ يُعْلَمَ أَنَّ الِاخْتِلَافَ الْوَاقِعَ مِنْ الْمُفَسِّرِينَ وَغَيْرِهِمْ عَلَى وَجْهَيْنِ: " أَحَدُهُمَا " لَيْسَ فِيهِ تَضَادٌّ وَتَنَاقُضٌ" بَلْ يُمْكِنُ أَنْ يَكُونَ كُلٌّ مِنْهُمَا حَقًّا وَإِنَّمَا هُوَ اخْتِلَافُ تَنَوُّعٍ أَوْ اخْتِلَافٌ فِي الصِّفَاتِ أَوْ الْعِبَارَاتِ وَعَامَّةُ الِاخْتِلَافِ الثَّابِتِ عَنْ مُفَسِّرِي السَّلَفِ مِنْ الصَّحَابَةِ وَالتَّابِعِينَ هُوَ مِنْ هَذَا الْبَابِ فَإِنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ إذَا ذَكَرَ فِي الْقُرْآنِ اسْمًا مِثْلَ قَوْلِهِ: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ فَكُلٌّ مِنْ الْمُفَسِّرِينَ يُعَبِّرُ عَنْ الصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ بِعِبَارَةِ يَدُلُّ بِهَا عَلَى بَعْضِ صِفَاتِهِ وَكُلُّ ذَلِكَ حَقٌّ بِمَنْزِلَةِ مَا يُسَمَّى اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَكِتَابُهُ بِأَسْمَاءِ كُلُّ اسْمٍ مِنْهَا يَدُلُّ عَلَى صِفَةٍ مِنْ صِفَاتِهِ فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ: ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ كِتَابُ اللَّهِ أَوْ اتِّبَاعُ كِتَابِ اللَّهِ وَيَقُولُ الْآخَرُ: ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ هُوَ الْإِسْلَامُ أَوْ دِينُ الْإِسْلَامِ وَيَقُولُ الْآخَرُ: ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ هُوَ السُّنَّةُ وَالْجَمَاعَةُ وَيَقُولُ الْآخَرُ: ﴿الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ طَرِيقُ الْعُبُودِيَّةِ أَوْ طَرِيقُ الْخَوْفِ وَالرَّجَاءِ وَالْحُبِّ وَامْتِثَالِ الْمَأْمُورِ وَاجْتِنَابِ الْمَحْظُورِ أَوْ مُتَابَعَةُ الْكِتَابِ وَالسُّنَّةِ أَوْ الْعَمَلُ بِطَاعَةِ اللَّهِ أَوْ نَحْوُ هَذِهِ الْأَسْمَاءِ وَالْعِبَارَاتِ. وَمَعْلُومٌ أَنَّ الْمُسَمَّى هُوَ وَاحِدٌ وَإِنْ تَنَوَّعَتْ صِفَاتُهُ وَتَعَدَّدَتْ أَسْمَاؤُهُ وَعِبَارَاتُهُ كَمَا إذَا قِيلَ: مُحَمَّدٌ هُوَ أَحْمَد وَهُوَ الْحَاشِرُ وَهُوَ الْمَاحِي وَهُوَ الْعَاقِبُ وَهُوَ خَاتَمُ الْمُرْسَلِينَ وَهُوَ نَبِيُّ الرَّحْمَةِ وَهُوَ نَبِيُّ الْمَلْحَمَةِ. وَكَذَلِكَ إذَا قِيلَ: الْقُرْآنُ هُوَ الْفُرْقَانُ وَالنُّورُ وَالشِّفَاءُ وَالذِّكْرُ الْحَكِيمُ وَالْكِتَابُ الَّذِي أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ...).

(٢) النبأ:١ـ ٣.

**گەورەکە دەکەن** * کە ڕاو بۆچوونیان جیاوازە دەربارەی هەیانە ئیمانیان پێ هەیە هەشیانە کوفری پێدەکەن) ئەگەر بڵێین: هەواڵە گەورەکە قورئانە یان قیامەتە یان هاتنی ئیسلامە ... هتد، ئەم جۆراوجۆرییە لە مانادا گشتیان دروستن، بەڵام ئایا کامیان دروستترە ئەمە بۆ خودی خوێنەری قورئان دەگەڕێتەوە کە زۆر لەسەر ئایەتەکان بوەستێت و تەدەبوری سورەتەکە بکات زیاتر لە تەفسیرێك بخوێنێتەوە، ئەوکات لە مانا ڕاسترینەکە نزیکدەبێتەوە. بۆیەش لە سەر هەمان نمونەی پرسیارەکە کاتێك تەدەبوری سورەتی (النبأ) دەکەین بۆمان دەردەکەوێت کە ڕاستتر ئەوەیە بڵێین مەبەست لە (هەواڵە گەورەکە) ڕۆژی قیامەتە، ئەم ڕاستییەش بەبیرکردنەوە لەم خشتەیە بۆمان نزیك دەبێتەوە کە بابەتی سورەتەکە پیشانمان دەدات، کە سەلماندنی هەبوونی قیامەتە بە بەڵگەی عەقلی، با لە سەر خشتەکە بوەستین:

| دیمەنەکانی دونیا (شەهادە) | دیمەنەکانی قیامەت (غەیب) | وتاری عەقلی و بەرهەمی تەدەبور |
|---|---|---|
| ﴿وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ٧﴾ | ﴿وَسُيِّرَتِ ٱلۡجِبَالُ فَكَانَتۡ سَرَابًا ٢٠﴾ | ئەگەر بڕوات هەبێت خودایەك ئەم چیا زەبەلاحانەی چەقاندووە، ئەوا پێویست دەکات کە بڕوا بهێنی هەر ئەم خودایە ئەم چیایانە هەڵیاندەکەنێت و دەیانکاتە سەراب لە ڕۆژی قیامەتدا. |
| ﴿وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلۡمُعۡصِرَٰتِ مَآءٗ ثَجَّاجٗا ١٤﴾ | ﴿وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ أَبۡوَٰبٗا ١٩﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە کە خودا لەم هەورانە ئاوکۆدەکاتەوە و دەیبارێنێت، ئەوا پێویست دەکات بڕوا بهێنی کە هەر ئەو خودایە دەرگاکانی ئاسمان دەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. |
| ﴿لِّنُخۡرِجَ بِهِۦ حَبّٗا وَنَبَاتٗا ١٥﴾ | ﴿يَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَتَأۡتُونَ أَفۡوَاجٗا ١٨﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە کە خودا زەوی زیندوو دەکاتەوە و جۆرەها دانەوێلە و ڕووەك لەم زەوییە دەردەهێنێت، ئەوا پێویست دەکات بڕوا بهێنی کە هەر ئەم خودایە مردوو لە گۆڕەکانیان دەردەهێنێت و زیندوویاندەکاتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا. |
| ﴿وَخَلَقۡنَٰكُمۡ أَزۡوَٰجٗا ٨﴾ | ﴿وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ٣٣﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە ئەو خودایەی مرۆڤی بە ژن و مێردایەتی خەلقکردووە و زۆریان دەکات، ئەوا پێویست دەکات بڕوا بهێنی بە هەبوونی پاداشت لەم جۆرە بۆ بڕواداران لە ڕۆژی قیامەتدا. |
| ﴿وَجَنَّٰتٍ أَلۡفَافًا ١٦﴾ | ﴿حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ٣٢﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە کە ئەم باخە چڕ و پڕ و لەیەك ئاڵاوانەی دونیا دروستکراوی خودان، ئەوا پێویست دەکات بڕوا بهێنی بە هەبوونی بەهەشتێکی پڕ لە باغاتی کەسك وچڕ لە قیامەتدا. |
| ﴿وَجَعَلۡنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشٗا ١١﴾ | ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ٣٩﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە ڕۆژگاری ئەمڕۆی ژیانت زەرفێکی کاتە خودا بە تۆی بەخشیوە بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانت و هەڵبژاردنی چاکەکاری و تێدەپەڕێت ناگەڕێتەوە، ئەوا پێویست دەکات بڕوات هەبێت بە ڕۆژگارێکی حەق کە حسابی ئەم ڕۆژگارەی تیادایە لە قیامەتدا. |
| ﴿وَجَعَلۡنَا نَوۡمَكُمۡ سُبَاتٗا ٩﴾ | ﴿يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ٤٠﴾ | ئەگەر بڕوات هەیە کە خودا خەوی کردووتە حەسانەوە و دابڕان لە دونیا (خەویش جۆرێکە لە مردن) لە پاشان بە خەبەرت دێنێتەوە، ئەوا پێویست دەکات کە بڕوات بە هەستانەوە هەبێت پاش مردن و دابڕانی ڕاستەقینە لە دونیا و ئامادەباشیت بۆ ئەم هەستانەوەیە کردبێت نەك وەکو کافرەکان تەمەنای مردن بکەی لە قیامەتدا. |

کاتێك بە پێی خشتەی سەرەوە بیر لە دیمەنەکانی دونیا دەکەین کە وەکو بەڵگەی عەقلی باسکراون لەسەر هەبوونی قیامەت و دیمەنەکانی، بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەست لە ﴿ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ (هەواڵە گەورەکە) لە سورەتەکەدا قیامەتە، کە خەڵکان لەسەری جیاوازن. ئەمە بێجگە لە دیمەنەکانی سزاو پاداشت لە قیامەتدا کە بەشێکی دیکەی بابەتی سورەتەکەیە وەك لەم خشتەیەدا:

<table>
<tr><th>پاداشتی تەقوادار</th><th>سزای تاوانکار</th></tr>
<tr><td>﴿إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ﴿٣٣﴾ وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا كِذَّٰبٗا ﴿٣٥﴾ جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابٗا ﴿٣٦﴾﴾...</td><td>﴿إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتۡ مِرۡصَادٗا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابٗا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحۡقَابٗا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرۡدٗا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمٗا وَغَسَّاقٗا ﴿٢٥﴾ جَزَآءٗ وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ لَا يَرۡجُونَ حِسَابٗا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابٗا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ كِتَٰبٗا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمۡ إِلَّا عَذَابًا﴾</td></tr>
<tr><th colspan="2">دیمەنەکانی بەرەبەرەی کاتی حیساب</th></tr>
<tr><td colspan="2">﴿رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا ٱلرَّحۡمَٰنِۖ لَا يَمۡلِكُونَ مِنۡهُ خِطَابٗا ﴿٣٧﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ صَفّٗاۖ لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَقَالَ صَوَابٗا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴿٤٠﴾﴾</td></tr>
</table>

ئەم دیمەنانەی قیامەتیش لە سورەتەکەدا هەمان ڕاستی دووپاتدەکەنەوە کە مەبەست لە﴿ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ ڕۆژی قیامەتە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بڵێین تەفسیری ﴿ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ بە (قورئان) یان بە (ئیسلام) ... هتد دروست نییە چونکە مەبەست لە پەیامی قورئان و ئیسلامیش ئاگادارکردنەوەی مرۆڤایەتییە لە هەبوونی قیامەت، ئەمەش

وەکو نمونەی تەفسیری ﴿قُرُوٓءٍ﴾ نییە کە نابێت لە هەمان کاتدا مانای سۆڕی مانگانە و پاکژی ببەخشێت.

ئەم جۆراوجۆرییەی تەفسیری ﴿ٱلنَّبَإِ ٱلۡعَظِيمِ﴾ گشت ماناکانی تەواوکەری یەکترن و دەقە پیرۆزەکەش هەڵیاندەگرێت، ئەوەی باسکرا تەنها نمونەیەکی تەتبیقییە بۆ جیاوازی کردن لە نێوان جۆراوجۆری تەفسیر و دژیەکاتی(التضاد) تەفسیر کە ڕێنیشاندەرە بۆ دەرگاکانی تەدەبور و بیرکردنەوە لە دەقە پیرۆزەکان و زیاتر تێگەشتنیان و دۆزینەوەی مەبەستەکانیان، کە ئەمە بنەمای ئیمانە هەروەك ئیمامی شافعی (رضي الله عنه) دەفەرمێت: (آمَنْت بِاَللَّهِ وَبِمَا جَاءَ عَنْ اللَّهِ عَلَى مُرَادِ اللَّهِ وَآمَنْت بِرَسُولِ اللَّهِ وَمَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ عَلَى مُرَادِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[1] واتە: (ئیمانم بە خودایە و بەوەی لە لای خوداوە هاتووە، وەکو چۆن خودا مەبەستیەتی و ئیمانم بە پێغەمبەرە و ئەوەی لەلای پێغەمبەرەوە هاتووە، وەکو چۆن پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) مەبەستیەتی) ئەم وتە زێڕینە کاکل و مەبەستی ئەم وەڵامەیە و دڕکی چاوی بیدعەچییەکانە، کە بە هەواو هەوەسی خۆیان دەقە پیرۆزەکان خواردەکەنەوە بۆ مەبەستەکانیان بێئەوەی دەقە پیرۆزەکە مانای مەبەستیان هەڵبگرێت، یان بنەما گشتیەکانی ئیسلام مەبەستە گڵاوەکەیان قەبوول بکات، یان کەسێك هەبێت لە زانایانی چاخە زێڕینەکان دەقەکەی بەو مەبەستانە لێکدابێتەوە، ئەمەش گومڕاویە بە ناوی تەفسیرکردن:

---

(١) مجموعة الفتاوى: (٦\٣٥٤) وينظر مجموعة الفتاوى أيضاً وبيان هذا المعنى:(٧\١١٦).

## سێیەم: گومڕاوی بە ناوی تەفسیر!!

با لەسەر چەند نمونەیەکی ئەم بیدعەچی و هەڵگەڕاوانە بوەستین و ئەو بە ناو تەفسیرانە بیخەینە بەرچاو کە بە یەکڕایی گشت کۆمەڵانی ئەهلی قیبلە قەبوول نین و بەتاڵن بە چەند نمونەیەك:

نمونەی یەکەم: (د.محمد شەحرور)[١] خاوەنی کیتابی (الکتاب و القرآن) [٢] .

شەحرور بە مەزەندەی خۆی پشت بە زمانی عەرەبی دەبەستێت بۆ لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز، ئەمە لە کاتێکدا زۆر نەزانە و جاهیلە بەم زمانە[٣] با لە سەر نمونەیەکی تورەهاتەکانی ئەم گومڕاو و گومڕاوکەرە بوەستین :

(١) (محمد بن دیب شحرور) ـ بە ناو موسڵمان ـ لە دایك بووی ساڵی( ١٩٣٨ز )ەلەدیمشق . لەساڵانی (١٩٥٨ ـ ١٩٦٤ز) لە یەکێتی سۆڤیەتی ئەندازیاری خوێندووە و ماستەر و دکتورای لە دبلن وەرگرتووە. ينظر: (نظرات شرعیة في فکر منحرف) المجموعة الثانیة (٣\١٩١ ـ ٢١٩) جمع: سلیمان ین صالح الخراشي .

و للمزید حول کفریات هذا الضال المنفوخ فیه إعلامیاً. ينظر: (بؤس التفلیق ـ نقد الأسس التي قام علیها طرح محمد شحرور ـ ط. مرکز الدلائل) تألیف یوسف سمرین. ومن تلك الکفریات بصدد الإیمان بالله و رسوله (صلی الله علیه وسلم) یذهب شحرور إلی أنه :

* یجب علی المسلم أن یکون عنده ذرة شك في وجود الله! و الملحد عنده ذرة شك في الإلحاد!!!(بؤس التفلیق ص٤٣). و في التنزیل: ﴿أَفِي ٱللَّهِ شَكٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ﴾ (ابراهیم: ١٠)

* الرسول (صلی الله علیه وسلم) لم یفسر القرآن! بل فسرها چارلس داروین صاحب أصل الأنواع!!! (بؤس التفلیق ص٢٥ ـ ٢٨) و في التنزیل: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ﴾(نحل:٤٤)

(٢) زانایان بۆ ئەوە دەچن کە جەمعییەتێکی جولەکەی نەمساوی کیتابەکەی (الکتاب و القرآن) نووسیویانە پاش گەڕان وسۆڕان شەحروریان دۆزییەوە کە بە ناوی خۆی بڵاو بکاتەوە... بڕوانە: بەڵگەکانی ئەم بۆچوونە و شاهێدی دانێکی دکتور محمد رمضان البوطي لە سەری لە: (نظرات شرعیة ٣\١٩٥) و (التحریف المعاصر في الدین تألیف عبد الرحمن حسن حبنکة ص٢٢ هامش ).

(٣) ينظر: بیضة الدیك (نقد لغوي لکتاب : الکتاب و القرآن) تألیف: یوسف الصیداوي.

لەکیتابەکەی (ص٦٠٦ ـ ٦٠٧) شەحرور تەفسیری یەکێك لە ئایەتەکانی حیجاب[١] دەکات و دەڵێت: **(فإذا كانت الزينة مكانية ـ المراد جسد المرأة ـ فجسد المرأة كله زينةٌ وهذا الجسد يقسم إلى قسمين :**

**قسم ظاهر:** ﴿وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾[٢] **أي ما أظهره الله سبحانه وتعالى في خلقها كالرأس و البطن و الظهر و الرجلين و اليدين.**

**قسم غير ظاهر بالخَلق: أي أخفاه الله في بنية المرأة و تصميمها، وهذا القسم المخفي هو الجيوب...و هو ما بين الثديين و تحت الثديين و تحت الإبطين و و الفرج و الإليتين هذه كلها جيوب يجب على المرأة المؤمنة أن تغطيها.** و استدل بقوله ﴿وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ﴾[٣]).

پوختەی ماناکەی:

(جەستەی ئافرەت دوو بەشە:

❋ بەشێکی دیارە{= ﴿مَا ظَهَرَ مِنْهَا﴾} وەکو سەر و زك و پشت و دوو دەستەکە و دوو قاچەکە ...

❋ بەشێکی شاراوە{= ﴿جُيُوبِهِن﴾} وەکو ژێرەوەی دوو مەمکەکەی و نێوان دوو مەمکەکانی و دوو بن باڵەکەی و دوو عەورەتەکەی ...

بە مەزندەی شەحرور حیجاب تایبەتە تەنها بە بەشی دووەم!!!)

---

(١) ئایەتەکانی: (الأحزاب: ٥٩) (الأحزاب: ٥٣) (النور: ٣١) بە ئایەتەکانی حیجاب ناسراون. بڕوانە: گۆڤاری ئەیووبی ژمارە(٣) لاپەڕە(٦٠ ـ ٦١).

(٢) النور: ٣١.

(٣) النور: ٣١.

بابیر لەم حیجابە ڕووت و قوتە نەکەینەوە کە لای ئەم گومڕاوە دینداری و شارستانییەتە و سەرەڕای ئەمەش دەداتە پاڵ قورئانی پیرۆز و ئایەتەکانی!!

ئەمەش پێویستی بە وەڵام نییە[1] چونکە لای هەموو موسڵمانێك ئاشکرایە کە ڕووت و قوتی مەبەستی شەیتان بووە، کە بابە ئادەمی خزاند بۆ خواردنی دارەکە و یەکەم سزای تاوان بوو کە بابە ئادەم و دایە حەوا پێی سزادران، ئەمە لە سەرەتای کاروانی ئیسلام و ئینسانییەت:

* ﴿فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾﴾[2]

* ﴿فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ﴾[3]

* ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِي سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾﴾ [4] .

---

(١) و من شاء البسط في الرد فالينظر: (الرد على د. شحرور في مسالة لباس المرأة ص٢٢ ـ ٢٧ ط. دار العلم ـ دمشق) تأليف: محمد هيثم إسلامبولي.

(٢) الأعراف: ٢٠ .

(٣) الأعراف: ٢٢ .

(٤) الأعراف: ٢٦ ـ ٢٧.

هەروەها لای هەموو موسڵمانێك ئاشكرایە كە حیجابی ئافرەتی موسڵمان ـ كە داپۆشینی لاشەكەیەتی بێجگە لە دەم و چاو و هەردوو دەست[١] ـ دروشمی موسڵمانیەتی ئافرەتەكەیە بەدرێژایی زیاتر لە چواردە سەدە بەبێ خیلاف لە نێوان زانایانی ئوممەت[٢] .

ئەمڕۆ چۆن دەبێت نەناسراوێكی وەكو شەحرور بڵێت وانییە! و بە درێژایی هەزار و چوارسەد ساڵ ئوممەت لە سەر هەڵە بووە! بە بەڵگەی تێگەیشتنی خۆی لە قورئان! ئەمە لە كاتێكدا عەرەبی نازانێت[٣]! ئەمە نمونەی دژایەتی كردنی قورئانە بە تەفسیرێكی بەناو سەردەمیانە، كە ڕاگەیاندنە چەواشەكارەكان بە گەورە دەینرخێنن وەكو دژایەتییەكی ناڕاستەوخۆ بۆ ئیسلام و موسڵمانان، ئەم دژایەتییەش لەمێژووی ئیسلامدا هەر هەبووە وەك لە نمونەی دووەمدا دەبینین:

---

(١) چونكە لە واجب بوونی نیقاب (داپۆشینی دەم و چاو) و دوو دەستەكە خیلاف هەیە لە كاتی نەبوونی فیتنە، بەڵام كاتێك فیتنە هەبێت نیقاب و داپۆشینی دوو دەستەكە بە یەكڕایی زانایان واجبە. ینظر: الحجاب في الشرع و الفطرة بين الدليل و القول الدخيل ص٥١ ـ ٥٤ ط. المنهاج . تأليف عبد العزيز الطريفي .

(٢) نقل الإجماع على ذلك ابن حزم في مراتب الإجماع ص٢٩٠ و أقره شيخ الإسلام ينظر: الحجاب شريعة الله في الإسلام و اليهودية و النصرانية ص٢١ تأليف:د.سامي عامري ط.التكوين.

(٣) ينظر: بيضة الديك ص١٢٢ و عُجمة الشحرور في كتابه (الكتاب و القرآن)! لاسيما في كلمة الإهداء! هذا وسنده العلمي في كتابه الإعتماد على اللغة! و في المثال المذكور من تحريفاته لتفسير القرآن حول آية الحجاب: زعم أن أصل كلمة ﴿جُيُوبِهِنَّ﴾ مأخوذ من الجذر(**جوب**)، في حين الصواب أنها من الجذر(**جيب**) كما في معاجم اللغة مثل لسان العرب لإبن منظور (١\٧٣٦).

نمونەی دووەم: (ابن عەرەبی)[١] خاوەنی کیتابی (الفتوحات المکیة).

ابن عەرەبی لە لێکدانەوەیدا بۆ ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ لە کتێبەکەیدا (الفتوحات المکیة) بۆ ئەوە دەچێت کە گەیشتن بە تێگەیشتنی ئەم ئایەتە بریتییە لە ئاوێتەبوونی بەهەشت و جەهەنەم و تەنها **مانەوەی** بەهەشت و پاداشت و رضواني دەرگەوان و **نەمانی** جەهەنەم و سزا و مالکی دەرگەوان و ئادەم و ئیبلیس دەبن بە یەکسان و یەکسانیش دەبن چاکەکار و خراپەکاری ئینسان[٢]!

ئەم جۆرە تەفسیرە بۆ قورئانی پیرۆز ـ کاتێك کەسێك دەیکات و خۆی بە موسڵمان دەزانێت ـ کوفرێکە وەڵامدانەوەی ناوێت، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوا مرۆڤایەتی پێویستی بە هاتنی پێغەمبەران نەدەبوو! سەیریش ئەوەیە کە کوفرەکە بەناوی قورئانەوە دەکرێت!

---

(١) هو محمد بن علي الحاتمي الطائي ولد بمرسية سنة ٥٦٠ هـ و توفی بدمشق سنة ٦٣٨ هـ له مؤلفات كثيرة أسوائها فصوص الحكم قال فيه الذهبـي (السير ٢٣\٤٨ ـ ٤٩ ): (فإن كان لا كفر فيه فلا في الدنيا كفر) و نقل عن ابن دقيق العيد قولَ العز بن عبدالسلام في ابن عربي: (هو شيخُ سوءٍ مقبوحٌ كذاب) ينظر:

* ابن عربي عقيدته و موقف علماء المسلمين منه (١\٢٥٥ ـ ٢٥٧) تأليف: د. دغش بن شبيب العجمي ط. مكتبة أهل الأثر.

* جهود برهان الدين البقاعي في محاربة إلحاد الإتحادية و البدع العملية (١\٣٨١ ـ ٤٠٥ ط.الجامعة الإسلامية) تأليف: د. محمد مسلم إبراهيم.

* الزنادقة عقائدهم و فرقهم و موقف أئمة المسلمين منهم (١\٣٥٤ ـ ٣٥٨ ط.دار التوحيد للنشر) تأليف: د. سعد بن فلاح العريفي.

(٢) قسەکانی ابن عەرەبی بە مانا وەرگێڕاون، لە سەرچاوەکەیان بوەستە لە (الفتوحات المکیة \السفر الثاني\الجزء العاشر\ ص٢٠٠ ط. الهيئة المصرية العامة). بۆ بینینی زیاتریش لە کوفرستانیەکانی کە پینە ناکرێن بۆ کیتابی (ابن عربي عقيدته و موقف علماء المسلمين منه) بگەڕێوە.

مانای کوفرەکەش جیاوازی نەکردنە لە نێوان ئەوەی بە دەستێکی خوێناوییەوە قورئان دەسوتێنێت و ئەوەی بە چاوێکی فرمێسکاوییەوە قورئان دەخوێنێت!

بەڵام لێرەدا شیاوی باس تەنها ئاگادارکردنەوەی موسڵمانانە لە ڕاگەیاندنە لیبرالی و عیلمانیەکان کە فوو لە هەڵگرانی ئەم هزرە ئیلحادییە دەکەن و گەورەیان دەکەن و بە ناڕاستەوخۆ شەڕی ئیسلام و قورئانی پێدەکەن، واپیشاندەدەن کە ئەمانە قوتابخانەیەکی ڕەسەنی ئیسلامن کە گەیشتوونەتە پلەی (یەقین) [١]! لە زانستەکانی عیرفان و تەصەوف[٢]! ئەمە لە کاتێکدا کە ئیسلام بەهەموو قوتابخانەکانییەوە بە تەصەوف و سەلەفییەتەوە لەم هزرە بۆگەنە دوورە وەکو دووری نێوان کوفر و ئیمان.

---

(١) قال ابن كثير رحمه الله في تفسير ﴿وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ﴾ (الحجر: ٩٩) : ويستدل بها على تخطئة من ذهب من الملاحدة إلا أن المراد باليقين المعرفة فمتى وصل أحدهم إلى المعرفة سقط عنه التكليف عندهم وهذا كفر وضلال وجهل فإن الأنبياء (عليهم السلام) كانوا هم وأصحابهم أعلم الناس بالله وأعرفهم بحقوقه وصفاته وما يستحق من التعظيم وكانوا مع هذا أعبد وأكثر الناس عبادة ومواظبة على فعل الخيرات إلى حين الوفاة وإنما المراد باليقين ها هنا الموت كما قدمناه ولله الحمد..)

(٢) قال شيخ الإسلام ابن تيمية رحمه الله ـ مدافعاً عن التصوف و الصوفية ـ ما نصه (الرد على المنطقيين ص٥١٤ ـ ٥١٦):

(( ... **ولهذا كان الشيوخ العارفون المستقيمون من مشايخ التصوف وغيرهم يأمرون أهل القلوب أرباب الزهد والعبادة والمعرفة والمكاشفة بلزوم الكتاب والسنة** قال الجنيد بن محمد: علمنا هذا مقيد بالكتاب والسنة فمن لم يقرا القران ويكتب الحديث لا يصلح له أن يتكلم بعلمنا وقال الشيخ أبو سليمان الداراني: إنه لتمر بقلبي النكتة من نكت القوم فلا أقبلها إلا بشاهدين الكتاب والسنة وقال أيضا: ليس لمن ألهم شيئا من الخير أن يفعله حتى يسمع فيه بأثر وقال أبو عثمان النيسابوري: من أمر السنة على نفسه قولا وفعلا نطق بالحكمة ومن أمر الهوى على نفسه نطق بالبدعة فان الله يقول: ﴿وَإِنۡ تُطِيعُوهُ تَهۡتَدُوا﴾ وقال آخر: من لم يتهم خواطره في كل حال فلا تعده في ديوان الرجال. وقيل لأبي يزيد البسطامي: قد قدم شيخ من أصحابك فذهب ليزوره فرآه قد بصق في القبلة فقال: ارجعوا بنا هذا رجل لم يأتمنه الله على أدب من آداب الشريعة فكيف يأتمنه على سره وهذا الذي فعله أبو يزيد يستدل عليه بما في السنن سنن أبي داود وغيره أن رجلا كان إماما في مسجد من مساجد الأنصار فان كل قبيلة كان لها مسجد فجاء النبـي صلى الله عليه وسلم فرأى بصاقا في القبلة فقال من فعل هذا فذكرا الإمام

ئەم جۆرە لێکدانەوە نابەجێیانە لەناو شیعەگەریدا زۆرن[١] و لە لێکدانەوە و تەفسیری ئەهلی ئیسلام دوورن.

خودا بمان پارێزێت لە دژایەتی پیاوچاکان و پشتکردن لە پێشینان و شارەزامان بکات لە پەیامەکەی و بە ئاگامان بهێنێت لە غەفلەتبوون لە زیکرەکەی ... آمین .

حَرَسَ اللّٰهُ سَرَائِرَنَا عَنْ مَقْتِ الأَئِمَّةِ وَ عَدَاوَةِ الصَّالِحين و الإِعْتِرَاضِ عَلى السَّلَفِ الطَّيِّب

**البصائر و الذخائر** ( ١\٣١١ )

---

فنهاهم أن يصلوا خلفه فلما جاء ليؤمهم منعوه وقالوا أن رسول الله صلى الله عليه وسلم نهانا أن نصلي خلفك فجاء إليه فذكر ذلك له فقال: صدقوا إنك آذيت الله ورسوله. وقال غير واحد من الشيوخ والعلماء: لو رأيتم الرجل يطير في الهواء ويمشي على الماء فلا تغتروا به حتى تنظروا وقوفه عند الأمر والنهي ومثل هذا كثير في كلام المشائخ والعارفين وأئمة الهدى وأفضل أولياء الله عندهم أكملهم متابعة للأنبياء ولهذا كان الصديق أفضل الأولياء بعد النبيين فما طلعت شمس ولا غربت على أحد بعد النبيين والمرسلين أفضل من أبي بكر لكمال متابعته **وهم كلهم متفقون على أنه لا طريق للعباد إلى الله إلا باتباع الواسطة الذي بينهم وبين الله وهو الرسول. ولكن دخل في طريقهم أقوام ببدع وفسوق والحاد وهؤلاء مذمومون عند الله وعند رسوله وعند أوليا الله المتقين وهم صالحوا عباده مثل من يظن أن لبعض الأولياء طريقا إلى الله بدون اتباع الرسول أو يظن أن من الأولياء من يكون مثل النبي أو أفضل منه أو أنه يكون من هو خاتم الأولياء أفضل من السابقين الأولين أو اعلم بالله من خاتم الأنبياء وأمثال هذه المقالات التي تقولها من دخل فيهم من الملاحدة الضالين ومن هذا الوجه صار قوم متصوفون يتفلسفون**.) و ينظر: موقف ابن تيمية من الصوفية (١\٢٤٨ ـ ٢٥٢ ط.المنهاج) تأليف محمد عبد الرحمن العريفي.

(١) ينظر: الشيعة الإثنا عشرية و منهجهم في تفسير القرآن الكريم (ص٢٠٩ ـ ٢٧٣\ فصل في الفسير الباطني عند الشيعة و أثره في تلاعبهم بنصوص القرآن) تأليف: د.محمد العسال.

# چەند کورتەبابەتێك

## (١)

### لە نێوان سیاسەتی شەرعی و سیاسەتدا

لە بەرواری (١\٤\١٩٦٤) ڕۆژنامەی (نیورك هیرالد تریبیون)[(١)] هەواڵێك بڵاودەكاتەوە باس لە بڕیاری دوازدە لە گەورە زانایانی عەرەبستانی سعودیا دەكات بە ناشایستەیی مەلیك سعود بۆ بەڕێوەبردنی وڵات و دامەزراندنی مەلیك فەیصل لە جێگای ئەو وەكو مەلیكی عەرەبستان بڕیاریان داوە.

جێی شاهێد لەم هەواڵە بۆ بابەتەكەمان :

كاتێك گەورەزانایان سەركردەی شایستە هەڵدەبژێرن بۆ بەرژەوەندی وڵات ئەمە (سیاسەتی شەرعییە) پێچەوانەكەشی كاتێك سەركردە كەسێكی نەزان بە (زانا) هەڵدەبژێرێت بۆ بەرژەوەندی خۆی ئەمە (سیاسەتە)!

* * * * *

«كَمَا تَكُونُونَ يُوَلَى عَلَيْكُمْ»

---

(١) ڕۆژنامەیەكی ناوداری جیهانە، لە ساڵی ١٨٤١ز دامەزراوە، زمان حاڵی حیزبی كۆماری ئەمریكایە.

( ٢ )

## گەشبینی بە خودای پەروەردگار

بەرزترین پلەی ئیمان ناسینی خودای پەروەردگارە بە ناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی، ئەم ئیمانەش ڕێگای سەرکەوتنە بەسەر هەموو بێزارییەکی ژیان، کە زانای ناوداری عێراق (أبو الثناء شهاب الدين الآلوسي)[١] بە دوو بەیتە شیعر وەسفی دەکات ئەمە وەرگێڕاوەکەیانە:

| أنا مذنبٌ أنا مجرمٌ أنا خاطيء | تاوانکاری و هەڵەداری و ستەمکاری بۆ من سیفەتن |
|---|---|
| هو غافرٌ هو راحمٌ هو عافي | سیفاتی ئەو چاکەکاری و چارەکاری و ڕەحمەتن |
| قابَلْتُهُنَّ ثلاثةً بثلاثةٍ | لە تەك یەك دابنێ ئەم سیفەتانە: سێ بە سێ |
| وستغلبَنَّ أوصافُهُ أوصافي | سیفاتی ئەو بە سیفاتی من دەشێ |

****

**قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ:**

«يَقُولُ اللهُ: يَا ابْنَ آدَمَ، لَوْ عَمِلْتَ قِرَابَ الْأَرْضِ خَطَايَا وَلَمْ تُشْرِكْ بِي شَيْئًا، جَعَلْتُ لَكَ قُرَابَ الْأَرْضِ مَغْفِرَةً» رواه أحمد(٢٤٠\٣٥).

---

(١) ينظر ترجمته: دائرة المعارف للبستاني (١٠\٥٩٠ ـ ٥٩١ ط. دار المعرفة) و أعلام العراق لمحمد بهجت البيطار (ص٣٨ ـ ٦٤ ط. دار اللؤلوءة) و أفرد المحامي المؤرخ عباس العزاوي ـ رحمه الله ـ ترجمته بكتاب سماه: (ذكرى أبي الثناء الآلوسي ـ عصره و مجتمعه و حياته العلمية و الأدبية و التاريخية و السياسية و مؤلفاته ـ ) و ذكر في خاتمة كتابه مراجع تأريخ حياة الالوسي.

## ( ٣ )

## دیماهی خێر

{زانای فەرمودەناس (أبو زرعة) لە سەرەمەرگدا دەبێت یەکێك لە قوتابیانی تاوەکو تەلقینی مردووی بە بیری بێنێتەوە لە (محمد بن مسلم) دەپرسیٚ: چ سەنەدێکت لەبەرە سەبارەت بە تەلقینی مردوو بە(لا إله إلا الله)؟ ئەویش فەرموی لەم بارەیەوە لە (معاذ بن جبل) دەگێڕنەوە...قسەکەی تەواو نەکرد (أبو زرعە)ی فەرموودەناس ـ کە ئازاری جیابوونەوەی ڕوح و جەستەی دەچەشت ـ چاوەکانی کردەوە فەرمووی: **روى عبد الحميد ابن جعفر عن صالح بن أبي عريب عن كثير بن مرة عن معاذ عن النبـي (صلى الله عليه وسلم):** ((من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة))...}[(١)]

ئێمەش ژمارەی پێنجەمی گۆڤارەکەمان بەم سەرهاتەی(أبو زرعە)ی فەرموودەناس کۆتایی دێنین لە خودای پەروەردگار داواکارین کە ژیان و مردنمان لەسەر شەهادەی: (لا إله إلا الله محمدٌ رسول الله) بێت ... آمین.

بحمد الله تم

(١) تقدمة الجرح و التعديل لأبي حاتم (١\٣٤٥ ـ ٣٤٦ الطبعة الهندية).